# فەیلەسوفی مەسیحی و ژن

د. ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام

وەرگێڕانی:

سەرکەوت جەلیل

ژن لە فەلسەفەدا

٣



ژن له فه‌لسه‌فه‌دا (٣)

# فه‌یله‌سوفی مه‌سیحی و ژن

د. ئیمام عه‌بدولفه‌تاح ئیمام

وه‌رگێڕانی
سه‌رکه‌وت جه‌لیل





## خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- **فەیلەسوفی مەسیحی و ژن** (ژن لە فەلسەفەدا) (٣)
- **نووسینی:** د. ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام
- **وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:** سەرکەوت جەلیل
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** هۆگر سدیق
- **سەرپەرشتی پرۆژە:** هاوار نەسرەدین
- **نرخ:** ٢٥٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠١٣
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانەی** موکریانی (هەولێر)
- بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٩٥٠) ساڵی ٢٠١٣ی پێی دراوە.

**زنجیرەی کتێب ( ٧٥٦)**





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

((ئەگەر ژنتان بینی، وا نەزانن بوونەوەرێکی مرۆییتان بینیوە، تەنانەت بوونەرێکی کێویشتان نەبینیوە، بەڵکو ئەوەی دەیبینن خودی شەیتانە. ئەگەر هات و قسەشی کرد، ئەوەی گوێتان لێدەبێت فیشکەی مارە..!))

قەشە بۆناڤینتۆرا
(١٢٢١ ــ ١٢٧٣)

## پێڕست

# پێشەکی

ئەمەی بەردەستتان کتێبی سێیەمە لە زنجیرەی ((فەیلەسوف و ژن)) کە تا ئێستا دوو کتێبی لێ دەرچووە، باسی ژن لای بلیمەتەکانی فیکری یۆنانی: سوکرات[1] و ئەفلاتون و ئەرەستۆ دەکەن. لەم کتێبەشماندا باس لە پەیوەندیی نێوان فەیلەسوفی مەسیحی و ژن دەکەین. ئەگەر فەیلەسوفانی یۆنانی، بە شێوەی تیۆری، زمانحاڵی کەلەپووری باوی کۆمەڵگاکەی خۆیان بووبن، بەو شێوەیەی هیگڵ دەڵێت: ((فەلسەفە هەمان سەردەمەکەی خۆیەتی لە قاڵبی فیکردا)) ئەوا لەم کتێبەماندا نموونەیەکی زەقی زاڵبوونی داب و نەریت بە سەر فیکری دینیدا دەبینین!

سەرەڕای کۆی ئەو هەڵوێستە ئینسانی و نوێیانەی، کە حەزرەتی مەسیح لە بارەی ژنەوە هێناونی، لەوانەش بۆ نموونە: قەت بە شێوەیەك سەیری ژنی نەکردووە، کە ((جەستەیەك)) بێت و وێنەکەشی ((عەورەت)) بێت، هاوکات تێکەڵبوونی هەردوو رەگەزی رەتنەدەکردەوە و هاوشێوەی پیاوان چارەسەری نەخۆشییەکانی ژنانیشی کردووە. تا دەگاتە کۆ و کۆتایی ئەو هەڵوێستە جوانانەی تری، کە دواتر بە وردەکارییەوە باسیان دەکەین. کەچی هەموویان پێشێلکران و ونبوون و کەلەپووری (یەهودی ــ رۆمانی) جێی گرتەوە، کە لەو کاتەدا باوبووە و ئەو زەمینەیەشیان خۆشکردووە، کە دواتر مەسیحیەت تیایدا سەریهەڵداوە و گەشەی کردووە. ئاشکرایە کەلەپووری رۆمانی، لە رووی رق لێبوونەوە و بە کەم زانینی ژنەوە، درێژبوونەوەیەکی سروشتیی کەلەپووری یۆنانی بووە. هاوکات کەلەپووری یەهودی هەمان تێڕوانینی لە سەر ژن هەبووە و مۆرکێکی دینیشی پێبەخشیوە، لەو رێگەیەشەوە هەوڵیداوە بیکاتە پرسێکی ((خودایی)) یان ((پیرۆز))، تا لە کۆتاییدا ژنی یەهودی خۆی دا بە دەست ئەو جۆرە تێڕوانینەوە و بە بڕیاری خودای دەزانی، کە گەڕاندنەوەی بۆ نییە!

بەوەش بۆمان روون دەبێتەوە، کە ئەو پاشخانەی مەسیحیەت لە سەروەختی سەرهەڵدانییەوە کاری لە سەر کردووە، زۆر لە کەلەپووری رابردوو جیاواز نەبووە، کە دەربڕی بەرژەوەندییەکانی پیاو و سوودەکانی بوو، لە کۆمەڵگایەکی باوکسالاری ((نێرسالارانە))دا، کە مەبەستی دەستەمۆکردنی ژن و گۆشەگیرکردنی لە پلەیەکی نزمتردا بوو. ئەگەر ئەو ژنە هاوسەری کەسێکیش بووایە، پێویست بوو لە هەموو خۆڕازاندنەوە و وروژاندنێك دوور بکەوتایەتەوە، بۆ ئەوەی کوڕانێکی خاوەن پشتێکی پتەو و "پاك" بخاتەوە، کە هیچ خوێنێکی غەریبەی تێدا نەبێت و بتوانێت میراتیی خۆی ببات!

ئەگەر ئەو وتەیەی لویس هێنری مۆرگان، زانای ئەنسرۆپۆلۆژی ئەمەریکی (١٨١٨ ــ ١٨٨١) راست بێت، لەوەی پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان موڵکدارێتیی تایبەت و دۆخی ژن (بە تایبەتیش دۆخی هاوسەر ــ الزوجە)دا هەیە، ئەو کات لێکدانەوەیەکی زۆر روون دەبێت بۆ دووره پەرێزیی ژن و (هاوسەر یان ئەوەی دەشێت ببێتە هاوسەر) و ((خاوێنکردنەوە))ی و پێچانەوەی بە پۆشاکی ئەستور، بۆ ئەوەی هیچ بەشێکی جەستەی دەرنەکەوێت و نەبێتە هۆکارێك بۆ وروژاندن و هەڵەکردن و سەرنجڕاکێشانی پیاوان! چونکە ژن لێرەدا ((دەفری نەوەکان))ە، پێویستە لە هەموو خڵەتەیەك پاك بکرێتەوە، بۆیە دەبێت دوور لە چاوی ئەوانی تر بشاردرێتەوە تا بتوانرێت نەوەیەکی باش و پاك لە پشتی ئەو پیاوەی کە خاوەنی ئەو موڵکدارێتییەیە، مسۆگەربکرێت (جا موڵکدارێتیی مادی بێت، یان مەعنەوی وەك پلە یان پێگەی کۆمەڵایەتی، یان هەر ئیمتیازێکی تایبەتی، کە باوکان بیگوازنەوە بۆ کوڕەکانیان، بەو شێوەیەی لای یۆنانی و رۆمانییەکان هەبوو).

ئەوەش واتە، ئەو کۆت و بەندانەی کۆمەڵگای باوکسالاری لە پێناو بە میرات بردنی موڵکیدارێتیی تایبەتدا بە سەر ژندا سەپاندبووی، لەو کۆمەڵگایانەدا نەبوون، کە موڵکدارێتی تیایاندا هاوبەش (شیوع) بووە، چونکە لەوێدا هەموو شتێك لە نێوان تاکەکانی خێڵەکەدا هاوبەش بووە. هەروەها دەوترێت لەو کۆمەڵگایانەدا سێکسیش

هاوبەش بووە، بۆیە پێویستی بە داپۆشینی هەموو یان بەشێکی جەستە نەکردووە[٢]، دەکرێت مافی شەوی یەکەم (یان شەوی زاوایەتی) jus prime noct[٣] وەك بەڵگەیەکی تر باس بکەین.

مافی شەوی یەکەم، مافێکی دەستەبەرکراو بوو، پیاوی دەرەبەگ بە درێژایی سەردەمی دەرەبەگایەتی (تەنیا بۆ کەنیزەکەکان!) ئەو مافەی هەبووە، لە بەرامبەریشدا دەبوو واز لە کەنیزەکێکی بهێنێت، کە ئازاد بێت و هاوسەرگیری بکات!

هەروەها بەڵگەیەکی تریش دانی ژنە بە میوانەکان، کە زۆرێك لە گەلە سەرەتاییەکان، لەوانەش ئەسکیمۆ، پێڕەویان کردووە. لای عەرەبیش لە سەردەمی نەزانیندا نەریتێکی هاوشێوەی ئەوە هەبووە، کە ناویان نابوو (الاستبضاع): کاتێك پیاوێك ویستبێتی کوڕێکی جوامێر یان ئازای ببێت، ژنەکەی ناردووەتە لای پیاوێك، کە بەو سیفەتانە ناودار بووبێت (زرنگی، پیاوەتی و لەشجوانی و ...هتد) تا لەگەڵی بخەوێت، ئەگەر منداڵیشی ببوایە دەدرایە مێردەکەی. ئەو نەریتە لە ئیسپارتەش هەبووە، لێکۆرگۆسی گەورە یاسادانەریان گاڵتەی بە ئیرەیی و قۆرخکردنی ژنان لە لایەن مێردەکانیانەوە دەکرد، دەیوت: "بێماناترین شتێك ئەوەیە خەڵکی، بایەخ بە سەگ و ئەسپەکانیان دەدەن، هەوڵ و پارەیەکی زۆر بە فیڕۆ دەدەن تا بەچکەی باشیان لێ بە دەست بهێنن، پاشان دەبینین ژنەکانیان لە ماڵەوە بەند دەکەن تا بەتەنیا بۆ خۆیان بن"!

دەتوانین هەمات شت لە بارەی نەریتی ((المخادنة))ش بڵێین. (سترابۆ)ی زانای جوگرافیی بەناوبانگ پێی وایە، ئەو جۆرە هاوسەرگیرییە لە ناو عەرەبەکانی سەردەمی نەزانین و لە نێوان براکاندا ئەنجامدەدرا: "لە ماڵ و سامان و لە ژنەکەیشدا هاوبەش بوون، پێکەوە ژنێکیان هەبوو، ئەگەر یەکێکیان بیویستایە سێکسی لەگەڵ بکات، گۆچانەکەی لە بەردەم چادرەکەدا دادەنا، وەك نیشانەیەك بەوەی کەسێك لە ژوورەوەیە، بەڵام لە شەودا دەبوو لای برا گەورەکە بووایە"[٤].

بە کورتی، دەتوانین لەگەڵ سیمۆن دی بۆڤواردا بڵێین: "چەوساندنەوەی ژن دەگەڕێتەوە بۆ خواستی نەمرکردنی خێزان و هێشتنەوەی سیستەمی موڵکدارێتیی تایبەت. چەندە ژن لە کۆتی خێزان رزگاری بێت، هێندەش لە پاشکۆیەتی رزگاری دەبێت، ئەگەر کۆمەڵگایەك موڵکدارێتیی تایبەت قەدەغە و بنبڕ بکات، دۆخی ژنیش بە رێژەیەکی بەرچاو باشتر دەبێت"[٥].

ئەوەی بە ڕاستی سەیرە، ئەوەیە دینەکان ــ سەرەڕای لێبوردەیی و رێزگرتنیان لە ژن وەك مرۆڤێك ــ نەتوانن بە سەر دیاردەی ستەم و پاوانخوازیی پیاوان، بگرە موڵکدارێتیی پیاوان بە سەر ژنانەوە زاڵبن[٦]. بەو شێوەیەش چاکەی دینەکان لەگەڵ ژندا لە ناو شەپۆلی داب و نەریتدا ون دەبێت و لەگەڵێشیدا هەموو فیکرە ئینسانییە نوێیەکان دەشاردرێنەوە، تا جارێکی تر فیکرەکانی سەر بە کەلەپووری کۆن بێنەوە مەیدان.

لەم کتێبەدا نموونەیەکی باش بۆ ئەو قسەیە دەبینین: ئەو کەلەپوورە کۆنەی پێش سەرهەڵدانی مەسیحیەت باو بووە، کە لە لایەك کەلەپووری (یۆنانی ــ رۆمانی) و لە لایەکی تریشەوە کەلەپووری یەهودی بووە، هەموو فیکرە نوێیەکانی مەسیح لە بارەی ژنەوە هەڵدەلوشێت. تەنانەت پۆڵس، ئەو پەیامبەرە یەهودیەی لە ژینگەیەکی یۆنانی ــ رۆمانیدا ژیاوە، دێت و پشتیوانیی لە کەلەپوورە کۆنەکە دەکات و فیکرەکانی خۆی دەچەسپێنێت و بەردی بناغەی ئەو تیۆرە مەسیحییە لە سەر ژن دادەنێت، کە لە سەردەمی باوکانی فەیلەسوفدا باو بووە و فەیلەسوفانی سەدەکانی ناوەڕاستیش بەردەوام دەیانوتەوە!

بە درێژایی ئەم توێژینەوەیە تێبینی ئەوە دەکەین، تێڕوانینی لاهوتی و فەیلەسوفە مەسیحییەکان ــ وەك خوو و نەریتی هەمیشەیی پیاوانی ئایینی ــ لە سەر پرسی ((سێکس)) بیناکراوە و ژن تیایدا نە مرۆڤە، نە هاوڕێ و نە هاوپیشە و ...هتد، بەڵکو تەنیا، وەك قەشە ئۆگەستین دەڵێت، رۆڵی ((دەفری وەچەخستنەوە)) دەبینێت. ئۆگەستین خۆی لە گەنجیدا لەگەڵ زیاد لە سۆزانییەکدا رایبواردووە، تا لە کۆتاییدا

خۆی بۆ ((سۆزانییەك)) تەرخانکرد و کوڕێکی لێبوو، کە ناوینا ((کوڕی گوناهەکەم))! دواتر زۆرێك لەو ژیانەی جارانی پەشیمان بووەوە، بە جۆرێك خۆزگەی خواستووە کە ((خەسێنراو)) بووایە! دەڵێت: ((ئاخ! ئەگەر لەبەر خۆشەویستیی مەملەکەتی ئاسمان رازی بوومایە، کە خەسێنراو بم، ئێستا زۆر بەختەوەرتر دەبووم))!

بەڵام ئۆرجینی ئەسکەندەری (١٨٥ ــ ٢٥٤) بەکردەوە ئەو خۆزگەیەی ئۆگەستینی بەدیهێنا، کاتێك خۆی بۆ داوێنپاکیی هەمیشەیی نەزرکرد و چووکی خۆی بڕی و خۆی خەساند! چونکە وەك خۆی دەڵێت، کەسێکی سارد و سڕ و بێ هەست و سۆز نەبووە، کە بتوانێت خۆی لە بەردەم ورووژاندنەکانی جەستەدا رابگرێت...)[٧].

خوێنەر، بە درێژایی ئەم توێژینەوەیە تێبینیی دوو شت دەکات: رق بوونەوە لە جەستە، کە لای ئەفلاتون مۆرکێکی فەلسەفیی پێدراوە، لای فەیلەسوفە مەسیحییەکانیش بووە بە پرسێکی دینی. وەك ئەوەی بڵێیت جەستە شتێکی دابڕاو بێت لە مرۆڤ! بابەتی جەستەش فەلسەفەی بوونگەرایی هاوچەرخ وردەکاریی تێدا کردووە و توانیویەتی سەرنج بە لای بایەخی جەستەدا رابکێشێت. دووەمیش: رابردووی ((پیس))ی زۆرێك لە قەشەکان کە لە گەنجێتیدا پەتی ئارەزوویان شلکردووە، کەچی لە پیرێتیدا پەشیمان بوونەتەوە و بە دوای ((قۆچێکی قوربانی))دا گەڕاون تا لۆمەی بکەن و گوناهەکە بخەنە ئەستۆی، ئیتر ((ژن)) دەبێتە: ئەو شەیتانە جوانەی، کە بانگی کردم و منیش خۆم پێنەگیرا و بەدەمییەوە چووم!

قەشەی وا هەبووە بەرادەیەك لە سەرکێشییە سێکسییەکانی بەردەوام بووە، تا کەسوکاری کچەکە هاتوون و لە شیرینیی خەودا چووکیان بڕیوە! نموونەی ئەوەش وەك لەگەڵ ئەبیلارد (١٠٧٩ ــ ١١٤٢)، فەیلەسوفی لاهوتیی فەرەنسیدا روویدا، کە گەورەترین مامۆستای لاهوتی سەردەمەکەی خۆی و هاوکات گەورەترین پاڵەوانی خۆشەویستییش بوو! لە ساڵی ١١١٨دا کچە خوێندکارێکی هەرزەکاری خۆی بە ناوی هلویز خۆشویستووە، لەو کاتەشدا ئەبیلارد تەمەنی ٣٩ ساڵان و هلویزیش، کە برازای

فۆلبێرت ـــ ی کاهینی کلێسای نۆتەردام بووە، تەمەنی ١٧ ساڵان دەبێت. پەیوەندییەکەیان لە سەرەتادا نهێنی بووە، تا کاتێك کچەکە دووگیان کەوتووە و کوڕێکی بەناوی ئەسترۆلاب بووە. ئەو کات مامی کچەکە بڕیاریدا تۆڵە لە ئەبیلارد بکاتەوە و پیلانەکەشی لە کاتی خەودا جێبەجێکرد! دواتر ئەبیلارد بڕیاریدا لە کلێسای سانت دینیز لە دەوروبەری پاریس ببێتە راهیب و هلویزی خۆشەویستیشی چووە کلێسای ئەرجینتینیل.

خوێنەر دەتوانێت زیاد لە نموونەیەك بۆ ((رقی نائاسایی)) ئەو پیاوانە لە سێکس ببینێت، کە هۆکارەکەی نرکە وناڵەی دەروونی و کەسییە، کە رەنگە لێکدانەوەیان لای فرۆید (١٨٦٥ ـــ ١٩٣٩) و قوتابخانەکەی دەست بکەوێت!

منیش هیوادارم بەم زنجیرەیە بەگشتی و بەم کتێبەش بەتایبەتی، بەشدارییەکم لە ئازادکردنی ((رەگەزەکەی تر)) و زیندووکردنەوەی ((باڵە شکاوەکە))دا کردبێت، تا بەشکو وەك هەموو پیاوانی تر بکەوێتەوە کار (چونکە وەك وتوویانە مەل بە باڵێك نافڕێت و چەپڵەش بە دەستێك لێنادرێت ـــ وەرگێڕ).

**ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام**
**کوێت، حوزەیرانی ١٩٩٥**

# پاژی یەکەم

# پێش سەرهەڵدانی مەسیحییەت

((ژنان مافی بەڕێوەبردنی هیچ ئەرکێکیان نییە...بەڵکو دەبێت بخرێنە ژێر سەرپەرشتییەوە، هەر چەندە گەیشتبنە تەمەنی هەراشیش، چونکە ئەقڵێکی هەڵەشەیان هەیە..))
یاسای جۆستنیان

((کێ دەتوانێت ژنێکی چاکەکار بدۆزێتەوە؟ نرخی ژنێکی وەها لە نرخی زێڕ و یاقووت زیاترە...!))

سفری ئەمسال
ئیسحاحی ۳۱ ــ ۱۰

# سەرەتا

مەسیحییەت لە سەردەمێکدا لە فەلەستین سەریهەڵدا، کە دەسەڵاتی مەدەنی لای ڕۆمانییەکان و دەسەڵاتی دینیش لای یەهودییەکان بوو. بەو شێوەیەش ئایینە نوێیەکە کەوتە ململانێی دوو دەسەڵاتی سەربەخۆوە، کە لە زۆرێك لە شتەکاندا جیاواز بوون، بەڵام لە یەك شتدا هاوڕا بوون: ئەویش رقبوونەوە لە ژن، یان بڵێین: بە کەم سەیرکردنی ژنە[8].

یەکێك لە پارادۆکسە سەیرەکان ئەوەیە، سەرەڕای ئەو فیکرە نوێ و ئینسانییانەی مەسیحییەت لە بارەی ژنەوە هێناونی، کە دەتوانین بڵێین لە زۆربەیاندا مافی ژنی داوە، بەو شێوەیەی پاش کەمێك لە هەڵوێستی حەزرەتی مەسیح لە بارەی ژنانی سەردەمەکەیەوە دەیبینین، کەچی هەردوو دەسەڵاتی پێشوو ــ کە دیدێکی دوژمنکارانەیان بۆ ژن هەبوو ــ توانییان بە سەر ئەو هەڵوێستە نوێیانەی مەسیحییەتدا زاڵبن و بگرە بە تەواوی کپیان بکەنەوە، تا جارێکی تر بە کەم سەیرکردن و دوژمنایەتیی کۆن گەڕایەوە و لە سەر دەستی قەشە فەیلەسوفەکان، بەرگێکی مەسیحیی بە بەردا کرا: جا لە سەردەمی باوکاندا بێت، کە سەرەتای فەلسەفەی مەسیحی پێك دەهێنن، یان لە سەرەتای فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاستدا بێت، کە بە قەشە ئۆگەستین (٣٥٤ ــ ٤٣٠) دەست پێدەکات، یان لە کۆتایی ئەو سەردەمەدا بێت لە سەر دەستی قەشە تۆمای ئەکوینی (١٢٢٥ ــ ١٢٧٤).

مەسیحیەت تێڕوانینی یەهودیی بۆ ژن، بە هەموو ڕەگەزەکانییەوە لە گاڵتەکردن بە ئەقڵی و بوغزاندنی سۆز و هەڵچوونەکانی و بە سووك سەیرکردنی جەستەی، بە میراتی وەرگرت، کە جەستەی ژن لەو دینەدا وەك سەرچاوەی دەرد و نەخۆشی و خراپەکارییەکانی ناو کۆمەڵگا و وەك بنەڕەتی خراپە (الشر) لە گەردوون و سەرەتای لادانی هەڵسوکەوتی مرۆیی لە سەرەتای دروست بوونەوە، تەماشا دەکرا.

پاشان، بە مەبەستی پشتیوانی کردن و بەهێزکردنی ئەو جۆرە تێڕوانینە، لە هەردوو فیکری یۆنانی و ڕۆمانییەوە چەند ڕەگەزێکی تریان سەربارکرد، بە تایبەتی پاش ئەوەی باوکانی کلێسا تیۆری ئەرەستۆیان لە بارەی ژنەوە وەرگرت[9].

(له ژمارەی پێشووی ئەم زنجیرەیەدا بە وردەکارییەوە باسی ئەرەستۆمان کردووە) و فەیلەسوفە مەسیحییەکانیش هەوڵیاندا لە ڕێگەی ئەرەستۆوە، پەیوەندیی نێوان نێر و مێ بە شێوەیەکی هیرارکییانەی سەر بەرەو ژوور ڕێك بخەن، بە جۆرێك، کە نێرینە بکەوێتە سەرەوە، چونکە ئەو فۆرم، ماهیەت، فیکر و ئەقڵە. لە کاتێکدا مێینە: مادە، جەستە، هەڵچوون و هەست و سۆزە.

پێشتر باسمان کرد، کە چۆن لای ئەرەستۆ، کۆرپەلە تەنیا لە گیانلەبەری مەنەوی (سپێرم)ی پیاو خەلق دەبێت، چونکە تەنیا ئەو فاکتەری کارا و کاریگەرە لە پیتاندندا، ڕۆڵی ژنیش تەنیا ئەوەیە مادە، کە خۆی لە خوێنی مانگانەدا دەبینێتەوە پێشکەش بکات و کۆرپەلە لە منداڵدانی خۆیدا جێبکاتەوە و خواردنی پێویستی وەك خوێن و هەموو ڕەگەزە بە سوودەکانی تری پێ ببەخشێت. لەبەر ئەوەشی نێرینە لە پرۆسەی دروست بووندا ڕۆڵی سەرەکی هەیە، کەواتە ئەسڵ وایە کۆرپەلە نێرینە بێت ــ بەڵام دەبێتە مێینە، ئەگەر مادە نزمەکانی مێینە بە سەر ئەو مادە بالآیانەدا زاڵبن، کە پیاو دەریاندەدات ــ بەو شێوەیەش مێینە، نێرینەیەکی نوقسان دەبێت. قەشە تۆمای ئەکوینی، بەو شێوەیەی لەم کتێبەدا بەرچاومان دەکەوێت، بە تێر و تەسەلی ڕاڤەی ئەم بیرۆکە ئەرەستۆییەی کردووە.

دیارترین سەربارکردنەکانی مەسیحییەت (بە تایبەتیش مەسیحییەتی پۆڵس) بۆ بەرزکردنەوەی بەهای نێرینە بە سەر پێگەی مێینەدا، بریتییە لە حەقیقەتی سێ ڕەنگی و ڕزگاربوون: ڕزگارکەری مرۆڤایەتی کوڕی خودایە، کە خۆی بە لە خاچداندا تا جیهان لەو گوناهانە پاك بکاتەوە، کە بە هۆی هەڵەی ئەزەلیی مرۆڤەوە تێیکەوتووە، ئەوەش پاش ئەوە هات، کە ژن (حەوا) فەرمانی خودای شکاند و بە هاندانی شەیتان (مار)، پیاو (ئادەم)ی هەڵخەڵەتاند و فێری یاخیبوونی کرد.

ئاساییە ئەگەر ئەنجامی ڕاستەوخۆی ئەو عەقیدەیە: بەرزکردنەوەی پێگەی پیاوی داماو بێت، کە گوایە مێینە هەڵیخەڵەتاند و گومڕای کرد! بەڵام پێگەی ژن لەوەی جارانی خراپتر بێت!

# بەشی یەکەم
# پاشخانی مەدەنیی رۆمانی

بارودۆخی رۆمای جاران، زۆر لە ئەسینا بە تایبەتی و لە کولتووری یۆنانی بە گشتی جیاواز نەبوو، لەوێش شار یەکەی سیاسی بوو. دەوڵەتە شاریش لە هاوولاتییانی ئازادی رۆمانی، کە لە ماف و ئیمتیازەکاندا یەکسان بوون، پێکهاتبوو. پاشماوەی تری خەڵکی, یان بیانی، یان کۆیلە بوون. بیانییەکان هیچ ماف و ئیمتیازێکیان نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێت، کە هاوولاتییانی رۆمانی خۆبەخشانە پێیان دەدان. هاو کات، هاوشێوەی هەموو شارەکانی تری ئەو سەردەمە، ژمارەیەکی زۆر کۆیلە بە ژن و بە پیاوەوە هەبوون، کە زۆرێکیان لە رێگەی بە بەدیل گرتنەوە بووبوونە کۆیلە[١٠].

بەوەش دەتوانین بڵێین، دانیشتوان لە سێ گروپ یان چین پێکهاتبوون:

**یەکەم:** هاوولاتیانی ئازادی رۆمانی، کە خاوەنی هەموو ماف و ئیمتیازێکن.

**دووەم:** بیانییەکان، کە ئەمانە ماف و ئیمتیازیان نییە.

**سێیەم:** کۆیلەکان، کە وەك موڵکێکی تایبەتی ئاغاکانیان تەماشا دەکرێن.

ئەوەش هەمان پێڕەوی شارە یۆنانییەکان بوو لە پۆلێنکردنی دانیشتواندا. بەڵام بەرەوپێشچوونی شاری رۆمانی ئاڕاستەیەکی جیاوازتری لە شاری یۆنانی گرتبوو، رۆمانییەکان وردە وردە سنوری ئیمتیازەکانی خۆیانیان فراوانکرد، تا گەلی شار گۆڕا بە نەتەوەیەك و لە دواییشدا بوو بە دنیای شارستانی.

بیانییەکان لە رۆمادا کەسێتییەکی جیاکراوەیان نەبوو ــ بەو شێوەیەی لە ئەسینا هەبوو ــ تەنیا مەگەر بە چاوی بیانی سەیری خەڵکە عەوامەکە بکەین، بەڵام بە تێپەڕینی کات زۆرێك لەو عەوام و رەعیەتانە گۆڕان بە هاوولاتی و هیچ

نیشانەیەکیان نەما، کە لە هاوولاتییە بنەڕەتییەکانیان جیابکاتەوە، هاوکات چاودێر Censor[11] دەسەلاتی ئەوەی هەبوو ناوی بیانییان بخاتە لیستی هاوولاتییانەوە، بێگومان زۆرێك لە بیانییەکانیش لەو ڕێگەیەوە بوون بە هاوولاتی.

## یەکەم: ژن لە ڕۆمای کۆندا

بە پێی ئەو دابەشکردنە سێ لایەنییەی دانیشتوانی ڕۆمای کۆن، کۆمەڵگای ڕۆمانی سێ چین ژنی لە خۆ دەگرت، بەم شێوەیە:

أ ــ ژنی ئازادی ڕۆمانی: ئەویش یەکێك لەمانە بوو: هاوسەر، دایك، کابان یان خاتوون Domina.

ب ــ ژنی بیانی: ئەمیش وەکو پیاوی بیانی هیچ ماف و ئیمتیازێکی نەبوو[12].

ج ــ کەنیزەکەکان: ئەمانیش موڵکی تایبەتیی ئاغاکانیان بوون[13].

ئێستاش باسێك لە بارەی هەر یەکێك لەو چینانە دەنووسین:

### أ ـ ژنی ئازادی ڕۆمانی:

ڕەنگە لە بەشێکی یاسای جۆستنیاندا، بە ناونیشانی چەند بڕیارێکی تایبەت بە ژن و هاوسەرگیری[14] بیرۆکەیەکی ڕوونمان لە سەر دۆخی ژن لە کۆمەڵگای ڕۆمانیدا دەست بکەوێت، هەڵبەتە مەبەستیش لە ژن لێرەدا، هاوولاتیی ئازادی ڕۆمانییە، نەك ژنی بیانی یان کەنیزەکەکان. لەو یاسادا هاتووە[15]:

١ ــ ژنان مافی بەڕێوەبردنی کاروبارە گشتییەکانیان نییە.

٢ ــ پێویستە ژنان لە ژێر سەرپەرشتی(الوصایە)دا بمێننەوە، با گەیشتبنە تەمەنی هەراشیش، چونکە ئەقڵێکی هەڵەشەیان هەیە.

٣ ــ پێویستە ژنان ملکەچی مێردەکانیان بن.

٤ ــ پێویستە ژن شوێنی مێردەکەی بکەوێت.

٥ ــ پیاوان پلەیەك بە سەر ژنانەوەن.

٦ ــ لە زۆرێك لە حوكمەكانی یاسادا، ژنان لە خوار پیاوانەوەن.

٧ ــ دەشێت گۆڕینەوە لەگەڵ مارەیی ژندا بكرێت، تەنانەت لە سەروەختی ژن و مێردایەتیشدا، بەو مەرجەی لە بەرژەوەندیی ژنەكە بێت.

٨ ــ لە بەرژەوەندیی كۆمارە، كە ژنان مارەییەكەیان بۆ خۆیان بێت، تا وەك یارمەتییەك بۆ دووبارە شووكردنەوە بەكاریبهێنن.

بەو شێوەیە ــ پاش خوێندنەوەی هەندێك لە مادەكانی یاسای جۆستنیان ــ بۆمان دەردەكەوێت، كە لە رووی یاساییەوە تەنیا پیاو بوونی هەیە و دانپیانراوە[١٦]. بەڵام ژن، تا كۆتایی تەمەنی هەر لە ژێر سەرپەرشتیدا دەبێت. هاوكات هەر پیاویش ژیانی دینیی بە دەستەوە دەبێت، باوك، سەرۆك خێزان و هاوكات كاهینی گەورەشە، هەر خۆیشی بە تەنیا رێگە پێدراوە بەوەی، كە درێژە بە پەرستنی باووباپیرانی بدات.

لە مادەی یەكەمی ئەو یاسایەی جۆستنیانەوە تێبینیی ئەوە دەكەین، كە ژنان مافی بەڕێوەبردنی ئەرك, یان كاروبارە گشتییەكانیان نییە، ژن لە ژیانی گشتیدا بۆ نموونە، لە هەموو وەزیفە گشتییەكان دوورخراوەتەوە، كە هەر بەو هۆیەشەوە بەو وەزیفانە دەوترێت (وەزیفە نێرینەییەكان) یان (وەزیفەی پیاوان Officia Virilia). هەرگیز كۆمەڵگای رۆمانی هانی ژنانی نەداوە تا بەو چالاكییانە هەستن، كە پیاوان پێیان هەڵدەستن[١٧].

هەرچی ئەو قسەیەشە، كە دەڵێت، پێویستە ژنان بەردەوام لە ژێر سەرپەرشتیدا بن، چونكە ئەقڵێكی هەڵەشەیان هەیە، راستییەكەی، ئەو قسەیە لە ئەنجامی نەریتی خودی رۆمانییەكانەوە هاتووە لە مەسەلەی هاوسەرگیریدا، چونكە زۆرجار كچی منداڵیان مارەكردووە، تەنانەت هەندێ جار نەدەگەیشتنە تەمەنی باڵغبوونیش، چونكە تەمەنی یاسایی بۆ هاوسەرگیری دوانزە ساڵان بوو. بەسەرهاتێكی ناودار هەیە، كە (بلوتارك) لە بارەی كۆرنیلیا دایكی برایانی گراكۆس دەیگێڕێتەوە. دەتوانین لە رێگەیەوە لە مەرگەساتی مارەكردنی كچی منداڵ لە كۆمەڵگای رۆمانیدا

ئاگاداربین. تیبیریۆسی مێردی دوو ماری لە سەر جێی خەوەکەی گرت، رۆیشتە لای فاڵگرەوەکان تا رووداوەکەی بۆ لێکبدەنەوە، پێیانوت نەیانکوژێت و بەرەڵڵایان بکات، چونکە ئەگەر بێت و مارە (نێرینەکە) بکوژێت، ئەوا خۆی دەمرێت، ئەگەر مارە (مێینەکە)ش بکوژێت، ئەوا کۆرنیلیای هاوسەری دەمرێت. کابراش لە ترسی هاوسەرەکەی، کە ساڵانێکی زۆر لە خۆی منداڵتربوو، مارە نێرینەکەی کوشت. دوای ماوەیەکی کەمیش لەو رووداوە و بەهۆی راست وەرگەڕانی پێشگۆییەکەوە کابرا مرد، کۆرنیلیای ژنیشی لە تەمەنی بیست و پێنجساڵی و لە کاتێکدا، کە دایکی دوانزە منداڵ بوو، بێوەژن کەوت[18].

لەو بەسەرهاتەوە دەگەینە ئەوەی کۆرنیلیا، لە کاتی هاوسەرگیریدا تەمەنی دوانزە یان سیانزە ساڵان بووە، واتە منداڵێك بووە و هیچی نەزانیوە، ئیتر ئاساییە ئەگەر یاسادانەر پێی وابێت ژن ئەقڵێکی هەڵەشە یان سوکی هەیە! بگرە هەندێ جار هەر لە کاتی ناو بێشکەوە چارەنووسی کچەکە دیاریدەکرا، ئەوەش کاتێك باوکان بە تەماحی فراوانکردنی سنوری هاوپەیمانێتییەکانیان، یان بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانیی زیاتر بۆ کار یان وەزیفەکانیان، منداڵەکانیان لە یەکتری مارە دەکرد.

رەنگە سیستەمی سەرپەرشتیاریش برێك دۆخی ژنمان بۆ روون بکاتەوە، کە تا لە ماڵی باوکدا بوو کۆیلە و ملکەچی پیاو بوو، کە دەچووە ماڵی مێردیش هەر کۆیلەی پیاو بوو: ژن لێرەدا دەبووە کچێك وەك کچەکانی تری مێردەکەی، بە تەواوی پەیوەندیی لەگەڵ خێزانەکەیدا دەپچڕاند و مێردەکەشی جێگەی باوکی دەگرتەوە.

بەڵام پێویستە ئاماژە بەوە بدەین، کە ژن لە کۆمەڵگای رۆمانیدا بە شێوەیەکی رەها لە رەگەزی بەرامبەر جیانەدەکرایەوە، وەك ئەوەی لە سەردەمی کلاسیکیی[19] کۆمەڵگای یۆنانیدا هەبوو، هەر چەندە لە خێزانی رۆمانیشدا (حەریم) هەر هەبوو، بەڵکو کچ لەگەڵ براکانیدا بەخێودەکرا، هاوشێوەی براکانی دەیخوێند، هەروەها قوتابخانە رۆمانییەکانیش تێکەڵ بوون، ژن ــ کابانی ماڵ ــ لەگەڵ مێردەکەیدا نانی دەخوارد، دایکیش رۆڵێکی پەروەردەیی گرنگی لەگەڵ منداڵەکانیدا دەگێڕا، وەك

نموونەیەکیش دەشێت ئاماژە بە کۆرنیلیای دایکی برایانی گراکۆس بدەین، کە پێش کەمێك باسمانکرد، ئەو بوو پاش مردنی مێردەکەی حەماسی منداڵەکانی بەرزکردەوە و هانی دەدان، تا رووبەڕووی ئەو مەترسییانە بوەستنەوە، کە هەڕەشەیان لە دەوڵەتەکەیان دەکرد، تەنانەت کاتێکیش زانی، کە کوڕەکانی لە سەر کێشەی وڵاتەکەیان ئەگەری مردنیان هەیە، حەماسەتی دانەبەزی[٢٠].

سەرەڕای داننانمان بەو خاڵانەدا، بەڵام ژن (الزوجه)ی رۆمانی بە تەواوی لە ژێر کۆنترۆڵی مێردەکەیدا بوو، هەر چەندە ئەو کۆنترۆڵ و دەسەڵاتە وردە وردە و بە کاریگەریی کۆمەڵێك فاکتەری زۆر و جیاواز، کە پاش کەمێکی تر باسی هەندێکیان دەکەین، کەمیکرد. فیکری رۆمانی باوکی کردووە بە ستەمکارێك، کە دەسەڵاتی ژیان و مەرگی بە سەر منداڵەکانیدا هەیە، ئەوانیش بە بێ رەزامەندیی ئەو ناتوانن هیچ هەنگاوێك بنێن. حاڵی منداڵە کوڕەکانیش، تەنانەت دوای ئەوەشی، کە دەگەیشتنە تەمەنی هەراشی، بە هەمان شێوە بوو. ژن لە رۆمای کۆندا ــ بە شێوەیەکی گشتی ــ منداڵێك بوو، کە بە درێژایی ژیانی پێویستی بە رێنوێنی و چاودێری و پاراستن هەبوو و مەحاڵ بوو بتوانێت لە دەسەڵاتی پیاوی ستەمکار رزگاری بێت.

کچی رۆمانی، ئەگەر بیویستایە شوو بکات، پێویستی دەکرد لە نێوان دوو جۆر هاوسەرگیریدا یەکێکیان هەڵبژێرێت: یان هاوسەرگیری بە شێوەی دەستبەسەرداگرتن Cum Manu: ئەمەیان واتە بووك و هەرچی هەیە بخرێتە ژێر دەسەڵاتی مێردەکەی یان باوکی، لەم حاڵەتەشدا باوك خۆی کچەکەی رادەستی زاواکەی دەکرد یان دەیخستە ژێر دەسەڵاتییەوە. جۆری دووەمیش بریتیی بوو لە: هاوسەرگیری بە بێ رادەستکردن Sin Manu، لەمەیاندا کچەکە و هەرچییەکی هەیبوو لە ژێر دەسەڵاتی باوکیدا دەمانەوە. جۆرێکی سێیەمیش هەبوو پێی دەوترا شێوازی کونفەریاشو Confarretion ــ واتە خواردنی کێك پێکەوە ــ ئەم جۆرەیان پێویستی بە ئاهەنگێکی دینیی تایبەت لە بەردەم پەرستگای خواوەند جوپیتێر و ئامادەبوونی

کاهینی مەزن و دە شایەتحالْ بوو، ئەم جۆرەیان لە نێوان ئەشراف و خانەدانەکاندا ئەنجامدەدرا.

ڕێورەسمی هاوسەرگیریی زۆر جار بەوە دەستیپێدەکرد، کە کچەکە، کاتێك کوڕەکە داوای هاوسەرگیریی لێدەکرد، وازی لە بەشداریکردن لە سروتە دینییەکانی خێزانەکەی خۆی دەهێنا، دەستبەجێ وازی لەو سروتانەی خێزانەکەی دەهێنا و لە ڕێوڕەسمی خێزانی مێردەکەیدا بەشداریی دەکرد. ئاهەنگی هاوسەرگیریش لە ماڵدا دەکرا، باوکی کچەکە قوربانییەکی پێشکەشی باووباپیرانی دەکرد، دواتر لە کۆتایی ئاهەنگەکەدا رادەستکردنی کچەکەی بەو کوڕەی داوای کردووە رادەگەیاند، پاشان کوڕەکە کچەکەی (بە داپۆشراوی) بەرەو ماڵی خۆی دەبرد و ئەوانەشی مەشخەڵیان هەڵدەگرت لە دوایانەوە ڕێیان دەکرد و بە ئاوازی شمشاڵەوە سرودەکانی هاوسەرگیرییان دەوتەوە، کاتێك دەگەیشتنە بەردەرکی ماڵ، ژنەکە وا خۆی دەردەخست، کە نایەوێت بڕواتە ژوورەوە، بۆیە زاوا لێی دەهاتە پێشەوە و دەیپرسی: تۆ کێی؟ ژنەکەش وەك دەربڕینی وەفا و پێوە پەیوەستبوونی بە دەستەواژەیەکی سادە وەڵامی دەدایەوە: لەو جێیەی تۆ گایۆس بیت، منیش گایا دەبم Ubi Tu Gaius, Ego Gaia واتە: لەو جێیەی تۆ خان دەبیت، منیش خانم دەبم. ئینجا زاوا دەهاتە پێشەوە، هەڵیدەگرت و دەیبردە ژوورەوە، چونکە نەدەبوو پێی بەر دەرکەی ماڵەکە بکەوتایە، کلیلەکانی پێشکەش دەکرد و هەردووکیان ملیان دەخستە ژێر یەك رمەوە (وەك ئاماژەیەك بۆ پەیوەندییەکەیان) و لە کۆتاییشدا: بووك لە نوێژکردن بۆ خواوەندی خێزانە نوێیەکەی، کە هاتووەتە ناویانەوە بەشداریی دەکرد و بەوەش، چوونە ناو ئایینی مێردەکەی و وازهێنانی تەواوەتی لە خێزانە کۆنەکەی رادەگەیاند[٢١].

زۆر جار کچان پێیان خۆش بوو بە شێوەی دەستبەسەرداگرتن شوو بکەن، کە تیایدا لە ژێر دەسەڵاتی باوکەوە دەهاتنە ژێر دەستی مێردەکەیانەوە. لەم حاڵەتەشدا ژنەکە هەمان پێگەی کچی مێردەکەی دەبوو، واتە: ملکەچی مێردەکەی دەبوو و لە ژێر دەسەڵات و رەحمەتی ئەویشدا دەمایەوە.

لە ماڵی هاوسەرێتیشدا پێویستە ژنەکە بە ئەرکی بەڕێوەبردنی ماڵ و سەرپەرشتی کردنی کۆیلەکان و چارەسەرکردنیان لە کاتی نەخۆشی و هەروەها بە کاری رستن و چنین و دوورینەوە و...هتد هەستێت. هاوکات پێویستە لە هەڵسوکەوتیدا زۆر وریا و بە ئاگا بێت، چونکە بچووکترین کاری خراپ رەنگە سزاکەی مەرگ بێت، کەچی پیاو دەتوانێت هەرچی دڵی بیەوێت بیکات، لەم بارەیەشەوە کاتۆی گەورە دەڵێت[٢٢]:

((ئەگەر ژنەکەت بینی خەریکی زینا بوو، ئەوا یاسا رێگەی پێداویت بە بێ دادگایی بیکوژیت، بەڵام ئەگەر ئەو بە رێکەوت تۆی لە وەها حاڵەتێکدا گرت، بۆی نییە تەنانەت خۆیشی تورە بکات، چونکە یاسا رێگەی ئەوەی پێنەداوە...))[٢٣]. هەروەها لە یاسای رۆمانیدا ژن بۆی نەبوو شەراب بخواتەوە، ئەگەر بهاتبا و ژن سەرکێشیی ئەنجامدانی ئەو تاوانەی بکردایە، توندترین سزا دەدرا، چونکە بە خواردنەوەی شەراب، مادەیەکی نهێنیی دەکردە جەستەیەوە، کە نەدەکرا ئەنجامەکانی بزانرێت، بۆیە ماف بەو پیاوەی ژنەکەی بە خواردنەوەوە دەگرت درابوو، کە تا مردن لێی بدات. مێژوونوسانیش زۆر رووداو دەگێڕنەوە، کە دۆخی نالەباری ژنی رۆمانی ــ لای کەم لە سەردەمە بەراییەکاندا ــ دەخەنەڕوو، جارێك پیاوێك ژنەکەی لە ماڵ وەدەردەنێت، چونکە لە شەقامدا بەبێ رووبەند رێی کردووە، یەکێکی تر ژنەکەی دەردەکات، چونکە لەگەڵ ژنێکدا قسەی کردووە، کە کاتی خۆی کەنیزەك بووە و زۆر نییە ئازاد کراوە، ژنەکەش لە سەر شەقامی گشتی قسەی لەگەڵ کردووە، بەوەش تاوانێکی ئەنجامداوە، کە مایەی لێخۆشبوون نییە. سێیەمیش ژنەکەی دەرکردووە، چونکە وێراویەتی بە بێ ئیزنی ئەو بڕواتە سەیری یارییە گشتییەکان[٢٤].

ناتوانین بە دوای بەرەوپێشچوونی ژنی رۆمانی و شێوازی ئازادبوونیدا بچین، بەڵام دەتوانین چەند ئاماژەیەکی کۆمەڵایەتی بەو ئاراستەیەدا باس بکەین:

**یەکەم:** بە پێی تۆمارە رۆمانییەکان دەردەکەوێت، کە هەڵە بوو ئەگەر پیاوان گاڵتەیان بە هەستی ژنە رۆمانییەکان بکردایە، چونکە سەلماندویانە خاوەنی

کەسایەتییەکی ئەوتۆن، کە هاوشێوەی پیاو توانای بڕیاردان و جێبەجێکردنی بڕیارەکانیشیان هەیە، دەشتوانن هەنگاوی گرنگ و بوێرانە، بێ گوێدانە ئەنجامەکانی بگرنەبەر، ئەوەش وەك هەوڵێك بۆ سەلماندنی ئەوەی، کە ئەگەر بە شێوەی جوان و وتەی شیاو مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت، ئەو کات باشترین هاوسەرێك دەبن.

بەڵام ئەگەر پیاوان دەسەڵاتی تەقلیدییانەی خۆیان بەکاربهێنن و زۆر گەمژانە هەوڵی کۆنترۆڵکردنی تەواوەتیی ژنان بدەن، دەشێت ئەوانیش بەرگریی بکەن و بە ئازایەتی و هەڵوێست نواندنەوە تەحەدای پیاوان بکەن، رەنگە ئەم بەسەرهاتەی ئێستا دەیگێڕینەوە، باشترین وەڵامێك بێت بۆ ئەو کەسانەی دەپرسن: بۆچی نەمانبیستووە ژنان وەڵامدانەوەیان هەبێت؟ بۆچی ملکەچانە و ترسنۆکانە خۆیان بەدەستەوە داوە و چاوەڕێ بوون تا ئەوکاتەی پیاوانێك هاتن و داوای ئازادییان بۆ کردن؟ ئەی بۆچی هاوشێوەی شۆڕشی کۆیلەکان، شۆڕشی ژنانیشمان لە رۆمادا نەبینی؟ بۆچی ژنان هەوڵی بەرگری کردن لە کەرامەت و مافەکانی خۆیان نادەن؟ مێژووی رۆمانی وەڵامی ئەم پرسیارانە دەداتەوە، کاتێك تیشك دەخاتە سەر ئەم لایەنەی کەسایەتیی ژنان و بۆمان روون دەکاتەوە، کە زۆر جار هانایان بۆ تۆڵەسەندنەوەی توندوتیژ بردووە، بە رادەیەك بۆڕی پیاوانی لە دەسەڵات و ستەمکاری و لووتبەرزییان داوەتەوە. فەرموون ئەم بەسەرهاتە بخوێننەوە[٢٥]:

ساڵی ٣٣١ پ.ز نەخۆشییەکی سەیر لە رۆما بڵاوبووەوە، کە پێشتر هیچی لە بارە نەبیسترابوو، کۆمەڵێکی زۆری هاووڵاتیانی کوشت ــ کە ژمارەیەکی زۆری خانەدان و ئەشرافەکانی تێدا بوو ــ نیشانەکانی نەخۆشییەکە لای هەموو نەخۆشەکان وەك یەك بوو، ئەنجامەکەشی هەمان ئەنجام بوو: مردن و پاشان تیاچوونی هەمووان! نا روونی دەوری ئەو کێشەیەی تەنیبوو، کە بوو بە وێردی سەر زمانی هەموو رۆما و تا ماوەیەکی زۆریش وەك نهێنییەك، کە کەس هیچی لە بارەوە نەدەزانی، مایەوە. تا بەیانییەکیان ژنە خزمەتکارێك چووە کن پۆلیسی رۆمانی و پێی وتن، کە ئەو دەتوانێت سەرچاوەی ئەو نەخۆشییە سەیرەیان پێ بڵێت، چونکە هۆکارەکانی دەزانی،

بەڵام هیچ نالێت تا کاتێك لایەنە بەرپرسەکان نەپیارێزن و گەرەنتیی ئەوەی پێ نەدەن، کە بە هۆی درکاندنی نهێنییەکەوە، تووشی هیچ ئازار و ئەشکەنجە و لێدانێك نابێتەوە. کاتێك بابەتەکە گەیەنرایە کونسوڵ و راوێژکاری ئەنجومەنی پیران، ئەنجومەن بڕیاری پاراستنی ژنەکەی دەرکرد، ئینجا خزمەتکارەکە هۆکاری ئەو نەخۆشییەی رۆمای تەنیبوو، درکاند، ئەویش: ژنەکان بەهۆی یاخیبوونیان دژی مێردەکانیان، شەرابیان لەگەڵ جۆرێك لە ژەهردا تێکەڵکردووە، هەر ئەوەشە، واتە ژەهراویبوونە، هۆکاری ئەو رێژە زۆرەی مردن. خزمەتکارەکە هەندێك لە بەرپرسانی لەگەڵ خۆیدا برد، بە دزییەوە رۆیشتن و ژنێکیان بینی، کە خەریکی پرۆسەی تێکەڵکردنی شەرابەکە بوو بە ژەهرەکە. ئەو لیژنەیەش توانی بیست ژن ئاشکرا بکات کە سەرقاڵی ئامادەکردنی ئەو تێکەڵە سەیرە بوون. ئەوەشی خۆشە ژنەکان، پاش ئاشکرابوونیان، لە ناو خۆیاندا تاوتوێی دۆخەکەیان کرد و بە بوێری و خۆڕاگرییەوە بڕیاری نۆشینی بڕێکی زۆریان لەو ژەهرە دا، کە دەستبەجێ کوشتنی! دواتریش ئەنجومەنی پیران لە دانیشتنێکدا بۆ تاوتوێکردنی ئەو بابەتە لە ئاستێکی فراواندا کۆبووەوە، لە ئەنجامیشدا دەرکەوت زیاتر لە ١٧٠ ژن تێوەگلاون!

ئەوەی سەیرە پیاوان، ئەو رووداوەیان وەك جۆرێك لە شێتی و گەمژەیی ژنانە لێکدایەوە، هەر چەندە دڵنیاین باش زانیویانە چ هۆکارێك وای لە ژنان کردووە، کە هانا بۆ ئەو رێوشوێنە توندوتیژانە ببەن، بە کورتی: ژنە رۆمانییەکان، بێ هیچ بەرگری یان تێکۆشانێك، کە بە جۆرێك لە جۆرەکان کۆتایی بە ستەمی پیاوان بهێنێت، رادەست و ملکەچی پیاوان نەبوون[٢٦].

**دووەم:** لە لایەکی ترەوە، ساڵی ١٨٠ پ.ز رووداوێکی هاوشێوەی ئەوەی پێشوو روویدا. بەڵام ئەمجارەیان تاعونەکە راستەقینە بوو، ماوەی سێ ساڵ بەردەوام بوو و هەڕەشەی لە تەواوی ئیتاڵیا دەکرد. لە نێوان پیاوان و ژنانیشدا لە پەیوەست بە نهێنییە باخۆسییەکانەوە[٢٧] ناکۆکی دروست بوو. کاتێك پیاوان لە سەروبەندی بڵاوەکردنی تاعونەکەدا رێوشوێنەکانی خۆیان دژی ژنان توندترێك کرد، ژنانیش لای

خۆیانەوە هەستیان دەکرد، کە ئەو نەخۆشییە هەلێکی باشی بۆ بەکارهێنانی ژەهرەکە رەخساندبێت. لیڤی مێژوونوس دەگێڕێتەوە: لەو ساڵەدا پریتۆر[٢٨] و کونسوڵ[٢٩] و ژمارەیەکی زۆری پیاوە باڵاکانی رۆما تیاچوون. دادوەرێك بۆ دەستنیشانکردنی هۆکاری ئەو مردنانە، بە تایبەتیش بۆ توێژینەوە لە پرسی ژەهراویکردن، دەستنیشانکرا. مێژوونوسان باسی ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەیان نەکردووە، بەڵام دەزانین، کە هاوسەری کونسوڵ دادگایی کرا و تۆمەتی بە سەردا ساغبووەوە و حوکمی مردنیشی بە سەردا درا.

**سێیەم:** پاش ئەو رووداوە بە سی و شەش ساڵ، دوو کەس لە پلەی کونسوڵدا بە هەمان شێواز (ئەوەی ژنەکەی ژەهری بۆ بکاتە شەرابەوە) مردن. تا وای لێهات لە سەدەکانی دواتردا، بە تایبەتی لە ساڵانی سەرەتای ئیمپراتۆرییەتی رۆمانیدا بەکارهێنانی ژەهر بووبوو بە شتێکی باو و بەربڵاو. چەندین ژنیش بەو کارە تۆمەتبار کران. ئەوەشی خۆشە ژنەکان لە بەردەم دادگادا رایانگەیاندووە، کە تا بۆیان بلوێت ژەهر بۆ پیاوان تێدەکەن بۆ ئەوەی لە کۆڵیان بکەنەوە، جا مێردیان بووبن یان کوڕ، تەنانەت هەر پیاوێکیش، کە پەیوەندیی پێیانەوە هەبێت بە بیانییەکانیشەوە.

جا ئەم بەسەرهاتانە راستەقینە بن یان خەیاڵی، ئەوەی گرنگە رۆمانییەکان باوەڕیان پێیان هەبووە و بە گێڕانەوەشیان باوەڕی خۆیان بەوەی ژن دەتوانێت چی بکات، ئەوەی ئێستا پێی دەڵێین داوی ژنان (كيد النساء)، بەرجەستە کردووە. هەرچی بوو بێت، لای ئێمە ئاماژەن بە هەستی ژنی رۆمانی بەرامبەر بەو کەسانەی بە شێوازی خراپ مامەڵەیان لەگەڵدا کردووە، هاوکات جاڕدانی یاخیبوونیشە: نابێت ئەو مامەڵە خراپانە قبووڵ بکەن، پێویستە بەرگری بکەن و بە هەر شێوازێك، تەنانەت ئەگەر بە تێکردنی ژەهریش بێت، تۆڵەی خۆیان بکەنەوە!

### ب ـ ژنی بیانی:

ئەگەر رۆما گرنگیی بە ژنی رۆمانی دابێت و بایەخێکی تایبەتی بە پاکێتی و داوێنپاکیی دابێت، بۆ ئەوەی نەوەیەکی رۆمانیی وا بخاتەوە، کە شیاوی ئەوە بێت

میراتی ــ بە مانای فراوانی وشەکە ــ ببات، کە زەوی و خانوو و پارەش دەگرێتەوە، وەك چۆن ئیمتیازەکان و مافە سیاسییەکانیش دەگرێتەوە، کە جگە لە خۆی نادرێنە کەسێکی تر، ئامانجی هاوسەرگیریشی لە بەرهەمهێنانی ((رەگەزێك یان چینێکی هاوولاتیان))دا بینیبێتەوە، کە تیایدا دایك و باوکیش سەر بە گروپی ((هاوولاتیی رۆمانیی)) خاوەن ماف و ئیمتیازات بن، کەچی هیچ گرنگییەکی بە هەڵسوکەوتی پیاوی رۆمانی نەداوە، پیاو بۆی هەبووە لەگەڵ ژنی بیانی (و کەنیزەکەکانیشدا) رابوێرێت، بەڵام نەوەکانی لەم ژنە دانپیانراو نەبوون و هیچ میراتییەکیان بەرنەکەوتووە، چونکە بە هاوولاتیی رۆمانی نەژمێردراون. هەروەها دەوڵەت هیچ گوێی بەو پەیوەندییانە نەدەدا، کە لە نێوان پیاوی رۆمانی و ژنی بیانی یاخود کەنیزەکدا دروست دەبوو، کۆمەڵگاش لای خۆیەوە هیچ بەهایەکی بۆ دانەدەنا.

لە مێژووی سەرەتایی رۆمادا چەند ژنێکی کەمی بیانی دەرکەوتوون و رۆڵێکی بەرچاویان گێڕاوە، بەڵام لە مێژووی شکۆداری دواتری رۆمادا بیانییەکان هیچ ناو و رۆڵێکیان نەبووە[30].

**ج ـ کەنیزەك:**

کەنیزەك لە رۆمادا هیچ مافێکی نەبووە، چونکە بە سووك و ئاسان وەك ئاژەڵێك، یان بە قسەی هەندێك مێژوونوس، وەك مانگایەك مامەڵەی لەگەڵدا کراوە. کەنیزەك موڵکی تایبەتیی ئاغاکەی بووە، ئەگەر نەوەیەکی بە هێزی لەشساغی بخستایەتەوە، رەزامەندیی ئاغاکەی بە دەست دەهێنا، کە ئەویش هیچ بەلایەوە گرنگ نەبووە کێ باوکی ئەو منداڵە بووبێت. کەنیزەك بۆی نەبووە شوو بکات، چونکە خۆی و منداڵەکانیشی موڵکی تایبەتیی ئاغاکەیان بوون، رەنگە کەنیزەك و کۆیلەکان ژیانێکی هاوشێوەی ژیانی ژن و مێردایەتی پێکەوە ژیابێتن، بەڵام ئەگەر منداڵیان ببوایە، هیچ مافێکیان بە سەریەوە نەدەبوو، ئەگەر کەنیزەکەکەش بە پیت و بەرهەم، واتە منداڵی ببوایە، ئەو کات بە باشی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا. لە سەردەمە کۆنەکانی رۆمادا ئەو کەنیزەکەی سێ منداڵی دەبوو، لە کارە قورسەکانی

ناوماڵ دەبەخشرا. زۆر جار ڕۆمانییەکان مامەڵەیەکی باشیان لەگەڵ ئەو کۆیلانەدا دەکرد، کە لە ماڵی خۆیاندا هاتوونەتە دنیاوە و لەگەڵ ئەو منداڵانەی خێزانەکەدا، کە هاوتەمەنی خۆیان بوون، بەخێویان دەکردن. لێرەوە پەیوەندییەکی دۆستانە لە نێوانیاندا دروست دەبوو، زۆر جاریش ئەم پەیوەندییە هەستکردنی بە موڵکداریی ڕەها کەم دەکردەوە، چونکە لە وەها حاڵەتێکدا بە چاوێکی تایبەتی سەیری کەنیزەك دەکرا. بێگومان بە کاریگەریی ئەم فاکتەرەش حاڵی کەنیزەکەکان باشتر بوو، تا ئەوەی دەبینین لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەتدا چەند یاسایەك بۆ پاراستنیان دانراوە و زۆر جاریش ڕوویداوە، کە ئازاد کراون[31].

**دووەم: پیاو**

لەوەی رابورد تێدەگەین، کە خەسڵەتی سەرەکی و جیاکەرەوەی یاسای ڕۆمانی ئەوە بوو، پێدانی دەسەڵاتێکی بێ سنور بوو بە پیاو بە سەر ژن و مناڵەکانیدا، ئەو بەسەرهاتانەشی لە بارەی یاخیبوونی ژنانەوە باسکران، ئاماژەدانێکی روونن بەو چەوساندنەوە و ستەم و ناحەقییەی دەرهەق بە ژن پێڕەو دەکران. تا کار گەیشتبووە ئەوەی ژەهر بۆ پیاوەکەی، یان ڕەنگە بۆ منداڵ و هاوڕێ و ناسراوەکانیشی تێ بکات، پاشان بە جۆرێك لە نائومێدیی تەواوەوە لەو ژیانە پڕ سوکایەتییەی تیایدا دەژیان، خۆکوژیی بە کۆمەڵیان ئەنجام دەدا. لەبەر ئەوەشە خێزانی ڕۆمانی بەوە ناسراوە، کە خێزانێکە لە سەر دەسەڵاتی باوك بەندە، یان بەوەی خێزانێکی باوکسالارانەی پاتریارکییە، چونکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی باوك خاوەن دەسەڵاتی تەواوە بە سەر هەموو شتێکی خێزانەکەدا.

لەوێشەوە دەبینیت، کە پیاو لە هەموو بوارەکاندا دەستڕۆیشتووە: لە ئاستی دینیدا، دەبینین پیاو خاوەن قسەیە، هەر بە تەنیا ئەویش ڕێگەپێدراوە بەوەی بەردەوامیی بە پەرستنی پێشینانی بدات، چونکە دینی خێزان لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر، لە ڕێگەی نێرینەوە دەگوازرێتەوە، هەر باوکیش کاهینی گەورەی

خێزانە. کاتێکیش کچ شوو دەکات ــ وەك بینیمان ــ پێویستە وازهێنانی لە دینی باوکی و چوونە سەر دینی مێردەکەی رابگەیەنێت و هەمان سروتەکانی ئەو دینە پێڕەو بکات. تەنانەت پێشینانی مێردەکەشی دەبنە پێشینانی ئەو، بەو شێوەیەی لە بابەتی ژنی رۆمانیدا باسمانکرد[٣٢].

لە سەر ئاستی سیاسیش، دەبینین هەر پیاو لە مەیدانەکەدا بوونی هەیە، ژن هیچ مافێکی سیاسیی نییە و رێگەشی نادرێت بەشداری لە هیچ کارێکی سیاسیدا بکات[٣٣]، بگرە لە هەموو وەزیفە گشتییەکانیش بێبەشە، بە هۆی ئەوەشەوە ئەو وەزیفانە پێیان دەوترێت ((وەزیفەکانی نێرینە)) یان ((وەزیفەکانی پیاو))[٣٤]. هەرگیز روونەداوە ــ وەك باسمانکرد ــ کۆمەڵگای رۆمانی هانی ژنان بدات، بەو وەزیفانە هەستن، کە پیاو پێیان هەڵدەستێت[٣٥]، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەردەوام هەوڵەکان شکستیان پێهێنراوە و فشاری زۆریش هێنراوە، تا لە کۆتاییدا تەقیوەتەوە!

بەڵام چۆن هەر لە سەرەتاوە دەسەڵاتی باوك دەردەکەوێت؟ وەڵامەکەی ئەوەیە: هەر لە ساتی لەدایکبوونەوە. ئەگەر منداڵێکی بە شێواوی یان بە هەر شێوەیەك بە کەم ئەندامی لەدایکببوایە، مافی خۆی بوو بەو شێوازەی خۆی بە گونجاوی دەزانی، لە ناوی ببات: وەك ئەوەی لە ئاودا نوقمی بکات تا دەخنکێت، یان لە چۆڵەوانیدا لە سەر لوتکەی شاخێك جێی بهێڵێت تا داڵ یان هەر ئاژەڵێکی کێوی بیخوات و...هتد. هاو کات ئەگەر کچیش بووایە، بۆی هەبوو ــ ئەگەر بیویستایە ــ بیخنکێنێت، یان لە چۆڵەوانیدا جێی بهێڵێت تا دەمرێت، یان بە هەر شێوازێك خۆی پێی باش بووایە لە ناوی ببات. بەڵام لە غەیری ئەو حاڵەتانەدا، باوك پێشوازیی لە هاتنە دنیای منداڵەکەی دەکرد، نیشانەی رازیبوونیشی ئەوە بوو، کە لە ئامێزی بگرێت و لە بەرچاوی ئامادەبوواندا بەرزی بکاتەوە[٣٦].

سەرەڕای ئەوانەش، بە تەنیا باوك مافی موڵکداریی هەبوو، هەر ئەو شت دەکڕێت و دەیانهێڵێتەوە یان دەیانفرۆشێت، بۆیشی هەیە هەموو یان بەشێك لە منداڵەکانی لە میراتی بێبەش بکات، هاوسەرگیریان پێبکات و تەڵاقیشیان پێبدات، یاخود

کوڕەکەی و بووکەکەی لێك جیا بکاتەوە. هەروەها مافی هەبوو، ئەگەر ژنەکەی تۆمەتبار بکرایە، دادگایی بکات و حوکمی بدات و ئەو سزایەشی خۆی پێی گونجاو بوو بە سەریدا بسەپێنێت، بەو شێوەیەی لە کاتی باسکردنی وتەکەی کاتۆی گەورەد باسمانکرد، کە وتی پیاو ئەگەر ژنەکەی لە کاتی ئەنجامدانی زینادا بگرێت، بۆی هەیە بیکوژێت. هەروەها ئەگەر لە کاتی دزینی کلیلی گەنجینەی شەرابدا بیگرتایە، بۆی هەبوو بیکوژێت، بە هەمان شێوە دەسەڵاتی ژیان و مەرگی بە سەر مناڵەکانیدا هەبوو، یان بۆی هەبوو وەك کۆیلە لە بازاڕدا بیانفرۆشێت. کوڕەکانیشی هەرچییان پەیدابکردایە، بە پێی یاسا دەبووە موڵکی تایبەتیی باوکیان، یان وەك پەندە عەرەبییەکە دەڵێت: تۆ و کەنیزەکەکانت هەرچیتان هەبێت موڵکی باوکتانە، کۆیلەش هەرچی هەبێت هی ئاغاکەیەتی[٣٧].

ئەگەر پیاو دەسەڵاتی ژیان و مەرگی بە سەر مناڵەکانیدا هەبێت، ئەوا ژن لە دیدی رۆمانییەکاندا منداڵێك بوو، کە بەردەوام پێویستیی بە رێنوێنی و چاودێری هەبوو، هۆکاری ئەوەش وەك باسکرا رەنگە زوو بە شوودانی بێت، رەنگە هەر ئەوەش بێت هۆکاری قەدەغەکردنی خواردنەوە و تامکردنی شەراب لە سەر ژن. ئەگەر ژنێك سەرکێشیی ئەوەی بکردایە شەراب بخواتەوە، قورسترین سزا دەدرا، بیانووشیان ئەوە بوو، گوایە مادەیەکی نهێنی دەچووە لەشییەوە، کە نەدەتوانرا ئەنجامەکانی بزانرێت، کەچی پیاوان لە کاتی خواردنەوەیدا هیچیان بە سەر نەدەهات! لێرەوە مافی ئەوە بە پیاو درا، کە ئەگەر ژنەکەی شەرابی بخواردبایەتەوە، تا مردن لێی بدات بێ ئەوەی هیچ کەسێك سەرزەنشتی بکات[٣٨]. هەروەها بە هەموو شێوەیەك بۆ ژنان قەدەغە بوو بچنە ئەو ژێرزەمینەیەوە، کە شەرابی تێدا هەڵدەگیرا، جا ئەگەر ژنێك کلیلی گەنجینەکەی بدزیایە، یان لەبەری بگرتایەتەوە، تاوانێکی هێندە قێزەونی ئەنجامدەدا، کە دەشێت سزاکەی مەرگ یان تەڵاق بێت. تەنانەت کاتۆی گەورە لە یەکێك لە وتارەکانیدا دەڵێت، پێویستە پیاو لە دەمەوە ماچی ژن ــ یان ئەوانەشی کە پەیوەندیی خوێنی هەبوو لەگەڵیان ــ بکات، تا بۆنی دەمیان بکات و بزانێت

هەناسەیان بۆنی شەرابی لێدێت یان نا، بەڵام ئەگەر بە شووی دان چیتر ئەو کارە دەبووە مافی ڕەهای مێردەکەی[39]. زیاتر پێی دەچێت هۆکاری قەدەغەکردنی خواردنەوەی شەراب لە ژنان، پەیوەندیی بە تێڕوانینی ڕۆمانییەکانەوە هەبێت بۆ ژن، وەك ئەوەی لە حوکمی منداڵدایە و ناشێت شتێك بخواتەوە، کە مەستی بکات یان ئەقڵی پێ لە دەست بدات، لە کاتێکدا ئەو خۆی لە بنەڕەتدا (هەڵەشە) یان ئەقڵی سووکە، وەك ئەوەی لە دەقی یاساکەی جۆستنیاندا بینیمان!

دەمانەوێت ئەم بەشە بە دوو بەسەرهات کۆتایی پێ بهێنین، کە مێژوونووسی گەورەی ڕۆمانی (لیڤی) بۆمان دەگێڕێتەوە، کە بۆ خۆی لە سەردەمی ئیمپراتۆر ئۆگەستۆسدا ژیاوە، بەسەرهاتەکانیش بە وردی باس لە دەسەڵاتی ڕەهای باوکی ڕۆمانی دەکەن:

**یەکەم:** باسی کچێك دەکات بە ناوی هوراشیا، دەزگیرانی کوڕێك بوو لە بنەماڵەی کیریاتی، دواتر شەڕ لە نێوان براکانی و کیریاتییەکاندا دروست دەبێت، براکانی سیانیان لەوان کوشتووە ــ یەکێکیان دەزگیرانەکەی هوراشیا بووە ــ هاوکات دوو برای کچەکەش لەو شەڕەدا کوژراون. هوراشیا بە هۆی کوژرانی دەزگیرانەکەیەوە زۆر خەمبار بووە. دوو برای تری کچەکەش، کە مابوون، دڵتەنگیی خوشکەکەیان بۆ مەرگی دەزگیرانەکەی زۆر پێ ناخۆش بووە، بۆیە یەکێکیان هەستاوە بە خەنجەر لێی داوە و وتوویەتی: پێویستە هەر ژنێکی ڕۆمانی، کە بۆ دوژمن دڵتەنگ دەبێت، ئاوا بمرێت)). هەر چەندە ئەو برایە ناچارکرا وەك پەشیمانییەك لەو هەڵوێستە هەڵەشەییەی کەفارەتێك بدات، بەڵام باوکیان ڕەزامەندیی تەواوی خۆی لەو ڕەفتارەی کوڕەکەی دەربڕی و جەختی کردەوە، کە ئەگەر کوڕەکەی نەیکوشتایە، ئەو کات خۆی بە پێی ئەو دەسەڵاتەی(بە حوکمی باوکایەتی) پێی بەخشراوە، دەیکوشت[40]!

**دووەم:** ئەپیۆس کلاودیۆس، یەکێك بوو لەو خانەدانانەی ڕۆما، کە ڕێبەرایەتیی هەڵمەتی دەرکردنی یاسای قەدەغەکردنی هاوسەرگیریی خانەدانەکانیان لەگەڵ خەڵکی عەوامدا کرد، بەڵام زۆری نەمابوو یاساکە دەربچێت، کاتێك خۆی کەوتە داوی

خۆشەویستیی کچێکی عەوامی جوانەوە بە ناوی ڤێرجینیا. هەوڵیدا بیکاتە دۆستی خۆی تا پێشێلی یاساکە نەکات، بەڵام کچەکە لە سەرەتاوە رازی نەبوو، باوکی کچەش هەولّی زۆری دا بۆ ئەوەی کچەکەی نەکەوێتە داوی ئەپیۆسەوە. بەڵام کچێکی مندالّی داماو و هەژار نەیدەتوانی ماوەیەکی زۆر خۆی لە خانەدانێکی مەزنی وەك ئەپیۆس بپارێزێت. باوکیشی دەترسا لەوەی کچەکەی هەڵبخەڵەتێت، وەك چارەسەرێکیش هیچ رێگەیەکی تری غەیری کوشتنی کچەکەی شك نەبرد، وتیشی ئەگەر کچەکەی نەتوانێت بە شەرەفەوە بژی، ناچارە بیکوژێت بۆ ئەوەی هیچ نەبێت مردنێکی شەریفانەی، هەر چەندە جێی داخیش بێت، پێ ببەخشێت[٤١].

ئەو رووداوە هەڵایەکی گەورەی لە وڵاتدا دروست کرد، بووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی یاسای هاوسەرگیریی خانەدان و ئەشرافەکان لەگەڵ خەڵکی عەوامدا قەدەغەدەکرد، بەو شێوەیەش ئەو قسەیەی بۆتارك راست دەردەچێت، کە ژنی رۆمانی جگە لە پیاو، جا باوك بووبێت یان مێرد، هیچ چارە و پەناگەیەکی تری نەبووە، هاوکات هەر ئەویش مافی بڕیاردانی بە ناوی ژنەوە هەبووە[٤٢].

# بەشی دووەم
# پاشخانی دینیی یەهودی

لە کتێبی یەکەمی ئەم زنجیرەیەوە ــ مەبەستم ((ئەفلاتون و ژن))ە ــ ئێمە هەوڵ دەدەین گرنگی و رۆڵی فاکتەری ئابووری ــ سامان یاخود موڵکداریی تایبەتی ــ لە دیاریکردنی دۆخ و پێگەی ژن لە کۆمەڵگادا بخەینەڕوو.

هەتا پیاو هەژموونی بەسەر ساماندا هەبێت و کۆنترۆڵی بکات، سیستەمی باوکسالاری و خێزانی پاتریارکی دروست دەبێت، نەوە و پەیوەندیی نەوەکان لە ڕێگەی باوکەوە دەبێت، باوکیش دەسەڵاتێکی ڕەهای لە ناو خێزاندا دەبێت، چاویشی دەخاتە سەر ئەو (دەفرەی)، کە نەوەکانی لێوە دێنە بوون، بۆیە هەوڵ دەدات لە جێگەیەکی تاریکی ماڵەکەیدا دوورەپەرێزی بکات، تا کەس نەیبینێت و هەر بە پاکی بمێنێتەوە و نەوەیەکی وەها بخاتەوە، کە هیچ خوێنێکی بێگانەی تێکەڵ نەبێت.

لای بەنی ئیسرائیلیش دۆخەکە بە هەمان شێوە بوو، سیستەمەکانی ژیانیان لە سیستەمە باوەکانی خێڵە شوانکارەییەکان جیاواز نەبوو، لە پێش هەمووشیانەوە: سیستەمی باوکسالاری، کوڕ هی باوك و سەر بە خێڵی باوکیش دەبێت. بەو شێوەیەش پیاوانی بەنی ئیسرائیل مافی یەهودیی بوونیان بۆ خۆیان قۆرخکرد و تەنیا خۆیانیان بە یەهودی دەزانی. کەچی ژنان، کچ (واتە شوێنکەوتە)ی پیاوە یەهودییەکان بوون، هەر چەندە ئەو پیاوانە لە دایکێکی یەهودی لە دایکبووبوون. هەر لەبەر ئەوەشە ئەو گەلە بە گەیەشتنی کوڕەکانیان ــ نەك کچەکانیان ــ بە تەمەنی باڵغبوون خۆشحاڵ دەبوون و ئاهەنگێکی دینیی گرنگیان ڕێك دەخست.

هەر بۆیە ماڵی عیبری بە مانا نوێیەکەی خێزان، خێزان نەبوو، کە لە دایك و باوك و منداڵەکانیان پێك هاتبێت، بەڵکو هاوشێوەی خێزانی سەردەمی ڕۆمانییە

کۆنەکان خێزانێکی پاتریارکییە، کە پێکدێت لە: پیاوان، ژمارەیەك ژن و کەنیزەك، ئەو منداڵانەی لە ژن و کەنیزەکەکان دەبوون، ژنی کوڕەکانیان، نەوەکانیان و کۆیلەکانیان[٤٣]. راستییەکەی ئەوەش جۆرە خێزانێکی گەورە بوو، باوك سەرۆکایەتیی دەکرد، کە پێیان دەوت ((روش)) واتە سەر، دەسەڵاتگەلێکی دادوەریی رەهای هەبووە، میراتگرەکانی ئازادانە و بە ویستی خۆی هەڵدەبژارد، دەیتوانی چۆنی بوێت بڕیار لە ژیانی منداڵەکانیدا بدات: بۆی هەبوو کچەکەی وەك کەنیزەك بە هەر کەسێك، کە ئارەزووی کڕینی دەکرد بفرۆشێت، وەك ئەوەی لە سفری دەرچووندا هاتووە: ((ئەگەر پیاوێك کچەکەی وەك کەنیزەك فرۆشت، ئەو کات هاوشێوەی کۆیلەکان ناچێتەدەر...))(٧:٢١). تەنانەت مافی ژیان و مردنی بە سەر منداڵەکانیدا هەبوو، بۆی هەبووە بیانکوژێت، یان بیانکاتە قوربانیی بۆ خودا. ئەم مافەش بە سەر هەموو ئەو کەسانەی لە ژێر دەسەڵاتی باوکدا دەژیان، پیڕەودەکرا، بۆی هەبوو ژنی کوڕە مردووەکەی بسوتێنێت ئەگەر زینای بکردایە، وەك ئەوەی یەهودا لەگەڵ ((سامار))دا کردی: ((لە کاری زیناوە دووگیان بوو، یەهوداش وتی دەریبکەن و بیسوتێنن))(تکوین ٢٤:٣٨).

بەو شێوەیە ژن لە کەلەپووری یەهودیدا دێتە کەمترین و نزمترین ئاستەوە، بە جۆرێك خەریکە لە ئاستی ئاژەڵ و شتەکان نزیك دەبێتەوە، چونکە ژن بەشێك بوو لەماڵی ئیسرائیلی، وەك چۆن بەشێکیش بوو لە خێزانی رۆمانی، واتە لە چوارچێوەی ئەو میراتییەدایە، کە لە کۆیلە و پارە پێك دەهات. ماڵ لای بەنی ئیسرائیل پێکدێت لە: ژن، کۆیلە، کەنیزەك، گا، گوێ درێژ و شتەکانی تریش. بە پیاویان دەوت بەعل Baal[٤٤] واتە گەورە یان ئاغا، ژنیش مێردەکەی بە ((گەورەم)) بانگ دەکرد. لە کاتی لە دایکبوونی کوڕدا هەمووان دڵخۆش دەبوون، بەڵام ئەگەر منداڵەکە کچ بووایە وا نەدەبوون.

راستییەکەی، سەردەمی کەونارا (العهد القديم) رەنگدانەوەی دۆخی خراپ و نالەباری ژن بوو لە سەردەمی خۆیدا، چونکە نووسەرانی ئەو کتێبە ــ بە هەموو

مانایەك ــ پیاوی سەردەمەكەیان بوون، بۆیە ساویلكەییە ئەگەر پێمان وابێت، كە دەكرا بە یەكجاری خۆیان لە مەیلی لایەنگریی و بۆچوون و قەناعەتە باوەكانی سەردەمەكەیان بە دوور بگرن[٤٥]. ئەوەتا پیاوی یەهودی لە نوێژی بەیانیدا داوا لە خودا دەكات و سوپاسی دەكات: ((سوپاست دەكەم خودایە، كە بە ژن خەڵقت نەكردووم))[٤٦]. بەڵام ژنی یەهودی بە خۆبەدەستەوەدانەوە دەیوت: ((سوپاست دەكەم خودایە، كە چۆنت ویستبێت خەڵقت كردووم))[٤٧].

بۆ پیاو حەرام بوو، لە پۆشاك و ڕێكردندا خۆی بە ژن بچوێنێت، بە پێچەوانەشەوە هەر ڕاست بوو. لە (سفر التثنية)دا هاتووە: ((نابێت ژن جلی پیاو بپۆشێت، بۆ پیاویش نییە جلی ژنانە لەبەر بكات، هەر كەسێكیش وا بكات لای خودا قێزەون دەبێت))(ئیسحاحی بیست و دووەم: ٥).

وێنەی ژنی چاك لای پیاوی یەهودی، هاوشێوەی وێنەی ژنی چاك بوو لای ئەرەستۆ: ژنی كامڵ بەرپرسە لە خۆشگوزەرانیی خێزان، هەر ئەویش بەرپرسە لە دابینكردنی پێویستییە راستەوخۆكانی. سەرەڕای ئەوەش، كارێكی حەكیمانە نییە، كە ژنی باش بەشداری لە ژیانی ئەقڵی و ڕۆحیی كۆمەڵگادا بكات.

گۆرانییەكانی هاوسەرگیریش هەمان بیرۆكە دووپات دەكەنەوە ــ ئەو گۆرانییانەی بە سرود یاخود گۆرانییەكانی سلێمان یان سرودی هاوسەرگیری ناسراون ــ كە لە سەدەی نۆیەمی پێش زاییندا نووسراون. لە ئیسحاحی سی و یەكەمدا نووسەر دەپرسێت: ((كێ دەتوانێت ژنێكی چاكەكار بدۆزێتەوە؟ نرخی ژنێكی وەها لە نرخی زێڕ و یاقوت زیاترە))(سفر الامثال: ئیسحاحی ١٠:٣١). دواتر خەسڵەتەكانی ژنی باشی دەگمەن دەنووسێت: ئەوەی دڵی مێردەكەی بە تەواوی متمانەی پێدەكات، هیچ پێویستی بە پاداشت و غەنیمە نییە. بە درێژایی ژیانی چاكەی بۆ دەخوازێت نەك خراپە. داوای سوف و كەتان دەكات و ڕەزامەندانە بە دەستانی كار دەكات. چراكەی بە درێژایی شەو ناكوژێتەوە و خەریكی ڕستن دەبێت)) (أمثال ١١:١٩ ــ ٣٠).

له (سفر الجامعه)شدا هاتووه: ((له مەرگ تاڵترم دۆزیوەتەوە: كە ئەویش ژنە، وەك تۆڕ وایە، دڵی داوە و دەستیشی كۆت و بەندە. ئەوەی سەر ڕاست بێت لای خودا، لێی رزگار دەبێت، ئەوەشی هەڵەكار بێت دەكەوێتە داوییەوە))(ئیسحاحی حەوتەم: ٢٦).

كتێبی پیرۆز لە سەردەمی كەونارادا زۆر شتی تێدایە، كە هەستی ژنی مۆدێرن دەهەژێنێت، چونكە ئەو ــ تا رادەیەك ــ وا راهاتووە، كە خۆی وەك كەسێكی سەربەخۆ و ئازاد وێنا بكات، ئەوەش لە كاتێكدا لەو كتێبەدا، ژن، بە حوكمی ئەوەی گوایە مەخلوقی پلە نزمن، وەك كۆیلە وێناكراون. هەر چەندە ژنی یەهودی لە ئاستی كۆیلەدا نەبوو، بەڵام دۆخی نالەباری ناچاری كردبوو بەو شێوەیە قسە لەگەڵ مێردەكەیدا بكات، كە كۆیلە لەگەڵ ئاغاكەی یان رەعیەت لەگەڵ پاشاكەیدا قسە دەكات. شەریعەتی یەهودی بە تەواوی تەنگی بە ژن هەڵچنیوە، لە پێناوی ئەوەی سەركزی بكات و لە ماڵەوە بیهێڵێتەوە، بۆ نموونە ناچاری كردووە وەڵامی داواكاریی سێكسی مێردەكەی بداتەوە، تەنانەت ئەگەر مەیلیشی لە سێكس نەبێت. جا ئەگەر وەڵامی ئەو داوایەی نەدایەوە، یان رەتیكردەوە لە خزمەتیدا یان لە ماڵەكەیدا كار بكات، ئەو كات بە ناشز ( واتە لە فەرمانی مێردەكەی یاخی بووە و جێبەجێی ناكات) لە قەڵەم دەدرێت و حوكمی ژنی ناشزیشی بە سەردا جێبەجێ دەكرێت.

هەروەها لە شەریعەتی یەهودیدا ژن دەبێت بە تەواوی پرچی داپۆشێت، وەك نیشانەیەك بۆ موڵكداریی لە لایەن مێردەكەیەوە و ملكەچی و پابەندبوونی بە فەرمانەكانییەوە، هەندێكیشیان پێیان وایە دەبێت سەرتاپای جەستەی بە عەبایەك داپۆشێت، كە تەنیا كونێكی تێدا بێت بۆ ئەوەی لە كاتی رێكردندا لێیەوە ببینێت.

هەروەها یەهودییەكان وەك هەوڵێك بۆ جیاكردنەوەی ژن لە پیاو، باڵاپۆشییان لە پەرستگاكاندا داهێنا، تەوقەكردنی ژن و پیاویشیان قەدەغەكرد. دەرگایەكی تایبەتییان لە پەرستگاكاندا بۆ دروست كردن، وەك رێزێكیش بۆ گرۆی پیاوان، دەبوو بێدەنگیی بپارێزن ــ گوایە دەنگی ژن عەورەتە ــ هەروەها چوونە سەر تەختە لە

کاتی نوێژ و خوێندنەوەی تەوراتیان بە دەنگی بەرز لیّ حەرامکردن. بیانوویان بۆ باڵاپۆشیی ژنان ئەوە بوو، گوایە پرچی ژن هۆکاری فیتنەیە و سەرچاوەیەکە بۆ بە لاڕێدا بردن، چونکە ژنان شوێنی دامرکاندنەوەی شەهوەتی پیاوانن و خۆیشیان لاوازن و ناتوانن لە هەڵەشەیی و ئەقڵ سووکی بە دووربن، بە سروشتی خۆیشیان مەیلیان بە لای خراپەدا هەیە!

بۆ زیاترکۆنترۆڵکردنی ژنان و دەستەبەرکردنی شێوازی بیرکردنەوە و ژیانیان، شەریعەتی یەهودی خستونییەتە ژێر دەسەڵاتی پیاوە خزمەکانیانەوە: کچ لە سەرەتای گەنجێتیدا موڵکی باوکییەتی، بۆی هەیە بە هەر کەسێکی ویستی بە شووی بدات، بەو مەرجەی زاواش خزمەتی خەزووری بکات. یەعقوب حەوت ساڵ خزمەتی خاڵۆی ((لابان))ی کرد تا لیئە ــ ی کچە گەورەی لیّ مارەکرد (هەر چەندە یەعقوب کچە بچووکەکەی خۆشدەویست) پاشان حەوت ساڵی تریش خزمەتی کرد تا راحیل ــ ی خۆشەویستی خۆی مارەکرد (تکوین ١٥:١٩ ــ ٢٠). باوك بۆیشی هەیە بە هەر کەسێکی ویست و بە هەر پیاوێك بێت، کچی خۆی بە شوو بدات، رەنگە لە پاداشتی ئازایەتی و بوێریی پیاوەکەدا کچەکەی بداتیّ: ((هەر کەسێك بە سەر گوندی سەفەردا بدات، عەکسەی کچمی وەکو هاوسەر پێدەبەخشم))(یشوع ١٦:١٥). لە هەموو ئەو حاڵەتانەشدا پێویست ناکات باوك را و رەزامەندیی کچەکەی وەربگرێت. باوك بۆیشی هەیە بە هەر کەسێك بیەوێت کچەکەی ببەخشێت (وەك دیاری) یان وەك کەنیزەك بیفرۆشێت، بەڵام: ((ئەگەر پیاوێك کچەکەی وەك کەنیزەك فرۆشت، ئەو کچە هاوشێوەی کۆیلەکان ناچێتەدەر))(سفر الخروج ٢١:٧). ئەگەر باوك، بەو پێیەی لە سفری دەرچووندا هاتووە، بۆی هەبێت کچەکەی بفرۆشێت، ئەوا پێویستە گرنگیی بە ((کچێنیی ــ البکارة)) بدات، چونکە نرخی کچ دوو هێندەی نرخی بێوەژنە. بۆیە یەهودییەکان زۆر چاودێریی داوێنپاکیی کچەکانیان کردووە، بە توندیش سزای ژنی زیناکاریان داوە، کەچی بۆ پیاوی زیناکار وا نەبوون، لە هاوسەرگیریدا ژن بابەت (موضع)ی گرێبەستەکەیە نەك لایەنێکی، کاتێکیش دەڕواتە ماڵە مێرد، دەسەڵاتی

سەر ژنەکە لە باوکەوە دەگوازرێتەوە بۆ مێردەکەی و هاوشێوەی خانوو و کۆیلە و پارەکانی دەبێتە بەشێك لە موڵکەکانی.

وەك چۆن یۆنانییەکان ــ دوای ئەوانیش رۆمانییەکان ــ وەك موڵکێکی تایبەتی پیاو سەیری ژنیان دەکرد، یەهودییەکانیش وەك بەشێك لە موڵکەکانی پیاو سەیری ژنیان کردووە. بۆیە دەبینین ژنی پیاوی یەهودی لەگەڵ دە راسپاردەکەی تایبەت بە موڵکەکانیدا ناوی دەبرێت: ((هەرگیز چاو مەبڕە ماڵ، ژن، کۆیلە، کەنیزەك، گا، گوێ درێژ یان هەر شتێکی تری خزمەکەت))(سفر الخروج: ١١٧).

لە (تثنية الاشتراع)دا هاتووە: ((نەکەی چاو ببڕیتە ژن و کێڵگە و کۆیلە و کەنیزەك و گا و گوێ درێژ و هەر شتێکی تری خزمەکەت))(ئیسحاحی ٢١:٥).

سەرباری ئەوەی مێردەکەی بۆی هەیە تەڵاقی بدات ــ تەڵاقدانیش بە تەنیا ئیمتیازی پیاوە ــ و بۆی هەیە دانی پێدا نەنێت ئەگەر گوناهێکی کردبێت، بۆیشی هەیە هەر کاتێك ویستی و بێ هیچ هۆکارێك، لێی جیابێتەوە. دەسەڵاتی ئەوەیشی هەیە لە ماڵەکەی دەریبکات، چونکە ئەو ماڵە بە تەنیا موڵکی پیاوە و ئەویش لەو ماڵەدا موڵکی مێردەکەیەتی، ژنیش هیچ کام لەو مافانەی نییە، ناشتوانێت تەڵاق رەت بکاتەوە. ئەگەر ژن لە رەفتاریدا توشی لادان بوو، یان کارێکی ناشرینی ئەنجامدا، ئەو کات سزایەکی توند دەدرێت، لە کاتێکدا ناپاکیی مێرد، یان دڵسۆزنەبوونی پیاو بە شێوەیەکی گشتی، تەنیا کاتێك سزای دەدرێت، کە پێشیلی مافی پیاوێکی تری کردبێت، وەك ئەوەی لەگەڵ ژنی پیاوێکی تردا زینا بکات، یان خۆشەویستیی هەبێت.

پیاو بۆی هەیە، هاوشێوەی کۆیلەکانی ــ وەك پێشتریش باسمانکرد ــ کچەکەی بفرۆشێت. ئەگەر ژن و مێردێك منداڵیان نەبێت، لەو حاڵەتەدا بەرپرسیارێتیی دەکەوێتە ئەستۆی ژنەکە، چونکە مانای وایە عەیبێکی تێدایە، بە کورتی دەتوانین بڵێین: ژنی عیبری، تەنیا وەك دایك رێزی لێدەگیرا و زۆربەی جاران مامەڵەیەکی باشی لەگەڵ دەکرا، جگە لەوە دۆخی ژن لە رووی یاسایی و کۆمەڵایەتییەوە بە گشتی

نالەبار بوو، چونکە هیچ سەربەخۆییەکی نەبوو، بە هەموو شێوەیەك شوێنکەوتەی پیاو بوو. بۆیە ــ وەك بینیمان ــ پیاوی یەهودی نوێژ بۆ خودا دەکات و سوپاسی ئەوەی دەکات، کە بە پیاو خەڵقیکردووە نەك بە ژن.

رەنگە ئەوە هۆکاری ئەوە بووبێت، کە نووسەرە مەسیحییەکان بە درێژایی چەندین سەدە، گرنگییان بە چیرۆکی خەڵقکردنی حەوا دابێت، کە ئیسحاحی دووەمی سفری تەکوین گێڕاویەتییەوە. هاو کات ئەو چیرۆکە و مەسەلەی دەرکردنیان لە بەهەشت پێکەوە بەستووەتەوە، ئەوەش بووە بە گەواهییەکی بەهێز لەوەی ژن، لە هەردوو لایەنی ئەقڵی و ئەخلاقییەوە لاوازە. راستییەکەی، بە درێژایی چەندین سەدەی مەسیحی، دیدی دوژمنکارانە بۆ ژن لە کولتووری مەسیحیدا ــ بە رادەیەکی زۆر ــ خۆی بە چیرۆکی وەدەرنان لە بەهەشت و رەفتاری دایکی یەکەم پاساو دەدا، کە بە هۆیەوە پیاوی توشی یەکەم و گەورەترین گوناه کرد. ئەم چیرۆکەش وەك ئەفسانە یاخود رەمزێك لێك نەدەدرایەوە، بەڵکو وەك رووداوێکی مێژوویی سەیر دەکرا. یەکێك لە زانایانی دەروونشیکاری لە ئادابەکانی کتێبی پیرۆز کۆڵیوەتەوە و لە دەربڕینێکدا هەڵوێستەکەی کورتکردووەتەوە، کە دەڵێت: ((چیرۆکی کتێبی پیرۆز لە بارەی هاتنە بوونی حەوا ئەو فێڵەیە، کە هەزاران ساڵە دووبارە دەبێتەوە))[٤٨].

ئەوە ئەو زەمینەیە بوو، کە مەسیحییەت لە سەروەختی سەرهەڵدانیدا کاری تێدا کردووە: لە لایەکەوە کەلەپووری رۆمانی، کە درێژکراوەی هەمان کەلەپووری یۆنانییە و هەڵگری هەمان رق و کینەیە لە ژن، لە لایەکی تریشەوە کەلەپووری یەهودی، کە مۆرکێکی دینی بەو جۆرە تێڕوانینە دەبەخشێت. ئەو تێڕوانینەش لە راستیدا دەربڕی سوود و بەرژەوەندییەکانی پیاو و ئارەزوویەتی لە کۆنترۆڵکردنی ژنان ــ بەتایبەتیش هاوسەری خۆی ــ بۆ ئەوەی نەوەیەکی پاکی ئەوتۆ مسۆگەر بکات، کە خوێنی هیچ بێگانەیەکی تێکەڵ نەبێت و میراتیی بەرکەوێت.

ئەوەی سەیرە، ئەو کەلەپووری رۆمانی ــ یەهودییە بە سەر فیکری مەسیحیدا زاڵ بێت و کۆنترۆڵی بکات، بە رادەیەك هەڵوێستە نوێیەکانی حەزرەتی مەسیح ونبن

و جارێکی تر به کەم سەیرکردنی ژنان سەرهەڵبداتەوە، بە دەستپێك لە وتەکانی قەشە پۆڵس ــ ەوە، تا دەگاتە ئەوەی فەیلەسوفە مەسیحییەکان تیۆریزەی بکەن و بەڵگەی سەلماندنی بۆ بهێننەوە. لەو کارەشیاندا پشت بە ((ئەقڵ)) ببەستن و یارمەتی لە ئایەتەکانی کتێبی پیرۆز، بە تایبەتیش سەردەمی کەونارا وەربگرن، بێ ئەوەی هیچ کەسێك باسی هەڵوێست و وتە و تێڕوانینی نوێی حەزرەتی مەسیح لە بارەی ژنەوە بکات، کە ئەو هەڵوێستە نوێیانەش، وەك یەکێك لە توێژەرەکان دەڵێت، دەکرا شۆڕشێك لە دۆخی ژناندا بەرپا بکەن!

# پاژی دووەم

# تێڕوانینی مەسیحیی بۆ ژن

((لەبەر دڵڕەقیی خۆتان ڕێگەتان دەدەم، کـە ژنــەکانتان تەڵاق بدەن، بەڵام لە سەرەتادا بەو شێوەیە نەبوو..))
حەزرەتی مەسیح: (مەتی ١٩:٨)

((بەوانەی هاوسەرگیرییان نەکردووە و ئەوانەشی بێوەژنن دەڵێم: زۆر بۆتان باشترە ئەگەر وەکو من بمێننەوە..))
نامەی یەکەمی پۆڵس بۆ کۆرینتیۆس (٧:٨-٩)

# یەکەم
# حەزرەتی مەسیح

راستییەکەی، هەڵوێستی حەزرەتی مەسیح دەربارەی ژن بە درێژایی چەندین سەدە، زۆر لە هەڵوێستی شوێنکەوتووانی لە حەواری و پەیامبەرانی، بگرە لە هەڵوێستی هەموو کڵێسا مەسیحییەکان لە قۆناغی دواتردا پێشکەوتووتر بوو. لەو قۆناغە سەرەتاییەی مەسیحییەتدا ــ سەردەمی مەسیح ــ ئینجیلەکان کۆمەڵێك هەڵوێستی نوێمان بۆ دەگوازنەوە، کە خوێنەر تیایاندا هەست بە هیچ جۆرە بە کەم سەیرکردنێك بۆ ژن ناکات[٤٩]. چەند کەسایەتییەکی ژنی سەرەکی هەن، کە حەزرەتی مەسیح مامەڵەی لەگەڵدا کردوون و پیایاندا هەڵیداوە، کۆمەڵێك هەڵوێستی ئینسانیی نوێیشی بۆ دەرخستووین:

ــ حەزرەتی مەسیح بە بێ جیاوازی، چارەسەری ژنان و پیاوانی وەك یەك دەکرد، جارێکیان یایرۆس دێتە لای و پێی رادەگەیەنێت: کچە بچووکەکەم خەریکە دەمرێت، خۆزگە دەهاتیت و دەستێکت لێدەدا بەشکو شیفای بۆ بێت.. مەسیحیش دەستی کچەکەی گرت و پێی وت: تەڵیسا هەستە (واتە: ئەی کچە بچووکەکە هەستە)، کچەکەش هەستایە سەرپێ و کەوتەوە رێکردن. (مەرقەس: ئیسحاحی پێنجەم ٢٢-٣٣ و هەروەها ٤٠-٤٣).

ــ هەر وەك چۆن چارەسەری کچە منداڵێکی دەکرد، چارەسەری پیرەژنیشی دەکرد: ((کاتێك یەسوع هاتە ماڵی بوتروس، خەسووی بینی، کە کەوتووە و تای لێهاتووە، دەستی گرت و یەکسەر شیفای بۆ هات))(مەتی: ٨:١٤).

لەو هەڵوێستە نوێیانەشی لە رێگەیانەوە مەسیح، نەریت و کولتووری باوی سەردەمەکەی خۆی شکاندووە، ئەوەیە، کە چارەسەری ژنێکی کردووە، گوایە ماوەی دوانزە ساڵ خوێنی لێ رۆیشتووە و لە دیدی یەهودییەکانیشدا پیس بووە و دەبوو کەس دەستی لێ نەدات، رێك وەك چۆن نابێت تەوقە لەگەڵ ژنێك بکرێت، کە خوێنی

مانگانەی لەبەر بڕوات. بەڵام مەسیح ڕێگەیدا بێتە لای و لە دوایەوە ڕێبکات و ((دەست لە جلەکانیشی بدات)) تا کاتێك خوێنبەربوونەکەی وەستایەوە[٥٠].

ــ جارێك پەسنی ڕەفتاری ((ئەو بێوەژنەی داوەتەوە، کە دوو فلسی خستووەتە ناو خەزێنەوە، مەسیحیش شاگردەکانی بانگکردووە و پێی وتوون: ڕاستیتان گەرەکە، ئەو بێوەژنە هەژارە لە هەمووانی زیاتر خستووەتە خەزێنەوە، چونکە سەرەڕای پێویستیی، هەرچی هەبوو هێناویەتی))[٥١].

ــ جیاوازیی لە نێوان ژنی یەهودی و سامیریی نەدەکرد، تەنانەت هەموو حەرام و نەهیکردنە تەقلیدییەکانی پاشماوەی یەهودییەتی بەزاند، کاتێك ماوەیەکی زۆر لای ژنە سامیرییەك مایەوە و داوای لێکرد خواردنەوەی بداتێ: ((یەسوع پێی وت بمدەیێ با بخۆمەوە و ئەویش سەیری پێهات، پێی گوت: چۆن داوای خواردنەوەم لێدەکەیت لە کاتێکدا تۆ پیاوێکی یەهودیت و منیش ژنێکی سامیری و یەهودیەکانیش مامەڵە لەگەڵ سامیرییەکاندا ناکەن))(٤:٨-١٨).

ــ ((لەو کاتەدا شاگردەکانی هاتن و پێیان سەیر بوو، کە یەسوع لەگەڵ ژنێکدا قسە دەکات))(یوحەننا ٤-٢٧).

جارێکیان حەزرەتی مەسیح قسەی بۆ کۆمەڵە خەڵکێك دەکرد، کاتێك خەریکی قسەکردن بوو ژنێك دەنگی هەڵبڕی و پێی گوت: ((خۆزگە بەو سکەی هەڵیگرتووی، بەو مەمکانەشی شیریان داویت))(لوقا ١١:٢٧). مەسیحیش دەنگی ژنەکەی بە عەورەت دانەنا، ناچاریشی نەکرد بێدەنگ بێت، وەك ئەوەی دواتر قەشە پۆڵس دەیکات، بەڵکو وتی: ((بڵێ خۆزگە بەو کەسانەی گوێ لە کەلامی خودا دەگرن و جێبەجێی دەکەن))(لوقا ١١:٢٨).

کاتێکیش یەسوع چووە ماڵی عەنیا Bethany (گوندێکی نزیك ئۆرشەلیمە) تا عازەر خەبەر بکاتەوە (کە چوار ڕۆژ بوو مردبوو) ژمارەیەکی زۆری یەهودی هاتبوونە لای مەرسا و مەریەم تا سەرەخۆشی مەرگی براکەیان لێ بکەن (یوحەننا ١١:١٧-٢٧). پاشان دەبینین مەسیح لەگەڵ مەرسا، کە لە دەروازەی گوندەکەدا پێشوازیی لە

مەسیح کرد ــ دواتریش لەگەڵ مەریەمی خوشکی ــ باسی زۆر بابەتی ئاست بەرزی کرد، کە پەیوەست بوون بە ئیمان و زیندووبوونەوە و هەستانەوە(قیامەت) و ژیان و مردن و...هتد[٥٢].

ــ هەروەها ئەو ژنەی، کە هەژدە ساڵ بە دەست ئازارێکەوە لە بڕبڕەی پشتیدا دەینالاند و نەیدەتوانی پشتی راست بکاتەوە، مەسیح دەستی خستە سەری و گوتی: ((ئەی ژنەکە لەو ئازارە رزگارت دەبێت... دەستبەجێ راستبوویەوە))(لوقا ١٣:١١-١٣).

لە کاتێکدا یەهودییەکان شەرمیان دەکرد تەوقە لەگەڵ ژناندا بکەن، چونکە بە پیسیان دەزانین ــ بە تایبەتی ژنێك لە سوڕی مانگانەدا بووبێت ــ مەسیح رێگەیدان لێی نزیك ببنەوە، بگرە رێگەی بە ژنێکی گوناهکار دا، کە بە فرمێسکەکانی پێی تەڕ بکات و دواتریش بە پرچی بیسڕێت و ماچی بکات و بۆیشی چەور بکات، تەنانەت لەو فەریسییەی چووبووە ماڵەکەی بە ئیماندارتری دانا: ((یەکێك لە فەریسییەکان داوای لێکرد بڕواتە ماڵەکەی و نانی لەگەڵ بخوات، ئەویش چوو و پاڵیدایەوە، ژنێکی گوناهکاری خەڵکی شاریش هات و..هتد))(لوقا ٧:٣٦-٤٠)، بگرە لێی رازی دەبێت و بە هۆی ئیمانییەوە بە تەواوی لە ژنەکە خۆش دەبێت و لە گوناهەکانی دەبوورێت، بۆیە پێی گوت: ((بڕۆ، گوناهەکانت دەسڕێنەوە، ئیمانت رزگاری کردیت، بە سەرفرازییەوە بڕۆ))(لوقا ٧:٣١-٥٠).

سەرەڕای هەموو ئەوانەش، کاتێك مەسیح دوای مردنی دەرکەوتەوە، یەکەمجار بۆ مەریەمی مەجدەلی دەرکەوت، کە ((حەوت شەیتانی لێ وەدەرهێنابوو))(مەرقەس ١٦:٩) و (٢٠:١-١٧).

حەزدەکەم ئەم بەشە بە باسی ئەو ژنە زیناکارە کۆتایی پێبهێنین، کە چەند فەریسییەکی یەهودی لە پەیکەرەکەوە (الهیکل) هێنایان و بە مەسیحیان گوت: ((بە پێی راسپاردەی موسا، ژنێکی ئاوەها بەردباران دەکرێت، ئەی تۆ چی دەڵێیت؟ پێی گوتن: هەر کەسێکتان، کە هیچ گوناهێکی نییە با بەردی تێبگرێت، ئیتر یەك لە

دوای یەك چوونە دەرەوە، تەنیا مەسیح و ژنەکە مانەوە، مەسیح بە ژنەکەی گوت: منیش تۆمەتبارت ناکەم، برۆ بەڵام گوناهـ مەکە))[٥٣].

هەروەها حەزرەتی مەسیح تێکەڵبوونی هەردوو رەگەزەکە و کۆبوونەوەیانی بەلاوە ئاسایی بوو، جا لە بۆنە دینییەکاندا یان کۆمەڵایەتییەکاندا بێت، بۆ خۆی دەچووە ئاهەنگی هاوسەرگیری، کە دایکی و بێگومان ژنی تریشی هەر لێ دەبوو.

ئەم هەڵوێستە ئینسانییە زۆر جوانانە، دەکرا شۆرشێکی کولتووری و کۆمەڵایەتیی گەورەیان لێ بکەوێتەوە و پێگەی ژن گەلێك بەرزتر بکەنەوە، یان لای کەم لەو گێژاوەی تێی کەوتووە دەریبهێنن. لە راستیدا هەندێك پێیان وا بووە: ((بە هۆی دینی مەسیحی و کاریگەریی بە سەر ئەقڵییەتی توتۆنییەوە Teutonic[٥٤] دۆخ و پێگەی ژن باشتر و بەرزتر بووەتەوە)). بەڵام بە وردبوونەوە لە رووداوە مێژووییەکان بۆمان دەردەکەوێت، کە لە سێ سەدەی سەرەتای مەسیحییەتدا هیچ بەڵگەیەك بۆ دروست بوونی وەها شۆرشێك بوونی نییە. دۆخی ژن لە ناو مەسیحییەکاندا بە تەواوی خراپ بوو، تەنانەت دەتوانین بڵێین: بیرۆکەکان دەربارەی ژن لە سەردەمی پێش مەسیحییەت خراپتر بوون[٥٥]. رەنگە ئەوەش شتێکی بەرچاو و سەرنجراکێش بووبێت، چونکە ژنانێکی زۆر بە پەلە چوونە ناو دینە نوێیەکەوە، کە تیایدا هەستیان بە جۆرێك لە دادپەروەری و ((گەڕاندنەوەی شکۆ)) و بەهاداری و کەرامەت و رێزلێگرتن دەکرد، لە کاتێکدا پێشتر هەستیان پێنەکردووە و شتی وەهایان بە خۆیانەوە نەبینیوە. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، ئەو پاشخانە کولتووری و ژینگە کۆمەڵایەتییەی مەسیحییەت تیایدا سەریهەڵدا، زاڵبوو و ئەو بیرۆکە نوێیانەی دینە تازەکە هێنابوونی زیندەبەچاڵ کرد، بەو شێوەیەش ئەو بیرۆکانە ــ سەرەڕای ئەوەی دینیی بوون ــ هێنرانە ریزی ئەو رقە کۆمەڵایەتییەی لە ژن هەبوو، هاو کات بەرگی دینە نوێیەکە بەو بیرۆکانە درا و ئەو بیرە کۆنەپەرستانەشی پێشتر هەبوو، پیرۆزییەکی دینیی پێبەخشرا. رەنگە ئەوەش ــ لای کەم لە روویەکەوە ــ بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ((ئێمە لە ئینجیلەکاندا تیۆرێکی روون و راشکاو دەربارەی دۆخ و پێگەی ژن

نابینین...))[56]. جگە لە چەند قسەیەکی پەرش و بڵاو و چەند هەڵوێستێکی کردەنیی حەزرەتی مەسیح، هیچی تر نابینین، ئەوەش بە تەواوی جیاوازە لە دۆخی ژن لە نووسینەکانی قەشە پۆڵسدا: چونکە لێرەدا بۆچوون و روونکردنەوەی تایبەت بە هاوسەرگیری و رەفتاری ژن دەبینین، هەر چەندە ئەو بۆچوونانە لە چوارچێوەیەکی تەسکدا دەخولێنەوە[57].

ئەوەی بە ڕاستی جێی سەرنجە، ئەو بە کەم سەیرکردنەی لە کەلەپووری رۆمانی و یەهودیدا هەبوو، وەك خۆی مایەوە و شەریعەتی رۆمانی لە سەدەکانی سەرەتای مەسیحییەت و بەشێکی زۆری سەدەکانی ناوەڕاستیشدا، سەرچاوەی یاسادانان بوو. جگە لەوانەش بە کەم سەیرکردنی ژنان، بە پشتبەستن بە بیرۆکەی گوناهی یەکەم و دانانی ژن وەك سەرچاوەی هەڵخەڵەتاندن و دەروازەی خراپە، بەرگێکی دینیی بە بەرداکرا. ئەمانە و چەندین بیرۆکەی سەیر و سەمەرەی تر، کە پاش کەمێك باسیان دەکەین.

لە کۆتاییدا سەیری ئەم نموونەیە بکە:

بێگومان حەزرەتی مەسیح پەیوەندیی هاوسەرگیریی بە پیرۆز داناوە، بە جۆرێك هەردوو کەسەکە (ژن و مێرد) ببنە یەك جەستە ((ئەوەی خودا کۆی بکاتەوە، مرۆڤ ناتوانێت لێکی بکاتەوە))(مەتی ١٩:٤). کاتێکیش فەریسییەکان هاتن و پرسییان ((ئایا بۆ پیاو حەڵاڵە بە هەر هۆکارێك بێت ژنەکەی تەڵاق بدات؟))(١٩:٣) لە وەڵامدا گوتی: لەبەر دڵڕەقیتان رێگەتان دەدەم ژنەکانتان تەڵاق بدەن))(مەتی ١٩:٨). لەم دەستەواژە ناسکانەدا حەزرەتی مەسیح بە ئاشکرا و راشکاوانە دەربیڕیوە، کە پێویستە دڵڕەقانە مامەڵە لەگەڵ ژندا نەکەین، واتە: بە خۆشەویستی و رێز و پێزانینەوە مامەڵە بکەین. لێرەشدا حەزرەتی مەسیح لایەنی ژن دەگرێت و لە تەڵاق و ستەم و مامەڵەی رەقی پیاو دەیپارێزێت. لە سەردەمێکدا، کە تەڵاق لای پیاو هەر زۆر ئاسان بوو، حەزرەتی مەسیح دێت و پیاو ناچار دەکات ژنەکەی لای خۆی بهێڵێتەوە، تەنانەت ئەگەر نەزۆکیش بێت. پێشتر باسی ئەوەمان کرد، کە چۆن

پیاوی رۆمانی تەنیا لەبەر ئەوەی ژنەکەی بینیوە بە بێ پەچە بە شەقامێکدا رێی کردووە، یان لەگەڵ کەنیزەکێکی تازە ئازادکراودا دەمەتەقێی کردووە، لە ماڵەکەی دەریکردووە، گوایە بەو کارەی تاوانێکی ئەنجامداوە، کە مایەی لێخۆشبوون نییە. یان رەنگە بە هۆی ئەوەوە، کە وێراویەتی بە بێ رەزامەندیی ئەو بڕواتە سەیری یارییە گشتییەکان[٥٨]. ئەوە باسی ئەو حاڵەتە هەر مەکە، ئەگەر ژنێك شەرابی خواردبێتەوە، یان وێرابێتی بڕواتە ئەو ژێرزەمینەوە، کە شەرابی تێدا هەڵدەگیرا.

لەبەر ئەوەش هەندێك پێیان وایە، حەزرەتی مەسیح بە هەڵوێستی لە پەیوەندیی هاوسەرگیری و پێداگرتنی لە گرنگی و بایەخی، ژنانی لە داهاتوویان دڵنیا کردبێتەوە، چونکە چیتر پەیوەندییەکە هێندە فشۆڵ و هاکەزایی نییە، کە لە هەر کاتێك و لە هەر ساتێکدا بێت، بە هۆی پایەداری و دەسەڵاتی پیاوەوە، هەڵبوەشێتەوە. هەندێك لە توێژەران پێیان وایە، لەبەر خودی ئەو هەڵوێستە بوو، کە ژنان پۆل پۆل ـــ لە سەرەتای بانگەوازی مەسیحدا ـــ هاتنە ریزی دینە نوێیەکەوە و سەرنجیان بە لای بانگەوازەکەی مەسیحدا چوو. نەك هەر ئەوەندەش، بەڵکو لە پێناو پاراستنی دینە نوێیەکەدا، هاوشێوەی پیاوان هەموو سزا و ئەشکەنجەدانێك قبووڵ بکەن و وەکو ئەوانیش شەهید بن[٥٩].

ئەی ئەو تێڕوانینە نوێیەی فەیلەسوفی مەسیحی لە کوێوە هات؟ ئایا لای خۆیەوە دروست بوو، یان شوێنی داب و نەریت کەوت و کەلەپووری سەردەمەکەی خۆی تیۆریزە کرد؟! با پێش فەیلەسوفە مەسیحییەکان، باسی پیاوێك بکەین، کە بەردی بناغەی تیۆری مەسیحیی دانا، ئەو تیۆرەی دوای خۆی فەیلەسوفە مەسیحییەکان پێڕەویان کرد، مەبەستم قەشە پۆڵس ـــ ە.

# دووەم
# قەشە پۆڵس

دەتوانین بڵێین، ئەوەی بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست و بگرە لە کۆی کولتووری ڕۆژئاواییدا، بەردەوام نێرینە سەنتەرە و لە پێگە و بەهای مێینە کەم دەکرێتەوە، ریشەی قوڵی لە کولتووری یۆنانیدا هەیە، کە رقێکی زۆری لە ژن هەبوو و پاشان لە کولتووری رۆمانیدا درێژەی پێدرا، دواتریش لە هەردوو سەردەمی کەونارا و نوێدا بەرگێکی دینیی بە بەردا کرا.

قەشە پۆڵس یان ((پەیامبەری نەتەوەکان)) خەڵکی تەرسوس بوو لە ئاسیای بچووك، هاووڵاتییەکی یەهودی و خەڵکی شارێکی غەیرە دینی بوو لە (کیلیکیا Cilicia) (أعمال الرسل ٣٩:٢١). هەر بەو هۆیەشەوە بە باشی زمانی یۆنانیی زانیوە. بە پێی مافی شوێنی لەدایکبوون بووە بە هاووڵاتیی رۆمانی. بێگومان سەرەتا لە ماڵەوە فێرکراوە، پێش ئەوەی بڕواتە ئۆرشەلیم و لەسەر دەستی حاخام جەمالیل بخوێنێت. ئەوەش واتە کاتێك چووەتە ئۆرشەلیم، کەلەپووری یەهودی و یۆنانیی لەگەڵ خۆیدا بردووە[٦٠]. هەروەها حیبرێك بووە لە حیبرە یەهودییەکان، لە خوێندنگەکانیاندا خوێندویەتی، بنەما و نەریتەکانیانی وەرگرتووە، هەرچی سروت و رێوشوێنیان هەیە ئەزبەری کردووە، تەنانەت ماوەیەکی زۆر پێش ئەوەشی ببێتە خوێندکار لای جەمالیل، کە فەریسییەکی یەهودیی دانا بووە و بۆ پانزە ساڵ لە ئۆرشەلیم (قودس) وانەی پێوتووەتەوە. لەو ماوەیەشدا ئاشقی کچی مامۆستاکەی بوو، ویستی هاوسەرگیریی لەگەڵ بکات، بەڵام کچەکە رەتیکردەوە. هەندێك لە توێژەرەکان ئەو رەتکردنەوەیە بە سەرەداوێك بۆ رقی زۆری ئەو پیاوە لە ژن دەزانن[٦١]. پێدەچێت ئەو شکستەی لەو ماوەیەدا رووبەڕووی بووەتەوە لە ناخیدا چەسپیبێت، وای لێکردبێت هەمیشە لە باسی ژناندا باسی خەسڵەتە خراپەکانیان بکات. بە پێی زانیارییە مێژووییەکان زانراویشە،

کاتێك بە تەواوی هاوسەرگیریی رەتکردەوە، زۆر تورە بووە و تەنانەت دژی ((خەتەنەکردن)) وەك سروتێکی دینی لە سروتە یەهودییەکان نووسیویەتی[٦٢]. هاو کات دژی رۆژی شەممە ـــ کە رۆژی پشوودانە لای یەهودییەکان ـــ و دژی ناموس یان شەریعەتی یەهودیشی نووسیوە. ئەوەش وا دەگەیەنێت ئەو ئەزموونی خۆشەویستییەی لەگەڵ کچەکەی جەمالیلدا هەیبووە، زۆر ئازاری داوە. پێدەچێت گڕی ئەو خۆشەویستییەی هەر لە دڵدا مابێت و لە ناخیدا سووتا بێت، تا وای لێکرد بە تەواوی وازی لە یەهودییەت هێنا و هاتە ریزی مەسیحییەتەوە، کە تا ماوەیەکی زۆر دژایەتیی دەکرد، بەڵام کاتێك لەسەر رێی دیمەشق گۆڕانکاریی رۆحیی گەورەی بە سەردا هات، بوو بە بەرگریکاری یەکەمی مەسیحییەت!

هەندێك لە توێژەران پێیان وایە رقی ئەو پیاوە لە ژن، بۆ کەسێتیی ژنان و کاریگەرییان لەسەری لە زێدی سەرەکیی خۆی، کە تەرسوسە، دەگەڕێتەوە. نەریتی ئەو شارە وای بە سەر ژندا سەپاندبوو، کە بە تەواوی جەستەی داپۆشێت، بە جۆرێك پیاو نەتوانێت هیچ بەشێکی جەستەی ببینێت، نە لە روخساری و نە شوێنەکانی تریشی، بەو مەرجەی عەباکەی کونێکی تێدا بێت، کە جگە لە رێگەکەی هیچی تری لێوە دیار نەبێت. ئەم نەریتە کۆمەڵایەتییانەش تا سەردەمی قەشە یوحەننای دەم زێڕین (٣٤٥ ـــ ٤٠٧) بەردەوام بوون. ئەویش زۆر جار باسی ئەو نەریتە ((گرنگ))ەی دەکرد و بە ((پاشماوەی)) پاکیی و داوێنپاکییەکی دادەنا، کە هیچ شوێنەوارێکیان نەماوەتەوە، چونکە ـــ بە رای ئەو ـــ خراپە و پیسی بە خێرایی و لە رێگەی گوێ و چاوەوە خۆیان دەگەیەننە ژنان، بەو شێوەیەش بەرەڵایی و خراپەکاری زۆربەی ژنان دەگرنەوە، هەر بۆیە وتوویەتی: ((ژنان لە شەقامەکاندا بە روخساری داپۆشراو، بەڵام بە رۆحی کراوەوە رێدەکەن، بگرە لە راستیدا رۆحیان خستووەتە سەر گازەرەی پشت..))[٦٣]. ئەم کەلەپوورە کۆمەڵایەتییە ـــ یۆنانی یەهودییە ـــ بیروباوەڕی قەشە پۆڵسی سەبارەت بە ژن داڕشتووە، ئەو بیروباوەڕانەش کاریگەرییەکی قوڵیان لەسەر فۆرمەلەبوونی فیکری کڵێسای یەکەمی مەسیحییەت و دواتریش سەدەکانی ناوەڕاست سەبارەت بە ژنان

هەبووە[٦٤]. ڕاستییەکەی ئەم بیروباوەڕانە بوون بە بنچینەی سەرەکیی شێوەی ئەکلیرۆسی لە دژایەتی کردنی ژناندا، زۆر جاریش باوکە فەیلەسوفەکان و زانا و لاهوتییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست سوود و ئیلهامیان لێ وەرگرتووە.

دەتوانین بیروباوەڕە سەرەکییەکانی قەشە پۆڵس دەربارەی ژن، کە بەو رادە زۆرە کاریگەر بوون، لە سێ خاڵی سەرەکیدا کۆ بکەینەوە، بەم شێوەیە:

### ١- پیاو میانگیری نێوان خودا و ژنە:

ئەمە یەکەم بیروباوەڕی سەرەکیی پۆڵسە دەربارەی ژن، پۆڵس زۆر دەقی، کە پشتگیریی لەم بڕوایە دەکەن هێناوە و باسکردووە. دیارترینیان ئەو دەقەی ناو نامەکەیەتی بۆ ((خەڵکی کۆرینتیۆس)). تیایدا داوا لە ژنان دەکات لە گردبوونەوە مەسیحییەکاندا سەریان داپۆشن، چونکە ئەو داپۆشینە رەمزی ملکەچبوونیانە بۆ پیاوان ((پیاو پێویست ناکات سەری داپۆشێت، چونکە فۆرم و شکۆی خودایە، بەڵام ژن شکۆی پیاوە، بۆیە پێویستە دەسەڵاتێك بە سەر سەرییەوە هەبێت))[٦٥].

بەو شێوەیەش پۆڵس، بەردەوام پاساوی لاهوتیی بۆ نەریتە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمەکەی دەهێنێتەوە، کە فەیلەسوفان و لاهوتییەکانی دواتریش هەمان کار دەکەن، بە ئامانجی ئەوەی خەسڵەتی ((پیرۆزیی)) دینی بەو نەریتە کۆمەڵایەتییانە ببەخشن. نموونەی ئەوەش وتەکەیەتی سەبارەت بە سەرپۆش، پیاو بۆی هەیە بە سەری رووتەوە بسوڕێتەوە بەڵام ژن بۆی نییە. پاشان دەیبەستێتەوە بە دینەوە کاتێك بە نکوڵییەوە دەپرسێت ((ئایا بۆ ژن جوانە بە بێ خۆداپۆشین نوێژ بۆ خودا بکات...؟))(کۆرینتیۆس یەکەم ١١:١٣)[٦٦].

لە لایەکی ترەوە پێویستە پیاو ــ وەك پۆڵس دەڵێت ــ ژن فێر بکات، نەك بە پێچەوانەوە.ماڵیش ــ کە ئەمە هەمان بۆچوونی ئیمام غەزالیشە ــ باشترین شوێنە بۆ ئەوەی ژن لە مێردەکەیەوە فێری بنەماکانی دین بێت. پۆڵس دەڵێت ((با ژنەکانتان لە کڵێسادا بێدەنگ بن. ڕێگەیان پێنەدراوە قسە بکەن، بەڵکو پێویستە وەك

شەریعەتیش دەڵێت، ملکەچ بن. بەڵام ئەگەر دەیانەوێت فێری شتێك بن، با لەماڵەوە پرسیار لە مێردەکانیان بکەن..))[٦٧]. بێگومان پۆڵس لێرەدا ئەو باوەڕە یەهودییە دووپات دەکاتەوە، کە دەڵێت (دەنگی ژن عەورەتە)، لە کاتێکدا مەسیح هەرگیز شتی وای نەوتووە! سەرباری ئەوەش، لە لایەکی ترەوە پۆڵس ئەو قسەیەی یۆنانییەکان دووبارە دەکاتەوە، کە دەیانوت تاجی ژن بێدەنگییە و فەزیلەتیشی ملکەچبوونییەتی بۆ پیاو. کەچی دێت و پاساوی دینی بۆ ئەو دیاردەیە دێنێتەوە: جارێك دەڵێت خودا لە پێشدا ئادەمی خەڵقکردووە، ئەوەش ئیمتیازێکە پیاو دەخاتە سەرووی ژنەوە[٦٨]. جارێکیش دەڵێت مارەکە حەوای هەڵخەڵەتاند نەك ئادەم[٦٩]. دەڵێت: ((دەبێت ژن بە بێدەنگی و بە ملکەچیی تەواوەوە فێر ببێت، ڕێگەی ئەوە بە ژن نادەم ئەوانی تر فێر بکات و دەسەڵاتی بە سەر پیاوەوە هەبێت، بەڵکو دەبێت لە بێدەنگیدا بێت، چونکە ئادەم لە پێش حەواوە خەڵقکراوە. ئادەم هەڵنەخەڵەتا، بەڵکو ژن هەڵخەڵەتا و گوناهی کرد))[٧٠].

## ٢ ـ ژن بوونەوەرێکی پلە دووە کە لەپێناو پیاودا خەڵقکراوە:

قەشە پۆڵس پێی وایە پێگەی لاوەکیی ـــ یان پلە نزمیی ـــ ژن بە تەواوی لەگەڵ سیستەمی گشتیی گەردوندا دەگونجێت، لەوەشدا لە ئەرەستۆ دەچێت، کە دەیوت هیرارکییەتێك (یان ڕیزبەندییەکی سەرەوژوورانە) لە ناو شتو هەبووەکانی گەردوندا هەیە. لەوێشەوە مامۆستای یەکەم پلە نزمیی ژنانی لەسەر بنچینەیەکی میتافیزیکی داناوە، قەشە پۆڵسیش هەمان کار دەکات. دەڵێت: ((ژن شکۆی پیاوە، چونکە پیاو لە ژن نییە، بەڵکو ژن لە پیاوە..))[٧١].

ڕاستییەکەی، بۆچوونەکانی پۆڵس زادەی دۆخی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی ژن بوون لەو سەردەمەی خۆیدا. ڕەنگە ئەوەش شتێکی تازە نەبێت، بەڵام ئەوەی تازەیە و هاوکات مەترسیداریشە، مۆرکێکی دینی بەو بۆچوونانە دەدات. جگە لەوەی لە هەڵوێستە مرۆییە نوێیەکانی حەزرەتی مەسیح دوور کەوتۆتەوە، کە ئەو هەڵوێستانە

دەكرا برەویان پێبدرێت و كاریگەر بن و بە دواشیدا شتێك لە دۆخی نالەباری ژن ـــ هەر چەندە كەمیش بێت ـــ بگۆڕن. بەڵام بە داخەوە داب و نەریتەكانی سەردەم (بێگومان جگە لە بەرژەوەندییەكانی پیاو) كاریگەر و كاراتر بوون. تەنانەت پۆڵس ئەو دۆخە نامرۆییەی ژنی بە ((شتێكی سروشتی)) و دیاردەیەكی واقیعی زانیوە[٧٢]، هەر وەك زینۆفۆنی مێژوونوسی یۆنانی لە كۆندا وتوویەتی: خودا ویستی لەسەر بووە و مرۆڤیش جێبەجێی كردووە[٧٣]. بۆیە دەبینین پێ لەسەر پێویستیی خۆداپۆشین دادەگرێت: ئەوەتا فەرمان بە ژن دەدات، كە لە كاتی نوێژكردن و هاتنیان بۆ كڵێساكان خۆیان داپۆشن، چونكە پرچیان گەورەترین ورووژێنەرە، ئەویش دەترسا لەوەی خەڵكی و خودی فریشتەكانیش لە كاتی نوێژدا پێی كاریگەربن[٧٤].

شان بە شانی ئەوەش پۆڵس، گرنگییەكی زۆری بە پرسی ((سیستەم)) لە كۆمەڵگای مەسیحیدا دەدا. ئەوەی لای ئەو گرنگییەكی زۆری هەبوو، نەدەبوو ژنان لە كۆمەڵگا مەسیحییەكاندا پێگەی دەسەڵاتیان هەبێت، بە سەری رووتەوە قسە بۆ جەماوەر بكەن و بە بێ پەچە بە شەقامەكاندا بڕۆن، چونكە ئەگەر وابێت ـــ بە رای ئەو ـــ دەبێتە فەزیحەیەك بۆ دینە تازەكە، كە بۆ خۆی تۆمەتی نائەخلاقیی بە روودا دەدرا. بۆیە دەبینین بە بەردەوامی پێ لەسەر رەفتاری سێكسییانەی راست و شیاو دادەگرێت، لە خەسڵەتە سەرەكییەكانی ئەو جۆرە رەفتارەیش، بەردەوامیی ملكەچكردنی ژنانە بۆ مێردەكانیان[٧٥]: ((ئەی ژنان ملكەچی پیاوەكانتان بن، وەك چۆن ملكەچی خودا دەبن))[٧٦]. هەمان راسپاردەیش بۆ خەڵكی ئۆفسوس دووبارە دەكاتەوە: ((ئەی ژنان ملكەچی پیاوەكانتان بن، وەك چۆن ملكەچی خودا دەبن، چونكە پیاو سەری ژنە، وەك چۆن مەسیح سەری كڵێسایە))[٧٧].

بەدەر لەوانەش، پۆڵس، لەو چیرۆكە رەمزییەی ناو سفری تەكوین لەبارەی خەڵقكردنی حەوا لە پەراسووی ئادەمەوە، دەگاتە ئەوەی، گوایە ژن بوونەوەرێكی پلە دووە و لە پێناو پیاودا خەڵقكراوە. ئەو بیرۆكەیەش دواتر لە لایەن باوكە فەیلەسوفەكان و لاهوتی و راڤەكارانی كتێبی پیرۆزەوە، راڤە دەكرێت و وردەكاریی زیاتری دەدرێتێ،

لە هەمان کاتیشدا ئەو هەوڵانەی خودی پۆڵس بۆ کەمکردنەوەی توندیی و ڕەقیی بۆچوونەکانی داویەتی، پشتگوێ دەخەن. لەو هەوڵانەش ئەو تێڕامانە مەسیحییانەیەتی، کە بۆ دروست کردنی جۆرێك لە هاوسەنگی داویەتی، بۆ نموونە دەڵێت: جگە لەوەش لای خودا پیاو لە ژن و ژنیش لە پیاو لەبەرتر نین، چونکە وەك چۆن ژن لە پیاوە، ئاوەهاش پیاو لە ژن دەبێت، بەڵام هەموو شتەکانیش لە خواوە دەبن[٧٨].

### ٣- ژن بنەڕەتی گوناهە:

ئەو بیرۆکەیەی، کە پێی وایە ژن بنەڕەتی گوناهە، کاریگەرییەکی زۆری لە فۆرمەلەبوونی تیۆری مەسیحی دەربارەی ژن لە سەدە سەرەتاییەکانی مەسیحییەت ــ کە بە سەردەمی باوکان ناسراوە ــ و دواتر لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا، هەبوو. ئەم بیرۆکەیە لە وتەکانی قەشە پۆڵسەوە دروست بووە، کە دووپاتکردنەوەی ئەو بیرۆکە یەهودییە بوون، گوایە ژن بنەڕەتی گوناه و هەڵخەڵەتاندنە، ئەو بوو ئادەمی توشی لادان کرد و بە هۆی گوێڕایەڵیی بۆ مارەکە و خواردنی لە دارە حەرام کراوەکەوە، لە بەهەشت وەدەرنران. جا ئەو گوناهە تەنیا بە حەواوە پەیوەست نەبوو، بەڵکو بۆ هەموو کچەکانیشی درێژبووەوە و لەگەڵ ئەوانیشدا بەردەوام بوو، لەوێشەوە ژن هەمیشە وەك سەرچاوەی هەڵخەڵەتاندنی پیاو سەیر دەکرا. ژن بەو جلانەی لەبەریان دەکات، بە زێڕ و ئەو شتانەی تر، کە خۆی پێیان دەڕازێنێتەوە و بەو بۆیەیەی لە روخساری دەدات و...هتد، هەوڵ دەدات پیاو بخاتە ناو تۆڕی خۆیەوە! بۆیە دەبینین ئامۆژگاریی ژنان دەکات، بەوەی خۆیان نەڕازێننەوە، بە تایبەتی بە زێڕ و جلی گرانبەها. دەڵێت: ((ژنان دەبێت بە جلی ئەدەب و حەیا و سڵەمینەوە لە گوناه و ئاقڵبوون خۆیان بڕازێننەوە، نەك بە زێڕ و شتی گرانبەها، دەبێت کارێك بکەن لەگەڵ ژنانێك، کە بەڵێنی خواپەرستییان داوە و هاوکات لەگەڵ کارە باشەکانیشدا، وێك بێتەوە))[٧٩].

لە سەروەختی هەڵخەڵەتاندنەکەی حەواوە، ژنان بوونەتە سەرچاوەی هەموو گوناهێك. بۆیە رزگاریی ژنان بەوە دەبێت، کە بە سەر سروشتی مێیانەیاندا زاڵبن و

چێژی جەستە ڕەتبکەنەوە، لەبریی ئەوەی ملکەچی تەنیا پیاوێك بن، مەسیح وەك مێردی خۆیان قبوڵ بکەن!

بۆ سەرگرتنی ئەو کارە، وەك بەشێکیش لە پلانی گشتیی پاکێتی و دوورکەوتنەوە لە داوی جەستە، پۆڵس داوا لە پیاوان دەکات تا دەتوانن لە ژنان دووربکەونەوە ((بۆ پیاو باشتر وایە توخنی ژن نەکەوێت))(کۆرینتیۆسی یەکەم ١:٧). هاوکات داوا لە تیمۆساوس ــ ی ئیمانداری دڵسۆز دەکات، لە شەهوەت و غەریزەکان دوور بکەوێتەوە و دەڵێت: ((هەرچی شەهوەتی گەنجانە هەیە لێی دوور بکەوەرەوە، شوێنی چاکە و ئیمان و خۆشەویستی و ئاشتی لەگەڵ ئەوانەدا بکەوە، کە بە دڵێکی پاك لە خودا دەپاڕێنەوە)) [٨٠].

بێگومان لە وتەکانی پۆڵسدا دەبینین، بە ئاشکرا داوای ڕەبەنی و دوورکەوتنەمان لە سێکس لێدەکات، ئەوەش باشترە، چونکە: ((ئەوەی هاوسەری نییە گرنگی بەو شتانە دەدات، کە پەیوەندییان بە خوداوە هەیە، ئامانجیشی ڕازی کردنی خودا دەبێت، بەڵام ئەوەی هاوسەرداره گرنگی بە شتە دنیاییەکان دەدات، ئامانجیشی ڕازی کردنی ژنەکەیەتی...))(کۆرینتیۆسی یەکەم ٣٣:٧). لێرەوە، هەندێ جار دەبینین ڕاشکاوانە ئەو بیرۆکەیە دەردەبڕێت و دەڵێت: ((لە نێوان ژن و کچدا جیاوازی هەیە، ئەوەی کچە گرنگی بە کار و ئەرکی خودایی دەدات، تا وەك جەستە و وەك ڕۆحیش پیرۆز بێت، بەڵام ژن گرنگی بە شتی دنیایی دەدات و ئامانجی ڕازی کردنی مێردەکەیەتی))(کۆرینتیۆسی یەکەم ٣٤:٧).

لەگەڵ ئەوەشدا قەشە پۆڵس داوا لە مەسیحییەکان ناکات مان لە هاوسەرگیری بگرن، هاوسەرگیری لە خۆیدا خوازراوە، بەڵام ڕەبەنی بۆ کەسێك، کە بتوانێت، باشترە. ئەوەی هاوسەرگیریی دەکات باش دەکات، بەڵام ئەوەی نایکات باشتر دەکات (کۆرینتیۆسی یەکەم ٣٨:٧). ((بەوانەی هاوسەرگیرییان نەکردووە و بەوانەشی بێوەژنن دەڵێم: باش دەکەن ئەگەر وەك من بمێننەوە، بەڵام ئەگەر خۆیان پێ نەگیرا با هاوسەرگیریی بکەن، چونکە هاوسەرگرتن لە سووتان باشترە)) (کۆرینتیۆسی یەکەم

٧:٨-٩). بە کورتی: ئەگەر هاوسەرگیری بکەیت هەڵەت نەکردووە، ئەگەر کچێك مارە بکەیت هەڵەت نەکردووە، هێندە هەیە ئەو کەسانە جەستە تەنگی پێ هەڵچنیون. لە ترسی زینا، با هەموو ژنێك پیاوی خۆی و هەموو پیاوێکیش ژنی خۆی هەبێت(٧:٢). پاشان دەڵێت: ((ژن دەسەڵاتی بە سەر جەستەی خۆیدا نییە، بەڵکو پیاو هەیەتی))(٧:١-٤). بەو شێوەیەش ژنی والێکردووە، کە دەسەڵاتی بە سەر جەستەی خۆیدا نەبێت، بەڵکو دەسەڵاتی بە سەر ئەو جەستەیەدا بە رەهایی داوەتە پیاو.

ئەوە دیارترین ئەو بیرۆکانە بوو، کە قەشە پۆڵس هێناونی. ئاشکرایە زۆرتر لەگەڵ کەلەپووری (یەهودی ــ رۆمانی)دا دەگونجێت، وەك لە هەڵوێستە جوانە مرۆییەکانی حەزرەتی مەسیح، کە ژن لە بەردەمیدا و بە بەرچاوی هەمووانەوە ــ زۆر ئاسایی ــ قسەی کردووە، بێ ئەوەی مەسیح وتبێتی: ((با ژنەکانتان بێدەنگ بن))، یان دەنگی بە عەورەت زانیبن. هەرگیز بە چاوی لە پیاو کەمتر سەیری ژنی نەکردووە، هەروەها تێکەڵبوونی هەردوو رەگەزەکەی رەتنەدەکردەوە، بۆ خۆیشی چووە ئاهەنگی گواستنەوەکەی (قانا جەلیل)، کە تێکەڵ بوو و ژن و پیاوێکی زۆریش ئامادەی بوون، لەوانەش مەریەمی دایکی[٨١].

لە شارەکاندا، خەڵکی بە ژن و بە پیاوەوە دوای دەکەوتن ((کاتێك یەسوع هاتە دەرەوە، خەڵکێکی زۆری بینی، دڵی بۆیان سووتا و چارەسەری نەخۆشەکانی کردن))، بێ ئەوەی جیاوازیی لە نێوان نێر و مێدا بکات، چارەسەری ژن و پیاو وەك یەك دەکات! تەنانەت زۆر جار دەستی بۆ شاگردەکانی درێژ دەکرد و دەیوت: ((ئەی دایك و برایانم، چونکە ئەو کەسەی ویستی باوکم، کە لە ئاسمانە، جێبەجێ بکات، برا و خوشك و دایکی منە))( یوحەننا ١٢:٤٩).

بە کورتی، حەزرەتی مەسیح بە ناسکی مامەڵەی ژنانی دەکرد، بە خۆشەویستییەوە لەگەڵیان دەدوا، هەرگیز بە چاوی رق و بوغزاندن، کە نەریتی باوی ئەو سەردەمە بوون، سەیری ژنی نەکردووە: ((تەنانەت شاگردەکانیشی پێیان سەیر بوو، کە لەگەڵ ژنێکدا قسەی دەکرد))(یوحەننا ٤:٢٧)، چونکە ئەوەش شتێکی تازە بوو، پێشتر نەیاندیبوو.

ژنان پەیامی مەسیحیان دەگەیاند، بە هۆی ئەوەشەوە، کە ژنان گەواهییان بۆ دەدا، خەڵکێکی زۆر بڕوایان پێهێنا (یوحەننا ٣٩:٤). پاشان ژنان، بەرژەوەندیی خۆیانیان لە دینە تازەکەدا دەبینی، بەوەی هاتووە تا لەو گێژاوەی تێیدان، دەریانبهێنێت و ژیانێکی بە کەرامەتیان بۆ دابین بکات، بۆیە خێرا ئیمانیان بە مەسیحییەت هێنا و هاتنە ریزییەوە، بەو هیوایەی لە کۆتی بتپەرستی و زیندانی یەهودییەت رزگاریان بێت، بەڵام ئەنجامەکەی چی بوو؟ زاڵبوونی نەریتە کۆنەکان و باڵادەستییەکی تەواوی کەلەپووری یەهودی رۆمانی، کە باوکان و فەیلەسوفانی کڵێسا پێڕەویان دەکرد، تا هەمان شت بوو بە کەلەپووری مەسیحییەتیش. ئەو هەڵگەڕانەوە سەیرەش لەسەر دەستی قەشە پۆڵس روویدا، کە دانەری بەردی بناغەی تیۆری مەسیحییەت بوو دەربارەی ژن، کە بە هەموو رق و بە کەم سەیرکردنێکی خۆیەوە بۆ ژنان، بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست بە باڵادەستیی مایەوە. بەڵام چۆن ئەو هەڵوێستەی ((پەیامبەری نەتەوەکان)) لێك بدەینەوە؟

چارلز سێلتمان پێی وایە دوو هۆکاری هەیە:

**یەکەم:** پۆڵس خەڵکی تەرسوس بوو، لە خێزانێکی یەهودیی موحافیزکار، کە شانازیی بە کەلەپووری یەهودییەوە دەکرد و سروتە دینەکانیان جێبەجێ دەکرد، پەروەردە بووە. لێرەوە، سووربوونی لەسەر بێدەنگیی ژنان و داپۆشینی جەستەیان لە کڵێسادا، بەشێکی دانەبڕاوە لەو پاشخانە کولتوورییەی گۆشکراوە لەسەری و جێدەستێکە لە جێدەستەکانی کەلەپووری یەهودی رۆمانی، تەنانەت یۆنانیش.

**دووەم:** نامەکانی پۆڵس، کە زۆر باسی ژنی تێدا کردووە و کۆمەڵێك هەڵوێستی توندی لەو بارەیەوە نواندووە، نزیکەی هەموویان ئاڕاستەی خەڵکی کۆرینتیۆس کراون. کۆرینس شارێکی یۆنانی بوو، دەکەوتە سەر کەنداوی کۆرینسە، ((دوورییەکان)) لە سەدەی نۆیەمدا دروست یان کردووە، زۆری پێنەچوو بووە بەندەرێکی گرنگ و بارەگای خواوەندی خۆشەویستی و جوانی و سێکس ((ئەفرۆدیت))، کە لە کەفی دەریاوە لەدایکبوو و بە سەر کەنارەکانی ئەو شارەدا گەڕاوە، هەر لەوێشدا پەرستگایەکیان بۆ

دروست کردووه. پێدەچێت ئەو بەندەرەی، کە گەشتیاران و دەریاوانان سەردانی دەکەن، پڕ بووبێت لە سۆزانی و لەشفرۆش، کە ئەوانیش بەشێك بوون لە ئاینزای خواوەند ئەفرۆدیت. ئەم جۆرە لە رەفتاری دینی، هەستی دینیی پۆڵس و وێناکردنی سەبارەت بە ژنی چاکەکار، بریندار کرد. بۆیە هەمیشە لە نامەکانیدا بۆ خەڵکی کۆرینتیۆس، جەختی لەو دیدە یەهودییە دەربارەی ژنی چاکەکار دەکردەوە[٨٢].

**دەکرێت دوو تێبینی لەسەر ئەم لێکدانەوەیە بنووسین:**

**تێبینیی یەکەم:** ئەم لێکدانەوەیە جەخت لەو خاڵە دەکاتەوە، کە زیاد لە جارێك باسمانکرد، لەبارەی زاڵبوونی کەلەپووری یەهودی رۆمانی و باڵادەستیی بە سەر فیکری قەشە پۆڵسدا. بەڵام بۆمان رووناکاتەوە ــ کە ئەمەش گرنگە ــ بۆچی فیکری پۆڵس لە هەڵوێستە جوانە مرۆییەکانی حەزرەتی مەسیح دوورکەوتووەتەوە، لە کاتێکدا ئەو ((پەیامبەری مەسیح بووە بۆ لای نەتەوەکان)) نەك پەیامبەری یەهودییەت؟ چۆن بە تەواوی خۆی لە فیکرە نوێیەکان نەبان کردووە و بە ئەنقەست کپی کردوونەتەوە، تەنانەت وتراوە مەسیحیەتێکی تایبەت بە خۆی هەیە ئەویش ((مەسیحییەتی پۆڵس))ە، کە لە زۆر جێگەدا لە ((مەسیحییەتی مەسیح)) جیاوازە؟

**تێبینیی دووەم:** هەندێك لە توێژەران رۆڵێکی گرنگ بە خۆشەویستیی یەکەمی پۆڵس دەدەن، وەك هۆکارێك بۆ رقبوونەوەی لە ژنان، کە تیایدا ئاشقی کچی حاخام جەمالیلی مامۆستای بوو. بە تایبەتی، کە ئەو خۆشەویستییە لە قۆناغێکی سەرەتایی تەمەنیدا روویداوە، رەتکردنەوەی کچەکەش بۆ پۆڵس شۆکێکی توند و گەورە بووە، وای لێکردووە بە تەواوی لە هاوسەرگیری هەڵبێت و رقی لێ بێتەوە و ئارەزووی رەبەنی و سەڵتیی بکات و بانگەوازی مەسیحییەکانیشی بۆ بکات. لەمەشدا نموونەیەکی تری ئەو بنەما دەروونییە دەبینین، کە پێشتریش باسمانکردووە و دەڵێت: رقی زۆر لە بنەڕەتدا لە خۆشەویستییەکی زۆر، کە تێرنەکرابێ، یان ئارەزوویەکی سەخت، کە بە دینەهاتبێ، دەکەوێتەوە)).

# پاژی سێیەم

# سەردەمی باوکە فەیلەسوفەکان

((هیچ شتێك بۆ پیاو، کە خودا ئەقڵی پێبەخشیوە، مایەی شەرم و سەرشۆڕیی نییە. بەڵام بۆ ژن مەسەلەکە جیاوازە، کە تەنانەت کاتێکیش بیر لە سروشت و تواناکانی خۆی دەکاتەوە هەر مایەی شەرم و ئابڕووچوونە)).
کلیمێنت ئەسکەندەری

((تۆ دەروازەی شەیتانی، لە دارە حەرام کراوەکەت خوارد و پیاوت هەڵخەڵەتاند، کە شەیتان نەیتوانی راستەوخۆ هەڵیخەڵەتێنێت...تۆ ئەی ژن، زۆر بە ئاسانی فۆرمی خودات، کە پیاوە، تێکشکاند))
تەرتولیان

((جەستەی ژن شتێکی سەرنجڕاکێش نییە، بەڵکو شتێکی قێزەونە، خستنەوەی منداڵیش مایەی دڵخۆشی و سەرسامی نییە، بەڵکو ئاماژەیەکە بۆ داڕووخان و داتەپین))
قەشە جیرۆم

((جوانیی ژن گەورەترین شیرکە! وەك چۆن لە ئاگر دووردەکەویتەوە، لە کچی گەنجیش دووربکەوەرەوە))
قەشە یوحەننای دەم زێڕین

# سەرەتا

هەر چەندە مەسیحییەت لە سەرەتایدا، وەك ڕێبازێكی تیۆری یان فەلسەفەیەكی ئەبستراكت دەرنەكەوت، بەڵكو وەك دینێكی ئاسمانی، كە مەسیح وەك دینی فیداكاری و رزگاری و خۆشەویستی خستییە ڕوو، پەیامێك بوو تا لە ڕێگەیەوە ئامۆژگاری خەڵكی بكەن دەربارەی رزگاربوونیان، نەك كورسی مامۆستایی فەلسەفە لە زانكۆكاندا وەربگرن، لەگەڵ ئەوەشدا دەبوو دینە نوێیەكە كۆمەڵێك فیكری تیۆری بۆ خۆی پێكەوە بنێت تا وەڵامی هەموو فەلسەفە و ڕێباز و قوتابخانە دێرینەكان، بە تایبەتیش قوتابخانە یۆنانییەكان، بداتەوە.

راستە پەیامبەر و حەوارییەكان دەیانویست هیدایەتی خەڵكی بدەن و بیانهێننە سەر دینی مەسیحی و ((ڕێگە)) بۆ خەڵكی خۆش بكەن تا بگەنە خودا و ئەو ڕێگەیەش بە كردەنی، نەك تەنیا بە تیۆری ببڕن، سەرەڕای ئەوەش دەبوو شەڕی لاهوتی و فەلسەفی لەگەڵ یەهودییەكان و غەیری ئەوانیشدا بكەن، تەنانەت هەندێ جار دەبوو بەرەنگاری فەیلەسوفە یۆنانییەكان ببنەوە(هەڵبەتە بە مانای ئەكادیمیی وشەكە). قەشە پۆڵس بە وتەیەك باسی یەكەم بەرەنگاربوونەوەی لەگەڵ یەهودی و یۆنانییەكاندا كردووە، كاتێك دەڵێت: ((یەهودییەكان داوای بەڵگە و یۆنانییەكانیش داوای حیمكەت دەكەن، بەڵام ئێمە مەسیحی لە خاچدراو دەكەینە بیانووی خۆمان، وەك ڕێگرتنێك لە یەهودییەكان و وەڵامدانەوەی یۆنانییەكانیش))[٨٣]. ئیتر لەوێوە بەرەنگاربوونەوە دەستیپێكرد.

مەسیحییەت لە ناو كەشێكی پڕ لە گومان و دوودڵی و هەندێ جاریش دوژمنایەتیدا ریشەی خۆی دادەكوتا و جێ پێی خۆی خۆش دەكرد، نەك تەنیا لە لایەن یەهودییەكانەوە، بەڵكو لە لایەن دەسەڵاتە سیاسییەكانی رۆما و بیرمەند و رۆشنبیرە بتپەرستەكانیشەوە. هۆكاری هێرشەكانیش، كە دەكرانە سەر ئەو دینە نوێیە

زۆر بوون، هەندێکیان لە ئەنجامی گومانەوە، هەندێکیشیان بە هۆی ترس لە نادیارەوە، هەندێکیشیان لە گومانی خراپەوە لە دینە نوێیەکە دروست بوون. مەسیحییەتیش بۆ ئەوەی بمێنێتەوە، دەبوو رووبەڕووی ئەو هێرشانە بوەستێتەوە، هەروەها دەبوو لە یەك کاتدا بەڵگەی لاهوتی و فەلسەفیش بەکاربهێنێت. لێرەوە رەگەزە فەلسەفییەکانی ناو نووسینەکانی باوکانی سەرەتای مەسیحییەت و ناولێنانیان بە فەیلەسوف، سەریهەڵدا[٨٤].

بەو شێوەیەش نەوەیەك لە بیرمەندان دەرکەوتن و ئەوەیان پێکهێنا، کە دواتر ناونرا بە سەردەمی باوکە فەیلەسوفەکان. ئەو سەردەمەش هەر لە سەدەی یەکەمەوە درێژ دەبێتەوە تا لە سەدەی چوارەم و لەسەر دەستی قەشە ئۆگەستین (٣٥٤ ــ ٤٣٠) گەیشتە چڵەپۆپە، کە بەویش سەردەمی باوکان کۆتایی دێت و ئەوروپا پێدەنێتە سەدەکانی ناوەڕاستەوە، کە لە سەدەی چوارەمەوە تا سەدەی چواردەیەم دەخایەنێت[٨٥].

بە کورتی، دروست بوونی بۆچوونە فەلسەفییە مەسیحییەکان، لە بنەڕەتدا بە هۆی چەند رەگەزێکی دەرەوەی مەسیحییەتەوە بوون، بە دیاریکراویش هێرشە دوژمنکارییەکان. شان بە شانی ئەوەش رەگەزێکی مەسیحیی سەربەخۆ و دوور لە هێرشە دەرەکییەکان هەیە، ئەویش هەستکردنی بیرمەند و رۆشنبیرە مەسیحییەکانە بە ئارەزوویەکی توند لەوەی بگەنە هەموو کونجێکی پێدراوەکانی وەحی و پێکەوەنانی تێڕوانینێکی سەرتاپاگیر دەربارەی جیهان و ژیانی مرۆڤ، هەڵبەتە لە سایەی ئیمانە نوێیەکەدا[٨٦]، لەوانەش رەفتاری رۆژانەی مرۆڤ و پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەوانی تردا، لەگەڵ پەیوەندیی پیاو بە ژنەوە، لێرەوە و هەر لە سەردەمی باوکانەوە تێڕوانینی فەلسەفیی مەسیحی لەبارەی ژنەوە پێکدێت: جا با بزانین چییان لەسەر ژن وتووە؟ ئەو فیکرانەی برەویان پێدەدان و بە دواشیدا کڵێسای مەسیحی بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست وەریگرتبوون و بوونە بەشێکی دانەبڕاو لە کەلەپووری مەسیحی لەو کاتەدا، چی بوون؟

## یەکەم: کلیمێنتی ئەسکەندەری (١٥٠ ـ ٢٢٣)
## Clement of Alexandria

یەکێکە لە باوکانی کلێسا و یەکەمین فەیلەسوفە مەسیحییەکانی کۆتایی سەدەی دووەم و سەرەتای سەدەی سێیەم، لەگەڵ ئۆریجینی خوێندکاریدا بە دیارترین فەیلەسوفانی ئەسکەندەریە دادەنرێن. ئەو شتە کەمەشی لەسەر ژیانی دەیزانین، یان لە کتێبەکانی خۆیەوە، یان لە کتێبی مێژوونوسانەوە لە نموونەی یوزیبیدیۆس و فۆتیۆس، دەستمان کەوتووە.

**١- ژیانی:**

لە دەوروبەریساڵی ١٥٠ز لەدایکبووە. رەنگە باشتر وابێت بڵێین لە ئەسینا لەدایکبووە نەك لە ئەسکەندەریە، هەر چەندە کەسانێك هەن دەڵێن، کە لە ئەسکەندەریە لەدایکبووە. باوکی، بێباوەڕێکی رۆشنبیر بووە. پێدەچێت باری داراییان باش بووبێت، ئەوەش رێگەی گەشتکردن و گواستنەوەی لە نێوان چەندین شاردا بۆ رەخساندبێت، تا ئەوەی لە شاری ئەسکەندەریە گیرساوەتەوە[٨٧].

سەرەتا لە ئەسینا خوێندویەتی، کە زۆر شەیدای فەلسەفەی یۆنانی و ئەدەبی کلاسیکی بووە. پێدەچێت بە کاریگەریی مامۆستاکانی بووبێتە مەسیحی. پاش ئەوەی بووەتە مەسیحی، گەشتی بۆ ئەسکەندەریە کردووە و لەسەر دەستی پانتینۆس، سەرۆکی خوێندنگەی پرسیار و وەڵام Catechetical فێرکراوە. لە دەوروبەری ساڵی ٢٠٠ لە جێگەی ئەو مامۆستایەی بووەتە سەرۆکی خوێندنگەکە، هەندێك لە توێژەرانیش پێیان وایە ئۆریجینی فەیلەسوف یەکێك بووبێت لە خوێندکارانی. لەو ماوەیەشدا بووەتە قەشە و زۆربەی نووسینەکانیشی لە کاتی مانەوەی لە ئەسکەندەریە نووسیوە، دواتر لە سەروەختی ستەم و چەوساندنەوەی ئیمپراتۆر سپتیمۆس سڤیرۆس لە دەوروبەری ساڵەکانی ٢٠٢ ـــ ٢٠٣[٨٨] لەو شارە هەڵهاتووە.

چیتر لەبارەی ساڵانی دواتری تەمەنی نازانین، پێدەچێت لە شارەکانی ئۆرشەلیم و ئەنتاکیە واعیز بووبێت، ساڵی **٢٢٣** کۆچی دوایی کردووە.

لە ئەسکەندەریە کتێبێکی لەسەر ((پەروەردە)) نووسیوە. تیایدا کلیمێنت لە زۆربەی کاروبارە گشتی و تایبەتییەکاندا ڕێ نیشانی پیاوی مەسیحی دەدات، بۆی روون دەکاتەوە، کە چۆن هیچ وردەکارییەکی بیرنەچێت، ڕەنگە هەندێك لەو شتانە زۆر سادە، یان تەنانەت بێبەها بووبن ــ لای کەم لە دیدی بیرمەندێکی جدییەوە ــ بۆ نموونە، هیچ سەغڵەت نابێت کاتێك باسی ئەوە بۆ پیاوی مەسیحی دەکات، کە لەسەر سفرەی نانخواردن چی بکات، دێت و ڕەوشتی سەر خوانی بۆ باس دەکات، پاشان باسی جۆری ئەو خواردن و خواردنانەوەی بۆ دەکات، کە پێویستە بیانخوات و هەروەها باسی ژمارەی کاتژمێرەکانی خەوتنیشی بۆ دەکات، لەگەڵ جۆری ئەو پۆشاکەی پێویستە لەبەری بکات! لە دواییشدا پێویستە چۆن لە ناو کڵێسادا ڕەفتار بکات.

## دووەم: کلیمێنت و ژن:

بێگومان کلیمێنت باسی ژن و ئەرکەکانیشی کردووە، بەڵام دەستەواژەی بە ئەدەب و ناسکانە بەکارناهێنێت (تەنانەت کاتێك، وەك خۆی دەڵێت باسی شتی ناشرینیش دەکات). ئەو دەیەوێت ڕاشکاو و ڕاستگۆ بێت، چونکە توندیی یان هەر توندیی دەبێت، یان دەبێتە درۆ و دوو ڕوویی و ڕیاکاریی. ئەو پێی وایە خودا، پیاو و ژنی خەڵقکردووە، وەك چۆن هەموو ئەندامەکانیانی خەڵقکردووە: ((هەروەها پێویستە هیچ کەسێك شەرم نەکات لە ناوبردنی ئەو شتانەی، کە خودا شەرمی لە خەڵقکردنیان نەکردووە!)) کەواتە لێرەدا، شاردنەوە و باسنەکردن دەبێتە نیشانەی ڕێزنەگرتنی خالق.

سەرەڕای ئەوەش، بە بۆچوونی ئەو گرنگە، کە وردەکارییەکانی ژیانی مەسیحی بە پێی ڕێنماییەکانی ئەقڵی ئیلاهی بن. لێرەشەوە دەبێتە کەمتەرخەمی و گوێ پێنەدان ئەگەر هەموو کار و وردەکارییەکی پەیوەست بە ژن، چ گەورە و چ بچووك و

وەزیفە و رۆڵ و کارەکانی، تاوتوێ نەکات! هێندەش هەیە رەوشتی قسەکردن لە سەردەمی ئێستاماندا، زیاتر مەیلی لە بەکارهێنانی دەستەواژەگەلی بە ئەدەبانەیە و بەکارهێنانی ئەوەی پێی دەوترێت ((ئەدەبی کراوە یان ئاشکرا)) قەدەغە دەکات! هەر بۆیە وەرگێڕی ئینگلیزی کارەکانی کلیمێنت، بۆ نموونە، دەڵێت: ((کاتێك بڕیارماندا کارەکانی کلیمێنتی ئەسکەندەری وەربگێڕینە سەر زمانی ئینگلیزی، بینیمان بڕێکی زۆریان لەگەڵ رەوشتی گشتی و فیکرە نوێیەکان دەربارەی حەیاکردن و ئەدەب و سنوورنەبەزاندندا وێك نایەنەوە، بۆیە وامان پێ باش بوو، کە بە هەمان شێوە لاتینییەکەیان دایانبنێینەوە و نەیانکەین بە ئینگلیزی...))[٨٩].

ناتوانین بڵێین تەنیا کلیمێنت کارێکی لەو شێوەیەی کردووە، بەڵکو دەتوانین هەمان شت دەربارەی کتێبێکی تریش بە ناوی ((خوانی دە پاکیزەکە)) لە نووسینی قەشە میتۆدیۆس (٨٢٧ ــ ٨٦٩)ەوە بڵێین. تیایدا قەشەی پیرۆز، وێنای خوانێك دەکات هاوشێوەی خوانە بە ناوبانگەکەی ئەفلاتون، بەڵام لە بریی بینینی سوکرات و ئاگاسۆن و بیرمەندان و ئەدیبانی تری ناو گفتۆگۆکەی ئەو فەیلەسوفە یۆنانییە، دە کچی پاکیزە دەبینین، کە بە باڵای پاکیزەیی و خۆ دوور گرتن لە سێکسدا هەڵدەدەن، زانینێکی وردی توێکاری جەستەی ژن و فسیۆلۆژیای مێینە و هاوکات لادانەکانی ژنیش دەخەنەڕوو.

ئەوەی مایەی تێبینییە، لاهوتی و پیاوانی دینی بە شێوەی گشتی، مەیلێکی زۆریان لە باسکردنی مەسەلە سێکسییەکان بە شێوەیەکی گەرموگوڕ و ئاشکرا هەیە، بە بیانووی راشکاوی و راستگۆیی و ئاکار و بە پشتبەستن بەوەی گوایە شەرع شەرمی تێدا نییە! قەناعەتیشیان وایە، کە قسەکانیان هیچ جۆرە خراپەیەکی تێدا نییە. بڵێی هۆکاری ئەوە چی بێت؟ ئایا لەبەر ئەوەیە، کە کاتێك باس دێتە سەر شەهوەتەکانی جەستە, ئەوان لە بەرامبەریدا دەستەپاچەن و بە رووکەشانە نەبێت ناتوانن بە سەریدا زاڵبن و لە کۆتاییدا هەر ئەو شەهوەتانە دەیبەنەوە؟ ئەگەر وا نییە، چۆن ئەو رووداوەی دوای نزیکەی دوو سەدە هەر لە شاری ئەسکەندەریە روویدا، لێکبدەینەوە، کاتێك

کۆمەڵێك راهیب ڕێگەیان لە ((هایپیشیا))ی ژنە فەیلەسوفی ئەسکەندەریە گرت و لە گالیسکەکەی هێنایانە خوارەوە، دواتر بوتروس، خوێنەرەوەی دوعاکان سەری بڕی، هەڵبەتە پاش ئەوەی راهیبە ((دڵ پاکەکان)) جلەکانیان لەبەر داماڵی و رووتیان کردەوە[٩٠]. ئایا ئەو رووتکردنەوەیە بۆ ئەوە بوو، تا راهیبە ((دڵ پاکەکان)) بتوانن تێر سەیری جەستەی رووتی پاکیزەیەکی جوان بکەن پێش ئەوەی بیکوژن، ئایا مانای وا نییە، کە شەهوەتەکانی جەستە هێشتا کاریگەر بوون و هەوڵیانداوە ((دڵە پاکەکانیان)) بە دیمەنی جەستەیەکی رووت بگەشێننەوە؟! پرسیارگەلێکی بێ وەڵام، بەڵام گرنگن و هەر جارێك ((باسکردنی بێ پەردەی)) لاهوتی و پیاوانی دینی دەربارەی سێکس دەبینم، بە بیرمدا دێن![٩١].

هەندێك لە نووسەر و توێژەران بەرگرییان لە نووسینەکانی کلیمێنت کردووە و وتوویانە: ((لە حاڵەتی کلیمێنتدا، کەس گومانی لە سادەیی و رەوانی زەینیی نییە، نووسینەکانیشی ــ هەر چەندە هەندێك لە زانایانی لاهوت خۆیانی لێ بێبەریی دەکەن ــ هیچ جۆرە ئارەزوویەکی سێکسییان تێدا نییە. ئەگەر جۆرێك لە ((بێ حەیایی)) لە کتێبی ((خوانی دە پاکیزەکە))ی میتۆدیۆسدا هەبێت، ئەوا مەبەست لە دەستەواژە و زمانی کلیمێنت پاکبوونەوەیە. جیاوازیمان لەگەڵیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەست و سۆزمان لەم سەردەمەدا گۆڕاوە، وەك لەوەی پەیوەندیی بە خراپیی ئەو کەسەوە هەبێت، کە نووسیونی[٩٢].

بەڵام با بزانین کلیمێنتی ئەسکەندەری، کە یەکەمین باوکی فەیلەسوفە، دەربارەی ژن و وەزیفە و رۆڵی ژن چ دەڵێت؟

دەتوانین لە پاشماوەی نووسینەکانی تریەوە، بۆچوونەکانی بەم شێوەیەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

کلیمێنت لە جیاوازی کردنی لە نێوان ژن و پیاودا بە ئەقڵ دەست پێدەکات، کە بە پیاو بەخشراوە و نیشانەی شکۆیەتی: ((هیچ شتێك بۆ پیاو، کە خودا ئەقڵی پێبەخشیوە، مایەی شەرم و سەرشۆڕیی نییە. بەڵام بۆ ژن مەسەلەکە جیاوازە، کە

تەنانەت کاتێکیش بیر لە سروشت و تواناکانی خۆی دەکاتەوە هەر مایەی شەرم و ئابڕووچوونە))[٩٣].

بەم شێوەیە دەبینین، کلیمێنت راشکاوانە دەریدەبڕێت، کە ژن هەبوویەکی نزمترە لە پیاو، ئەوەش بە هۆی ئەقڵەوە، کە بە پیاو بەخشراوە و تاجی سەریەتی و بێ ئەوەی هیچ خەوشێکی تێبکەوێت پارێزگاریی لێدەکات: ((ئەقڵ ئەمانەتێکە لای پیاو، کە هیچ هەڵەی تێدا ناکات، هیچ کەموکورتی و کەمتەرخەمییەکیشی تێناکەوێت. بەڵام ژن، دەبینین هەر بە سروشتی خۆی شتێکی بە ڕاستی شەرمهێنەر و ئابڕووبەرە...)). کەواتە پیاو چۆن لەگەڵ ئەو مەخلوقەدا رەفتار بکات؟ باشترین وەسیلەیەك بێدەنگکردن و بەندکردنییەتی لە ماڵەکەیدا، چونکە ئەرکی ژن ئەوەیە لە ماڵەوە بمێنێتەوە و کارێك نەکات هیچ کەسێك لە هیچ شوێنێکدا بیبینێت. بۆیشی نییە بڕواتە بۆنە و داوەتییەکان، چونکە بە نیگاکانی بیری خراپ لە زەینی پیاواندا دروست دەکات، بە تایبەتی ئەو پیاوانەی خوویان بە زیادەڕەویی لە خواردنەوەدا گرتووە. بۆیشی نییە بڕواتە ئاهەنگی هاوسەرگیری و گواستنەوە، چونکە رەنگە قسەوباس و گۆرانیی ئاهەنگەکان جۆرێك لە وروژاندنیان لێبکەوێتەوە، هەروەها بۆی نییە بە شەقامەکاندا بخولێتەوە و چاوی برسیی بە لای خۆیدا پەلکێش بکات، بۆیشی نییە بڕواتە شانۆ و گەرماو و یارییە وەرزشییە گشتییەکان. ئەگەر ژن ویستی وەرزش بکات، ئەوا کلیمێنتی ئەسکەندەری بەرنامەیەکی دیاریکراوی بۆ داناوە:

پێویستە وەرزشی رستن و چنین و سەرپەرشتیی مەتبەخ بکەن، چونکە ئەو شتانە زۆر پێویستن. پاشان دەڵێت ژنان دەتوانن هەر شتێکیان بوێت لە مەخزەنەکانیان، بێهێنن... هەروەها هیچ عەیب نییە ئەگەر ژن خۆی دەستارِ بەکاربهێنێت، ئەوەش وەرزشێکی گرنگە، هیچ کێشەش نابێت ئەگەر ژن خۆی بە کاروباری مەتبەخ و خواردن و ئامادەکردنی خواردنی باش، کە بە لای مێردەکەیەوە خۆش بێت، سەرقاڵ بکات. ئەگەر جێی خەو رابخات و هەر کاتێك مێردەکەی تینووی بوو ئاوی بۆ بهێنێت، ئەگەر بە گوێرەی توانا خوانی خواردنەکان ئامادە بکات، بەو کارانەی

وەرزش و ڕاهێنانێکی وای کردووە، کە بەشی لەشساغیی بکات[٩٤]. بەڵام لەو حاڵەتانەدا، کە بە هۆی سەردانی نەخۆش، یان چوون بۆ کڵێساوە ناچار دەبێت ماڵەکەی چۆڵ بکات، ئەو کات پێویستە پەچە بپۆشێت، بە جۆرێك هیچ شوێنێکی رووخساری دیار نەبێت، پێویستە بە درێژایی ماوەی مانەوەی لە کڵێسادا خۆی داپۆشێت. فەیلەسوفەکەمان دەڵێت: ((پێویستە ژن بە تەواوی جەستەی داپپۆشێت، تەنیا ئەو کاتانە نەبێت، کە لە ماڵەوە دەبێت، چونکە ئەو جۆرە جلە ویقاری پێوەیە و لەو چاوانەی چاو دەبڕنە جەستەی، پارێزراوی دەکات. جگە لەوەش کاتێك پەچە دەپۆشێت، لەو کاتەوەی بە داپۆشراوی دێت بۆ نوێژکردن، نابێت خەڵکی تر بۆ گوناھ هان بدات. ئەوەش ویستی لۆگۆسە))[٩٥].

ڕەنگە خوێنەر تێبینیی ئەوە بکات، کە لێرەدا زۆر بە ئاشکرا ڕوانینی سێکسییانە بۆ ژن زاڵە، ئەو جۆرە تێڕوانینەش دواتر لای لاهوتی و پیاوانی دینی بە شێوەی گشتی بەردەوام دەبێت، کە جگە لە سێکس هیچی تر لەبارەی ژنەوە نازانن، لای ئەوان ژن نە هاوکارە، نە هاوسەرە، نە هاوڕێیە، نە دایکە، نە مامۆستایە و نە پزیشکە و ...هتد، هیچ نییە جگە لە سێکس. بۆیە بۆی نییە بە هیچ شێوەیەك خۆی بڕازێنێتەوە: ((خودا پێی خۆش نییە ژنی ئیمانداری مەسیحی خۆی بڕازێنێتەوە. ئامانجی داپۆشینی جەستەش بەرگری کردنە لەو جەستەیە و پاراستنییەتی لە سەرما و گەرمای زۆر)).

لەبەر ئەوەشی خودا خۆڕازاندنەوەی ژنی مەسیحیی پێ باش نییە، کەواتە پێویستە چیتر ئاوریشمی هیندی و ئەو جلانەی زێڕیان پێوەیە نەپۆشرێت، ئەو جلانە چیتر قەدەغەن، ژن لێی حەرامە هیچ جۆرە زێڕێك بە خۆیدا بکات، هاوکات پێویستە خۆی لە جلی بۆیاخکراو بە دوور بگرێت، چونکە بۆیاخ بۆ تەندروست یی باش نییە و هەروەها چاوی برسی ڕادەکێشێت، جگە لەوەشی درۆزنانە و دەستکردانەیە، جا ئەگەر خودا ویستبێتی جلی سوف ڕەنگی پەمەیی بێت، ئەو کات مەڕی بە ڕەنگی پەمەیی

خەڵق دەکرد. پێویستە هەر هەوڵێکی خەڵەتاندنی نەفس بە توندی سەرکۆنە بکەین. کلیمێنت دەڵێت:

((رازاندنەوەی سەرپۆش و جۆراوجۆریی ئەو سەرپۆشە، دانان و شۆڕکردنەوەی پەلکە و هەموو جۆرەکانی تری رازاندنەوەی سەر و روخسار، هەموو ئەو ئاوێنە گرانبەهایانەی خۆیانی لەبەردا دەڕازێننەوە، ئەوانە خەسڵەتی کردەوەی ئەو جۆرە ژنانەن، کە هیچ حەیایەکیان نەماوە...)). ئەگەر فەیلەسوفەکەمان رازاندنەوەی جەستەی سروشتی بەو رادەیە سەرکۆنە دەکات، ئەوا وەسیلە و فێڵە دەستکردەکان، کە سنوریان نییە و خانمە یۆنانی و رۆمانییەکان بەکاریدەهێنن، رقی لە هەموویانە، بگرە بێزراون لەبەر چاوی: ((تۆ تا چاوت رەنگاورەنگ بێت ناتوانی خودا ببینیت، چونکە ئەو چاوانە ئەوانە نین، کە ئەو خەڵقی کردوون، بەڵکو ئەو چاوانەن، کە شەیتان خراپی کردوون. تۆ دوای شەیتان کەوتی و لاسایی چاوی سووری مارت کردەوە و بە جلی دوژمن خۆت رازاندەوە، بۆیە لە تەنیشت ئەوەوە دەنێژرێیت...)). روو دەکاتە پاکیزەکان و دەڵێت: ((با شێوەت وەك خۆی بمێنێتەوە و خراپی مەکە، ملت مەڕازێنەوە، با شێوەت سادە بێت، گوێیەکانت کون نەکەیت و برینداری بکەیت، زنجیری گرانبەها مەکرە، دەستبەند یان گەردنبەندی گرانبەها لە دەست و ملت مەئاڵێنە، پێیەکانت لە کۆتە زێڕینەکان ئازاد بکە، پرچت خەڵتانی بۆیاخ مەکە، بەو شێوەیە ئینجا چاوانت شیاوی ئەوە دەبن، کە لە خودا بڕوانن.

کلیمێنت چەند بەسەرهاتێکی ترسناك دەربارەی پاکیزەکان دەگێڕێتەوە: ((زۆر جار پاکیزەکان لە کڵێسا کۆ دەبنەوە، کاتێکیش گوێی لە چیرۆکە سێکسی و بێزراوەکانیان دەبێت، دەنرکێنێت. بەو شێوەیەش گوڵی پاکیزە دەژاکێت و لەناو دەچێت، لەوێشەوە شەرەفی داوێنپاکی و حەیاکردن ون دەبێت، شکۆ و کەرامەتی کڵێسا پێشێل دەکرێت. بۆیە پێویستە داوای دان بەخۆداگرتن و هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی نموونەی باڵا بکەین، کە ئەویش پاکێتییە، نەك تەنیا پاکیی جەستەیی، بەڵکو ئەوەی فراوان دەبێت و هەموو ژیان دەگرێتەوە. چونکە ئاسان نییە بەبێ زمان ئەندامەکانی شەهوەت بە

پاکی رابگیرێن، بەبێ نیگاکانی چاو و چرپەکانی گوێ و دەست لێدانەکانیش، پاکیی زمان راناگیرێت. لە کۆتاییشدا خۆخەڵەتاندنە ئەگەر بمانەوێت بە بێ رۆح، کە بە تورەیی و لوتبەرزیی پیس دەبێت، کۆی ئەو ئەندامانە پاك رابگرین))[٩٦].

بێگومان کلیمێنتی ئەسکەندەری لە یەکەمینی ئەو فەیلەسوفە مەسیحییانەیە، کە هێرشیان کردووەتە سەر هاوسەرگیری و خراپییەکانیان باسکردووە. دوای ئەویش، وەك دواتر بۆمان دەردەکەوێت، تەرتولیان لاسایی دەکاتەوە، ئەوەش لە رێگەی باسکردنی ئازار و هاوارکردنی منداڵەوە، کاتێك بۆ یەکەمجار پێدەنێتە ژیانەوە، کە دەیەوێت عیبرەتی لێوە وەربگرین بۆ ئەوەی هاوسەرگیری نەکەین و منداڵ نەخەینەوە: ((ئاااى دایکە! بۆچی هێنامتە ئەم دنیایە و ئەم ژیانەوە، کە زوو بێت یان درەنگ تەمەنمان بە مەرگ کۆتایی دێت؟ بۆچی منت هێنایە ئەم دنیا پەشێوەوە، کە یەکەم ئەزموونی پاش لەدایکبوونم تیایدا پەتی قوماتکردن و کۆتەکانیەتی؟ بۆچی منت خستەوە و هێنامتە ژیانێکی وەهاوە، کە گەنجێتی تیایدا دەڕوات و پێش پیرێتی خەمی بۆ دەخۆین، دواتریش دەگەینە پیرێتییەك، کە مەحکومە بە مردن؟ رێڕەوی ژیان چەند ناشیرینە دایکە! ژیانێك، کە لە کۆتاییدا مەرگ ئامانجی هەموو رووداو و پێشهاتەکانییەتی. ئەو رێگەیەی ژیان، کە گەشتەکەی پێدا دەکەین، چەند تاڵ و ئازاراوییە، گۆڕیش ئەو جێگەیە دەبێت، کە رێبوارەکانی تێدا دەمێننەوە!)).

لە کۆتاییشدا، کلیمێنت لە باسی ماچدا دەڵێت:

((خۆشەویستی بە ماچ ناپێورێت، بەڵکو بە هەستە ناسکەکان، بەڵام کەسانێك هەن چ کارێکیان نییە، ئەوە نەبێت کڵێسا پڕ بکەن لە ماچ، ئەوەش شێوەی بە کاربردنی ئابڕووبەرانەی ماچە، کە پێویستە سۆفییانە بێت و هیچ گومانێکی گەمژانە و بۆچوونێکی خراپ نەورووژێنێت و دروست نەکات!

بەڵام لە هەمان کاتدا، پێویستە پێش ئەوەی کلیمێنتی ئەسکەندەری جێبهێڵین، لەوەی بەرگریی لە فەلسەفە کردووە، سوپاسی بکەین. یەکەم بیرمەندی مەسیحی بوو بەرگریی لە فەلسەفە کرد، تەنانەت داوای خوێندنیشی کرد، ئەوەش وەك

وەڵامدانەوەیەکی ئەو بزووتنەوەیەی، کە لە کڵێسا مەسیحییەکاندا دژی فەلسەفە هاتبووە ئاراوە، کاتێك فەلسەفەی بە بیدعەیەکی شەیتانیی گوناهکارانە ناو دەبرد، کە ئیبلیسی پیس بۆ ژەهراوی کردنی ژیانی خەڵکی دایهێناوە! کلیمێنت دەڵێت: ((کەسانێك هەن ـــ لەوانەی خۆیان بە زیرەك و لێهاتوو دادەنێن ـــ پێیان باشە دەست بە ئیمانەوە بگرین و واز لە فەلسەفە و زانست بهێنین. ئەوانەش ـــ راستییەکەی ـــ وەك ئەو کەسە وان، کە رەزی نییە، کەچی چاوەڕوانی رنینەوەی تریێ دەکات! فەلسەفە بۆ یۆنانییەکان پێش هاتنی رەب پێویست بوو، بۆ ئەوەی دادپەروەری جێبەجێ بکەن، لە ئێستاشدا بە سوودە بۆ خواپەرستی، وەك چۆن رێگە خۆشکردنێکی پێویستی دینیشە، مەبەستم بۆ ئەو کەسانەیە، کە لە رێگەی بەڵگەکاریی ئەقڵییەوە دەگەنە ئیمان!)).

## دووەم: تەرتولیان (١٦٠ ـ ٢٣٠)
## Tertullian

لەگەڵ تەرتولیاندا، رقی مەسیحییەت لە ژن گەیشتە چڵەپۆپە و بوو بە عەقیدەیەك، کە کڵێسا بە کوڵك و پێستەوە پێی قبووڵ دەکرا. هەڵوێستی تەرتولیان لە ژن بە شێوەیەکی نائاسایی کیناوی و تۆڵەسەندنەوە بوو! رەگەزەکانی ئەو هەڵوێستەشی بەم شێوە پێکهاتبوون: وێناکردنێکی خراپی غەریزەکانی ژن و وەزیفەکانیان، گاڵتەکردن بە وەزیفەی دایکایەتی و بێڕێزی پێکردنی، تۆقین لە جوانیی ژن، نیگەرانی لە توانای بە هەڵەدابردنی و پێداگرتن لەسەر بەرپرسیارێتیی ژن لە وەدەرنان لە بەهەشت، ئەو رەگەزانەش بە زەقی دوای خۆی، لای جێنشین و شوێنکەوتووانی و لای فەیلەسوفە مەسیحییەکانیش دەبینرێن[٩٧].

**١- ژیانی:**

ساڵی ١٦٠ لە قرتاجە (نزیك بە شاری تونس ـــ ی ئێستا) لەدایکبووە. یەکێکە لە ناودارترین باوکە فەیلەسوفەکانی سەردەمەکەی. کوڕی دایك و باوکێکی بتپەرست بوو، هەر لەو شارەشدا خراوەتە بەر خوێندن، ئەدەب و یاسای خوێندووە، بەوەش توانیویەتی پیشەی پارێزەرایەتی پێڕەو بکات، بووە بە پارێزەرێکی گەورەی شاری قرتاجە. تێکەڵبوونی لایەنی ئەدەبی بە لایەنی یاسایی هۆکارێکی سەرەکیی ناوبانگەکەی بووە.

تەرتولیان لە نووسینەکانیدا دان بەو هەڵانەدا دەنێت، کە لە گەنجێتیدا ئەنجامیداون، دەڵێت گوایە زینای کردووە و هاموشۆی ئەو شوێنانەشی کردووە، کە خراپەیان تێدا دەکرێت. تا تەمەنی سی ساڵی کەسێکی سەرەڕۆ بوو، ساڵی ١٩٠ لە رۆما بووەتە مەسیحی، لە باسەکانیدا وا تێدەگەین، کە لەو رۆژەدا بە پاڵەوانێتیی مەسیحییەکان زۆر سەرسام بووە، کاتێك بەرەو مەرگ راپێچ کراون، توانای زۆریان لە

قەناعەت پێکردندا وای لێکردووە بڕوایان پێ بهێنێت و پەی بەوە ببات، کە ئەوان بەرجەستەکەری حەقیقەتێکن، کە نکوڵیی لێناکرێت. لەوێوە لە بواری دینیدا دەستی بە نووسین کرد، نووسەرێکی بە توانا و لاهوتییەکی قوڵ، شارەزای زمانەکانی لاتینی و یۆنانی بووە. سەرەتا بە یۆنانی نووسیویەتی و دواتر نووسینەکانی خۆی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی لاتینی، تا بواری بڵاوبوونەوەی زیاتریان بۆ بڕەخسێنێت، چونکە زمانی یۆنانی لە وڵاتەکەیاندا زۆر باو نەبووە، درێژەی بە نووسین بە زمانی لاتینی داوە و نووسینەکانی لەبارەی مەسیحییەت بەو زمانە نووسیوە. کتێبی ((بەرگری کردنێك لە مەسیحییەکان))ی نووسیوە. بە هۆی ئەو کردەوەکانی ئیمپراتۆری رۆمانی سیپتیمۆس سڤێرۆس و چەوساندنەوەی مەسیحییەکانەوە، ترساوە و هەڵهاتووە. لەو کتێبەدا ئەوە دەخاتە ڕوو، کە چەوساندنەوە رەوا نییە، دەنگ لە دژی ئەو رێوشوێنانەی فەرمانڕەوای ویلایەتە رۆمانییەکان دژی ئیمانداره مەسیحییەکان پێی هەڵدەستن، هەڵدەبڕێت و پێی وایە، ئەو رێوشوێنانە چارەسەر نین و مەسیحییەکان بنبڕ ناکەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە، زیاتر بەهێز و توند و تۆڵ دەبن. بە جۆرێك لە تەحەداکردنەوە دەنووسیت: ((ئێوە دەمانکوژن، بەڵام ئێمە بەردەوام زیاد دەکەین، خوێنی مەسیحییەکان وەك تۆو وایە، ئەو ئەرك و ئازارە زۆرەی دەیخەنە سەر شانی ئێمە عیبرەتێکی تێدایە بۆتان، جا کێ هەیە ئەو شتانە ببینێت و ویژدانی نەجوڵێت و بە دواشیدا بە دوای وەڵامدا نەگەڕێت؟ کێ هەیە بە دوای وەڵامدا بگەڕێت و نەیەتە ریزەکانمانەوە؟ کێ هەیە بێتە ریزەکانمانەوە و لە پێناو بەدەستهێنانی نیعمەتی خودایی تەواو و لێخۆشبوونی یەکجاریدا حەز بە ئازارچەشتن و مردن نەکات؟...))[٩٨].

**٢- تەرتولیان و ژن:**

پێدەچێت ئەو تاوان و هەڵانەی تەرتولیان لە گەنجێتیدا ئەنجامیداون، هەستکردنیان بە گوناه لە لا دروست کردبێت و وایان لێکردبێت بە توندی پەشیمان ببێتەوە. بێگومان ئەو ئەزموونە و ئەو ئازارەی لێیەوە چەشتویەتی، رۆڵێکی

گەورەیان لە پێکهاتنی بۆچوونی تەرتولیان دەربارەی ژن هەبووە. هەر چەندە هاوسەرگیریی کردبوو، بەڵام پێدەچێت لە بەرامبەر ئەو ((هەڵخلیسکان))ەشدا هەستی بە گوناهـ کردبێت، لەوێشەوە چووبێتە ریزی رەبەنێتیێکی زۆر توندڕەوانەوە، کە نەك تەنیا سێکس، بەڵکو ژنیشی بوغزاندبێت و خۆی لێ بێبەری کردبێت! لە یەکەم توێژینەوەیدا تەرتولیان پێی وابووە ژنان، کۆمەڵێك پاڵنەری خراپ حوکمیان دەکات، بڕوایان بە ئەگەری خۆشەویستیی راستەقینە، یان خۆشەویستیی جدی بە نیازی هاوسەرگیری نییە. لێرەوە، پاش ئەوەی دەبێتە راهیب، لە نامەیەکیدا ئامۆژگاریی هاوسەرەکەی دەکات، کە پاش ئەوەی ئەم دەمرێت، جارێکی تر شوونەکاتەوە، چونکە شووکردن کۆمەڵێك پاڵنەری خراپی بۆ قوت دەکاتەوە، وەك ئارەزوویەکی زۆر و کۆنترۆڵنەکراو، شەهوەت و حەزکردن لە دەستگرتن بەسەرماڵی پیاوێکی تردا و خەرجکردنی ئەو پارەیەی، کە کابرا بە درێژایی تەمەنی سەرقاڵ و ماندووی کۆکردنەوەی بووە: ((ئەگەر تاسەی هەبوونی منداڵت لە لا دروست بوو، دەبێت ئەو کەسانە بیری خۆت بهێنیتەوە، کە منداڵیان نییە. بزانە ئەو کەسانەی بە بێ بەرهەمی ماندووکەری هاوسەرگیری، کە رەحم دەئاوسێنێت و بێ ئەوەشی هیچ لە سینەیاندا هەبێت دەژین، بە راستی ئەو کەسانە دەتوانن بە باشی خزمەتی رەب بکەن، پاش ئەوەی بۆ جاری دووەم دێتەوە))[٩٩].

هاوشێوەی کلیمێنتی ئەسکەندەری، تەرتولیان لە نامیلکەیەکیدا بە ناوی ((چەند وانەیەکی دینی)) باسی جلی ژنان دەکات. بەڵام نەك تەنیا خۆڕازاندنەوە و جل، بەڵکو زۆر ئاشکرا و راشکاوانە سەرلەبەری رەگەزی مێینە سەرکۆنە دەکات. هەر چەندە بە دەستەواژەیەکی جوان: ((بۆ خوشکە خۆشەویستەکان!)) لەگەڵیان دەدوێت و ناونیشانەکەشی کردووە بە: ((خۆپۆشتەکردنەوەی ژنان))، بەڵام زۆر نابات واز لەو ناسکییە دەستکردە دەهێنێت، دەڵێت: ((هەر ژنێك لە دۆخی خۆی وەك مێینەیەك ورد بێتەوە، زۆر نابات ریسوایی رووکەش و روخساری خۆی بۆ دەردەکەوێت (ئەو پێی وایە گرنگیدان بە رووکەش و روخسار خاڵی لاوازییە) وەك حەوا بە رێدا دەڕوات،

پەشیمان و دڵتەنگ، بە رادەیەك بەو هەموو جلی تەوبە و پەشیمانییەوە، کە لەبەریایەتی ناتوانێت میراتی حەوا لە کۆڵی خۆی بکاتەوە: مەبەستم سەرشۆڕیی گوناهی یەکەم و شەرمەزاریی تیاچوونی مرۆڤایەتییە!

ئەو حوکمی ئیدانەکردنەی خودا بە سەر ژندا سەپاندوویەتی ئەوەیە، کە ماندوێتیی سکپڕبوونی زیاتر بێت، بە ئازارەوە مندالی ببێت، هەمیشە تامەزرۆی پیاوەکەی بێت و ئەویش ببێتە ئاغا بە سەریەوە (سفر التکوین ٣:١٦). ئەو حوکمەش تا رۆژگاری ئەمڕۆ بەردەوامە، لێرەوەیە گوناه و ئیدانەکردنی ژنان. تەرتولیان روو لە ژنان دەکات و دەڵێت:

((ئێوە نازانن، کە هەر یەکەتان حەوایەکە، حوکمی خوداش بەسەر رەگەزەکەتاندا تا ئێستا بەردەوامیی هەیە. کەواتە تاوانەکەشتان هەر ماوە: ئێوە دەروازەن بۆ شەیتان، ئێوە بوون لە بەری دارە حەرامکراوەکەتان خوارد. ژن بوو پیاوی هەڵەخەڵەتاند نەك بە پێچەوانەوە، یەکەم کەس بوون بێ فەرمانیی خوداتان کرد و لە شەریعەتی ئیلاهی لاتاندا و ملکەچی شەیتان بوون، ئەو شەیتانەی، کە هێندە ئازا و بوێر نەبوو بێت و راستەوخۆ پیاو هەڵخەڵەتێنێت، بەڵام تۆ بوویت، ئەی ژن، زۆر بە سووك و ئاسان فۆرمی خودات شکاند، کە پیاوە، فۆرمی خودایی بەو شێوەیەی لە پیاودا بەرجەستە بوو، بە هۆی تۆوە بوو مردن هاتە ناو دنیاوە، هەر بە هۆی تۆوە بوو دەبوو کوڕی خودا بمرێت، بۆیە دەبێت تۆ هەمیشە دڵتەنگ و تازیەبار بیت، جلی پرسەت لەبەردا بێت. بۆ خۆداپۆشینیش پێت دەڵێم، کە دەبێت تەنیا جلی شڕ لەبەر بکەیت)) [١٠٠].

پێویستە لێرەدا تاوێك بوەستین و چەند تێبینییەك لەسەر ئەو دەقە بدەین:

**یەکەم:** دەبینین جارێکی تر کەلەپووری کۆن (رۆمانی و یەهودی و تەنانەت یۆنانیش) سەر دەردەهێنێتەوە و بە تەواوی هەموو هەڵوێستە مرۆییە نوێیەکانی حەزرەتی مەسیح پشتگوێ دەخات. تەنانەت رقی ئەفلاتونی لە جەستە دەبینین، کە بەرگێکی دینیی بە بەردا کراوە. شەهوەت یاخود ئارەزووی زۆری سێکسی، کە بە

تەواوی خەسڵەتێکی ئاژەڵییە، ئەو بابەتەیە، کە هەمیشە پیاوانی دینی بە شێوەیەکی گشتی باسی دەکەن، هەمیشە پیاو وەك مرۆڤێکی خۆڕاگری بەهێز دەردەخەن و ژنیش دەکەنە دەروازەی شەیتان، دەیکەنە تۆڕ و داوی شەیتان، تەنانەت خودی شەیتانیش، رەنگە لە شەیتانیش بەهێزتر، چونکە ئەو نەیتوانی پیاو هەڵبخەڵەتێنێت، یان نەیوێرا راستەوخۆ ئەو کارە بکات.

وەسیلەی شەیتان ژن بوو، ئەوی هەڵخەڵەتاند و ئەویش پیاوی هەڵخەڵەتاند و خستییە داوی خۆیەوە. واتە ئەگەر پیاو بە تەنیا بووایە، کەسێکی داوێنپاکی بێ هیچ شەهوەت و ئارەزوویەك و هیچ مەیلێك لە سێکس دەبوو، یان لە باشترین حاڵەتدا دەیتوانی بەسەر ئەو ((پاڵنەرە شەیتانییانە))دا زاڵبێت و توانا تایبەتییەکانی خۆی رزگار بکات.

**دووەم:** زۆر جار دەبینین ئەو ((قەشە))یەی گەنجێتیی لە گوناهـ و سەرکێشی و زینا و هاوەڵێکردنی سۆزانییەکان و...هتد بردووەتە سەر، پەنا دەباتە بەر تەوبە و لە کۆتایی ژیانیدا، پاش ئەوەی جلی رەبەنی و مەسیحییەت دەپۆشێت و داوێنپاك و پیرۆز دەبێت، هێرشێکی توند دەکاتە سەر ((ژن))، ئەو شەیتانە مرۆییەی، کە ئەو هەموو گوناهەی پێکردووە و رێگەی خراپە و هەڵەی نیشانداوە، وەك ئەوەی لە ژیانی پێشووی پاشگەزبێتەوە و داوای لێبوردن بکات، بەڵام هێندە بوێر نییە بەرپرسیارێتیی کردەوەکانی لە ئەستۆ بگرێت، بەڵکو لۆمەی ژن دەکات، ئەوەتا خۆی دەڵێت: ((چیم بکردایە، کە ئەو شەیتانە جوانە بانگی دەکردم و شەهوەت و غەریزەکانی ختووکە دەدام، تا جڵەوی خۆمم لە دەستدا و چیتر کۆنترۆڵم بەسەر هیچ شتێکدا نەما! بەڵام ئێستا، کە غەریزەکان دامرکاونەتەوە و ئارەزووەکانم سست و شەهوەتم لاواز بوون، راستیی دۆخەکەم بۆ دەردەکەوێت و ژن بە تەواوی لە سەرلەبەری رووداوەکان بە بەرپرس دەبینم!)).

**سێیەم:** زۆر جار دەبینین لاهوتی و فەیلەسوف و باوکان و پیاوانی دینی بە گشتی، بە تایبەتی لە تەمەنی پیری و لاوازیدا، زۆر حەزیان لە باسکردنی ((جەستە))ی ژنە،

وەك ئەوەی ئەگەر تەنیا بە باسکردنیش بێت، چێژ لە جوانی و هارمۆنیی جەستەی وەربگرن، وەك جۆرێك لە قەرەبووکردنەوەی دەروونی بۆ ئەو شتانەی لە دەستیانداوە[١٠١].

بۆیە دەبینی باس لە چاوی بەڵەك، کلی چاو، پرچی رەش، گۆنای ئاڵ، دەمی جوان، قەدی رێك و سنگی بەرز و...هتد دەکەن، دواتریش داوا لە ژن دەکەن، کە ئەو جوانییانە بشارێتەوە، وەك بڵێی تەنیا لەبەر ئەوە باسی ئەو بەشانەی جەستەی ژن دەکەن، تا داوای لێبکەن، کە بیانشارێتەوە.

لەو گۆشەنیگایەوە تەرتولیانی باوکی فەیلەسوف، هەڵمەتی خۆی دژی ژن درێژە پێدەدات و وای دەبینێت، کە ژن پێویستە، نەك تەنیا واز لە دەرخستن و زەقکردنەوەی جوانییەکانی جەستەی بهێنێت، بەڵکو پێویستە: ((واز لەو جوانییانە بهێنێت و جوانیی سروشتی پشتگوێ بخات، تەنانەت پێویستە هەموو نیشانەکانی جوانیی بسڕێتەوە، چونکە جوانیی سروشتیی ژن زۆر مەترسیدارە بۆ هەر کەسێك، کە دەیبینێت یان بەختی خراپی وای لێ دەکات رێی لێ بکەوێت)).

لە کاتێکدا ئەو دان بەوەدا دەنێت، کە جوانیی سروشتی لە خۆیدا تاوان نییە، بەڵام پێی وایە، کە ترسێنەر و تۆقێنەرە، چونکە زیانبەخشە بۆ هەر کەسێك، کە شەیدای دەبێت و داوای نزیکبوونەوەی لێدەکات[١٠٢].

لێرەوە تەرتولیان حوکمێکی یەکلاکەرەوە و بنبڕانە دەدات: ((پێویستە هەموو ژنێك سەرپۆش بەسەریدا بدات و بە پەچەش روخساری داپۆشێت...))[١٠٣]، دایك لەبەر کوڕەکانی، خوشك لەبەر براکانی و کچیش لەبەر باوکی، مادام ژن بەو کەسایەتییەی هەیەتی مەترسی لەسەر هەموو تەمەنەکان دروست دەکات...))[١٠٤].

هەرچی جوانییە، بەخششێکە لە خوداوە و هیچ دەستی ژنی تێدا نییە، بەڵام تەرتولیان لەگەڵ ئەوەشدا پێی وایە، پێویستە بە هەموو رێگەیەك بشاردرێتەوە، وەك ئەوەی جوانی ((عەورەت))ێك بێت، کە بۆی نەبێت دەربکەوێت! بۆیە دەپرسێت: ((ئایا ژن جوانە؟ جوانی بەخششێکی سروشتییە و پێویستە بشاردرێتەوە، بەوەی

خۆتی لێ گیلّ بکەیت و پشتگوێی بخەیت، چونکە مەترسیدارە لەسەر چاوی بینەرانی!)) لەبەر ئەوەش پێویستە ژن، بە تایبەتی ژنی جوان، لە تەوقی سەرییەوە تا نوکی پێی دابپۆشێت!

گووتمان هەلّوێستی تەرتولیان دەربارەی ژن، هەلّوێستێکی کیناوی و تۆلّەسەندنەوەی نائاسایی بوو، کە لە ئەنجامی ئەو ئەزموونە سەرکێشییانەی لە گەنجێتیدا ئەنجامیداون دروست بووە، دواتریش تەوبەکردن و پەشیمانبوونەوە، دەبینین هەموو رەگەزەکانی وەك: بە سوك سەیرکردنی پالّنەرەکانی ژن و وەزیفەکانیان، بێرێزیکردن بە دایکایەتی و ریسواکردنی، تۆقین لە جوانیی ژن و جەختکردنەوە و سووربوونی بەردەوامی لەسەر بەرپرسیارێتیی ژن لە وەدەرنان لە بەهەشت، هەموو ئەو رەگەزانە لای باوکانی کلّێسای هاوسەردەمی خۆی بوونیان هەیە، یەکێکیان قەشە گریگۆری توماتێرگۆس (٢١٣ ــ ٢٧٠)ە، کە یەکێکە لە باوکانی کلّێسای رۆژهەلاّتی و ئوسقوفی شاری قەیسەریەی نوێیە، دەلّێت:

((لە ناو ژناندا زۆر بە دوای داوێنپاکیدا گەڕام، بەلاّم هیچم بەرچاو نەکەوت. دەشێت مرۆڤ لە ناو هەزار پیاودا، پیاوێکی داوێنپاك ببینێت، بەلاّم لە ناو ژناندا قەت شتی وای دەست ناکەوێت)). ئینجا باس لەوە دەکات، کە بە جوانی و خۆڕازاندنەوەیان ئەقلّی پیاوان سفردەکەنەوە، بە نیگایەکی چاویان ژەهریان بۆ تێدەکەن، دواتریش بە کردەوەکانیان دیلیان دەکەن. بۆیە پێویستە پیاوان هەستی رق و کینەی خۆیان ئاڕاستەی هەموو ژنان بە بێ جیاوازی بکەن! دواتر دەلّێت: ((فریشتەی خودا پێی راگەیاندم، کە ئەوەی ژنان بە ئەفسوونی خۆیان دەیکەن، کار لە پاشا و سولّکەر بەبێ جیاوازی دەکات. ژن شکۆ لە پاشا دەسەنێتەوە، هێز و غیرەت و ئازایەتی لە پیاو دەسەنێتەوە، تەنانەت وا لە سوالّکەر دەکات بەرگەی هەژاریی نەگرێت))[١٠٥].

هەمان ئەم هەلّوێستە لای جێنشینانی تەرتولیانیش دەبینین و دووبارە دەبێتەوە، هەموویان سەرەتا فیکری خۆیان دەربارەی ژن لەسەر بنچینەی ئەزموونی کەسی،

دواتریش لەسەر کەلەپووری یەهودی ــ رۆمانی و ئەو بنچینانەشی، کە قەشە پۆڵس لە تیۆرەکەیدا دەربارەی ژن و پێویستی ملکەچبوونی ژن بۆ پیاوان دایناوە، دادەمەزرێنن.

بۆیە دەبینین قەشە ئۆگەستین، هەمان ئەزموونی سێکسیی تەرتولیان لەگەڵ سۆزانییەکاندا دووبارە دەکاتەوە، کتێبێکی تایبەتی بە ناوی ((دانپیانانەکان)) دەنووسیت و تیایدا دان بە گوناه و تاوانەکانیدا دەنێت، کە چۆن لە ژنێکی زیناکار کوڕێکی بووە و بە درێژایی ژیانی پێی وتووە ((کوڕی گوناهەکەم))! دەشبینین چۆن قەشە ئۆگەستین بە هەمان رێچکەدا، کە پێشتر قەشە پۆڵس و دواتریش تەرتولیان و باوکانی تری فەیلەسوف رەنگیان رشتووە، دەڕوات. ئەو رێگەیەش بەوە کۆتایی دێت، کە ژن بە بوونەوەرێکی لە پیاو کەمتر سەیردەکرێت و پێویستە لەسەری رادەستی چارەنووسی حەتمیی خۆی ببێت، بۆیە بە پێزانینەوە هەمان قسەی قەشە مۆنیکا ــ ی دایکی دەڵێتەوە، کاتێك لەگەڵ ئەو ژنانەدا دواوە، کە لای ئەودا گلەییان لە مێردەکانیان کردووە، ئۆگەستین دەڵێت:

((دایکم زۆر کوێرانە ملکەچی باوکمی دەکرد، ژنانێك دەهاتنە سەردانی، کە مێردەکانیان هێندەی باوکم دڵ ڕەق نەبوون، کەچی هێشتا جێدەستی لێدانی پیاوەکانیان بە روخساریانەوە دیاربوو. دایکم پێی دەگووتن: خەتای ئێوەیە، وازبهێنن. خزمەتکار نابێت، بۆیشی نییە بێ فەرمانیی گەورەکەی بکات، ئێوەش ئەو هەڵەیەتان نەدەکرد، ئەگەر مێردەکانتان مەرجەکانی ناو گرێبەستی هاوسەرگیرییان بدایەتەوە بە گوێتاندا، ئێوە باش دەزانن، کە ئەوە گرێبەستێکی کۆیلایەتییە و ئێوە خۆتان پێوە پابەندکردووە))[١٠٦].

ئەگەر ژن تۆزێك لە گرێبەستی هاوسەرگیری وردبێتەوە، بۆی دەردەکەوێت، کە شێوەیەکی یاساییە لە شێوەکانی کۆیلەداریی! بە هۆی ئەو گرێبەستەوە ژنان بوون بە کەنیزەك و پێویستە لەسەر ئەو بنچینەیەش رەفتار بکەن[١٠٧]..!

### ٣ ـ هاوسەرگیری:

باوکانی کڵێسا بە گشتی لەسەر ئەوە کۆکن، وەك ئەوەی شتێکی بەدیهی بێت، کە هاوسەرگیریی لە ڕووی ئەخلاقییەوە پلەیەکی نزمترە لە پاکیزەیی (العذرية)، بۆیە هیچ پاساوێك بۆ پرۆسەی هاوسەرگیری نامێنێتەوە، تەنیا خستنەوەی منداڵ و وەچە نەبێت. باسکردنی ئەو خەسڵەت و مۆرکانەی داوێنپاکییان پێ دەناسرێتەوە، خۆشترین و بەرچاوترین بابەتێکە لەو کتێب و نامیلکە دینی و ئەخلاقییانەی، کە باوکانی کڵێسا دەیاننووسی. هەموو نووسەرێك، لای کەم لە کۆی گشتیی نووسینەکانیدا، باسێکی دینیی ئەو بابەتەی کردووە، قەشە ئۆگەستین زیرەکانە بەڵگە بۆ ئەوە دەهێنێتەوە باوکانی سەرەتا، کە کتێبی پیرۆز باسیکردوون، ئەگەر منداڵ خستنەوە نەبووایە سێکسیان نەدەکرد، تەنانەت خودی یەعقوبیش ئەگەر زۆریی ژنەکانی نەبووایە، حەزی بە خستنەوەی منداڵ نەدەکرد!

لە بەسەرهاتێکدا، کە قەشە ئۆگەستین لە کتێبی ((موناجاتەکان))یدا باسی دەکات، پەیوەندیی نێوان سەرکۆنەکردنی سێکس و رقبوونەوە لە ژن بە ئاشکرا دەردەکەوێت، دەڵێت: ((ڕۆژێکیان ئەقڵم قەناعەتی پێکردم، کە بە ڕاستی شتێکی سوك، قۆڕ، بێزراو، شەرمهێنەر و ترسێنەرە، ئەگەر خۆم لە ئامێزی ژنێکدا ببینمەوە...)) بەڵام دان بەوەدا دەنێت، کە لە هەمان شەودا هێندە لە کەڵکەڵە سێکسییەکانیدا نوقمبووە، ئەقڵی بیرچووەتەوە! بۆ ڕۆژی دواتر جارێکی تر قەناعەت بە خۆی دەکات، کە: ((هیچ شتێك هێندەی ئەوە رۆحی پیاو لە بەرزترین مەقامەوە ناهێنێتە نزمترین پلەوە، کە یاری لەگەڵ ژنێکدا بکات و ماچی بکات، یان دوو جەستە پێکەوە بلکێنن، کە ئەوەشیان بێ ئەوەی ژنێك (زوجە) بوونی هەبێت، ناکرێت.

هەر چەندە باوکانی کڵێسا لە ڕووی تیۆرییەوە بڕوایان وابوو، پەیوەندیی سێکسی هەردوو جەستەکە پیس دەکات و وەك یەك لە پیرۆزییەکان دایاندەماڵێت، کەچی بە حوکمی پیاوبوونیان، ئاسایی بوو جەخت لە کاریگەریی خراپی ژنان لەسەر پیاوان

بکەنەوە، بێ ئەوەی دیوی جیاوازی پرۆسەکە، واتە کاریگەریی خراپی پیاوان لەسەر ژنان ببینن!

گفتوگۆکان لەسەر هاوسەرگیریی بەردەوامبوون، زۆری نەبرد دوو رەوتی جیاواو لە کڵێسادا دەرکەوتن: یەکێکیان لایەنگری هاوسەرگیریی بوو، ئەوی تریشیان هاوسەرگیریی رەت دەکردەوە و سوکی دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا کەس نەیتوانی بڵێت، هاوسەرگیری گوناە یان هەڵەیە، چونکە ئەوە راستەوخۆ دژی وتەکانی حەزرەتی مەسیح لە (سەردەمی نوێ)دا دەوەستایەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە نەریتی کڵێسا لەسەر ئەوەی، کە بە حەرام زانینی هاوسەرگیری گومڕایی و بێباوەڕییە، مایەوە.

کاری باوکانی کڵێسا ئەوە بوو، ئامۆژگاری ژنان بکەن چۆن مێردەکانیان خۆشبوێت و ملکەچیان بن، هەروەها چۆن بە ئەرکی پەروەردەکردنی منداڵەکانیان لەسەر ناسین و ترسان لە خودا بگرنە هەستن. بە تیپەڕینی کات ئەو ئامۆژگارییانە کەمتر بوونەوە، کڵێسای مەسیحیش هاوسەرگیریی هەر قبووڵ بوو.

تەرتولیانیش لە بۆچوونەکانیدا پشتیوانیی لە هاوسەرگیریی ئیمانداران دەکرد، وتەکانیشی بەهێز و کاریگەر بوون. لەبارەی سوودەکانی هاوسەرگیرییەوە دەڵێت:

((وشەی پێویست لە کوێ بهێنین، تا وەسفی بەختەوەریی ئەو هاوسەرگیرییە بکەین، کە کڵێسا پشتیوانیی لێکردووە، پیاوی دینیش تەئکیدی لەسەر کردبێتەوە، پیرۆزیی و دوعای خێری هەمووانی بەدەستهێنابێت، فریشتەکان ئامادەی بووبن و باوکانیش پەسەندیان کردبێت و دانیان پیانابێت؟)) پاشان دڵخۆشیی ژن و مێردەکە باس دەکات و دەڵێت:

((پێکەوە نوێژدەکەن، کڕنوش دەبەن، بەڕۆژوو دەبن، هەر یەکێکیان ئەوی تر فێر دەکات و ئامۆژگاریی دەکات و پشتی دەگرێت[١٠٨]...)).

تەرتولیان لێرەدا جەخت لە گرنگیی هاوسەرگیریی بە گشتی ناکاتەوە، بەڵکو قسە لە خێر و بەرەکەت و دڵخۆشیی بە هاوسەرگیریی نێوان ئیمانداران دەکات، کە بە پێی ڕێنماییەکانی کڵێسا هاوسەرگیریی دەکەن، لە بەرامبەر ئەو هاوسەرگیرییەی، کە

لایەکیان ئیماندار و لایەکەی تریان بێ ئیمانە، کلێساش پەسەندی ناکات و دانی پێدانانێت، واتە ئەو، دوو جۆر هاوسەرگیریی بەراورد دەکات و بانگەواز بۆ یەکێکیان دەکات و ئەوی تریان وەلاوە دەنێت.

هەرچی هاوسەرگیریی قبوولکراویشە لە لایەن کلێساوە، ئەرکەکانی ژن تیایدا هەر زۆر سادەیە: ((پێویستە لەسەری ملکەچی مێردەکەی بێت، چونکە وەکو سەر وایە بۆی، ئەو ئاغایەتی و هەر ئەویش بالاتر و بە دەسەلاتترە))[١٠٩].

کەواتە پێویستە لە مێردەکەی بترسێت، سڵی لێبکاتەوە، رێزی بگرێت، بە تەنیا ئەو دڵخۆش بکات، هاوکات پێویستە بێدەنگیی بپارێزێت، ئەو بێدەنگییەی پێشتر یۆنانییەکان پێیان دەگوت تاج و زینەتی ژن! هەروەها پێویستە خەریکی رستن بێت و چاودێریی ماڵ بکات، پێویستە لە ماڵ بمێنێتەوە و ئاگای لە منداڵەکانی بێت[١١٠]. تاکە بۆنەیش، کە بکرێت تیایدا رێگە بە دەرچوونی بدرێت، بریتییە لە چوون بۆ کلێسا، یان لەگەڵ مێردەکەیدا سەردانی برایەکی نەخۆش بکەن[١١١].

هەر چەندە تەرتولیان هاوسەرگیریی حەرام ناکات ــ چونکە خۆی هاوسەرگیریی کردووە ــ بەڵام بەراورد بە پاکیزەیی، دەیخاتە پلەیەکی خوارترەوە، دەڵێت: ئایەتەکانی کتێبی پیرۆزم کۆکردەوە و بینیم، کە وشە (مەسیح) لە پاکیزەییەوە کەوتووەتەوە، مەسیحیش بە تەواوی خستنەوەی منداڵی حەرام نەکردووە. چونکە هەر چەندە مانگ لە ئەستێرەکانی تر گەورەتر بێت، بەڵام مەرج نییە بتوانێت رووناکی ئەستێرەکان داپۆشێت)). بەو شێوەیەش پلەبەندییەك بۆ ژنان دادەنێت: ((یەکەمجار پاکیزە، پاشان بێوەژنەکان و دواتریش مێردداره‌کان)). ئاوەهاش دەبینین تەرتولیان بە جۆرێك باسی ژن (الزوجة) دەکات، وەك ئەوەی مێینەی پلە دوو بن و کەوتبێتنە داوی هاوسەرگیرییەوە[١١٢]. باوکانی کلێسا هێرشیان کردووەتە سەر ((هاوسەرگیریی دووەم))یش و ئیدانەیان کردووە. مەبەستیشمان لە هاوسەرگیریی دووەم ئەوەیە، کە پیاوێك پاش مردنی ژنەکەی، ژنی دووەم بهێنێت. ئەسیناگۆراس[١١٣] لە نارەزایەتییەکی راشکاوانەدا دەرهەق بە هاوسەرگیریی دووەم دەڵێت: ((ئەو کەسەی لە

ژنی یەکەمی بێبەش دەبێت و ژنی دووەم دەهێنێت، تەنانەت ئەگەر بە هۆی مردنی ژنی یەکەمیشەوە هێنابێتی، زیناکارێکی دەمامکدارە)). تەرتولیانیش هەمان بۆچوونی هەیە، بیانوویشی دژی هاوسەرگیریی دووەم ئەوەیە: ((خودا ژن و مێردی کردووە بە یەك جەستە، کاتێکیش ژنی دووەم بخرێتە سەر ئەو جەستەیە، ناتوانێت ببێتە بەشێك لێی)). راستییەکەی، تەرتولیان لە ئیمانی کاسۆلیکی دوورکەوتووەتەوە و لە ئیمانی مۆنتانییەکان نزیکبووەتەوە، بۆیە جەخت لەوە دەکاتەوە، کە هاوسەرگیریی دووەم مانای کۆکردنەوەی دوو ژنە لە یەك کاتدا، کەواتە حەرامە! ئاشکرایە ئەو بەڵگانەی دەیانهێنێتەوە هەرچییەك بن، ئەنگێزەی گومان و زوهد لەو دیوی وتەکانییەوە هەیە. ئەوەش بە روونی لە نووسینەکانیدا دیارە. ئەوەتا نامەیەکی بۆ ژنەکەی نووسیوە و تیایدا هۆشیاریی ئەوەی پێدەدات، کە ئەگەر ئەو پێش ژنەکەی مرد، شوونەکاتەوە. هەروەها لە نووسینێکی دەربارەی قیامەتیشدا هەمان شت دەبینینەوە، دەڵێت لە رۆژی قیامەتدا ((چیتر ئابڕووچوونی شەهوانیمان بۆ ناگەڕێتەوە و دەست پێناکاتەوە)). لە نامەیەکی تردا دەڵێت: ((با لە هەستەکانمان وردبینەوە و ببینین، ئەو جیاوازییە چیە، کە پیاو کاتێك لە ژنەکەی دادەبڕێت هەستی پێدەکات، با بزانین لە ڕووی رۆحییەوە چەندە چێژ لەوە وەردەگرێت؟!))[١١٤].

تەرتولیان لە سەردەمی خۆیدا، لە ڕووی توانای سەرکۆنەکردن و هێرشکردنە سەر هاوسەرگیریی دووەم کەسێکی ئاوارتە بووە. کڵێساش لەو کاتەدا مەرجی ئەوەی لەسەر مەسیحییەکان دانابوو، کە رەزامەندیی پێشوەخت بۆ ئەو کارە وەربگرن. راستییەکەی، بەرهەڵستکاریی ئەو بۆ هاوسەرگیریی دووەم، کاریگەریی زۆری لەسەر ژیانی خێزان هەبوو. زۆر سەیرە، کە لای نووسەرە مەسیحییەکانی سەدەی دووەم و سێیەم شتێکی ئەوتۆ لەبارەی منداڵەوە نابینین! هیچ شتێك لەبارەی پەروەردەکردن و فێرکردنیانەوە ناوترێت، بڵێی مەسیحییەکانی ئەو کات قەناعەتیان وا بووبێت، کە جیهان بەشی خۆی منداڵی تێدایە؟ و خستنەوەی منداڵی تر مایەی دڵتەنگی دەبێت

نەك دڵخۆشی؟ ڕەنگە ئەو وتەیەی کلیمێنتی ئەسکەندەری، کە باس لە هاواری یەکەمی منداڵ دەکات لە کاتی هاتنە دنیادا، وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە[١١٥].

لای تەرتولیانیش، منداڵ ئەرکێکە هەڵگرتنی ئاسان نییە، بگرە مەترسیدارە بۆ سەر ئیمانیش، دەڵێت: ((چەند پاساوێکی تر بۆ هاوسەرگیریی هەن، کە پیاوان دەیانهێننەوە و پەیوەستن بە باسی منداڵ خستنەوە و نەوەی داهاتوو و چێژی تاڵی هەبوونی منداڵەوە. بەڵام بە بۆچوونی ئێمە، ئەوە کار و قسەگەلێکی بێمانان. بۆچی زۆر حەزمان بە هەبوون و پەروەردەکردنی منداڵە، لە کاتێکدا ئەگەر هەبن خێرا پێش خۆمان دەیاننێرین، بۆ ئەوەی ناوبانگ و شکۆیان بۆ پەیدا بێت (مەبەستم لەو دڵتەنگی یان لەو ئازارەیە، کە وەك شمشێرێك بەسەر سەرمانەوەیە) هەر چەندە زۆرمان پێ خۆشە ــ وەك چۆن بۆ خۆیشمان پێمان خۆشە ــ کە لەم دنیایە دەریانبکەین و بگەڕێنەوە بۆ لای خودا؟[١١٦] هەروەها دەڵێت: با بڵێین ئەرکی قورسی هەبوونی منداڵ بۆ بەرژەوەندیی باوکە، ئەگەر پیاو بە حوکمی یاسا ناچار بوو منداڵی هەبێت، بەڵام هیچ پیاوێکی ئاقڵی مەسیحی بە ویستی خۆی بێت ئارەزووی هەبوونی منداڵ ناکات. بە ڕاستی پیاوی مەسیحی بە دوای میراتگرێکدا دەگەڕێت، کە وەك خۆی لە هەموو خۆشییەکانی دونیا بێبەش بێت)[١١٧].

## ٤- پاکیزە و بێوەژنەکان:

کڵێسا لە سەردەمی تەرتولیاندا، پاکیزەکانی هەڵدەبژارد تا تیایدا خزمەت بکەن و ناوی ((بێوەژن))ی لێنابوون. ئەو سیستەمەش لە ناوەڕاستی سەدەی سێیەمی زاییینیدا لە هەموو کڵێساکانی ڕۆژهەڵاتدا کاری پێکراوە. لەو کاتەشدا ژیانی بێوەژن کەوتە ((بازاڕی ڕۆح))ەوە و گرنگیی پاکیزەیی بەدەرکەوت. هەر چەندە هەڵە نەبوو ئەگەر بێوەژن هاوسەرگیریی بکردایە، بەڵام ئەو کارەی وەك خاڵێکی لاوازی و کۆنترۆڵ نەکردنی نەفس لێکدەدرایەوە، دوا جار وەهاش بەسەریدا دەشکایەوە، کە نەتوانێت خزمەتی کڵێسا بکات. بەڵام پاکیزەکان، کڵێسا کارکردنی ئەوانی پێ خۆشبوو، بە حوکمی ئەوەی ئەوان هاوسەرگیرییان لەگەڵ مەسیح کردووە و هەموو دونیایان

تەڵاقداوە، یان شەهوەتەکانیان مراندووە، یان وەك ئەوەی بە ڕاستی بێوەژن کەوتبێتن، بۆیە کلێساش ئەو ناوەی لێنابوون. بەڵام تەرتولیان ئەو بۆچوونەی پێ قبووڵ نەبوو، هاتن و خزمەتکردنی ژنی لە کلێسادا رەتدەکردەوە، ئەگەر کلێساش ناچارە بە هاتنیان رازی بێت، پێویستە لە بەرتەسکترین بواردا بێت، وەك ئەوەی پاش کەمێك زیاتری لەبارەوە دەزانین.

تەرتولیان دەڵێت: ((باش دەزانم، کە لە جێگەیەکدا پاکیزەیەك هەیە تەمەنی لە بیست ساڵ کەمترە و لە ریزی بێوەژنان دادەنرێت)) بە توندیش دژی ئەم رێگە نوێیە داهێنراوە دەوەستێتەوە، پاشان دەبینین ((پاکیزە بێوەژنەکان)) بەوە تۆمەتبار دەکات، کە ((پاکیزەی لادەر)) یان رەفتار نەشیاون.

بۆ کارکردن ناشێن، چونکە لە ژیانی هاوسەریدا، لە پەروەردەکردنی منداڵ و لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەوانی تریشدا ئەزموونیان نییە [١١٨].

کەچی لەو رۆژانەدا تا دەهات ریزی پاکیزەیی زیاتر دەبوو، دۆخەکەش زیاتر بە لای سیستەمە نوێیەکەدا دەشکایەوە. تا کۆتایی سەدەی دووەم، شوێنی گشتی بۆ خواپەرستیی مەسیحییەکان نەبوو، پەرستگایان نەبوو، مەسیحییەکان لە ماڵەکاندا یەکتریان دەبینی و کۆدەبوونەوە، هەر خۆشیان، یان خاوەن ماڵەکان هەموو رێوشوێنە پێویستەکانی کۆبوونەوەکەیان ئامادە دەکرد.

بەڵام کاتێك دروست کردنی کلێساکان دەستیپێکرد، فەرمانبەرە رەسمییەکان دەستیانکرد بە چاودێری و پاراستنیان، بۆ ئەو مەبەستەش کۆمەڵێك خزمەتکار (الشماس)[١١٩] دیاریکران. کلێسا کۆمەڵێك رێوشوێنی تایبەتی بە نوێژکەرەکان دانابوو، ژنان لە دەرگای تایبەت بە خۆیانەوە دەهاتنە ژوورەوە و لە پیاوان جیادەبوونەوە، لەبەر دەرگای تایبەت بە ژنانیشدا خزمەتکارێکی ژن دەوەستا، تا رێنوێنیی ژنان بکات بۆ جێگەکانیان و دڵنیابوون لەوەی هەمووان بە هێمنی و رێزەوە دێنە ژوورەوە. ئەوەش ئەو کارە گەورەیە بوو، کە ژنان لە کلێسادا پێی هەڵدەستان. وردە وردە بوو بە تاکە کاریان لە کلێسادا، بەڵام لە راپەڕاندنی کارەکانیاندا یارمەتیی

خزمەتکارە پیاوەکانیشیان دەدا، بە تایبەتی لەو کارانەی بۆ ژنان گونجاو بوون، بۆ نموونە لە پرۆسەی شۆردنەوە(تعمد)ی منالاَندا، کلێسا رای وابوو، کە پێویست ناکات پیاوان بە هەموو ئامادەکارییەکانی ئەو ئاهەنگە هەستن، بۆیە ئەنجامدانی ئەو کارە سادانەیان دابوو بە خزمەتکارە ژنەکان، وەکو داکەندنی جلی منداڵەکە و ئامادەکردنی بۆ شۆردنەوە و پاشان دووبارە لەبەرکردنەوەی جلەکانی. هەمان شت بۆ شۆردنەوەی گەورەکانیش بڕیاری لێدرا، لە کاتێك خزمەتکارەکە بە رۆن تەنیا ناوچەوانی ژنە مەسیحییەکانی دەشۆردەوە، خزمەتکارە ژنەکان پاشماوەی جەستەی ژنەکانیان دەشۆرد[120]. هاوکات بە هەندێك کاری بێوەژنانیش هەڵدەستان، وەکو گەیاندنی چەند پەیام و پێویستییەك بە ژنە هەژارەکان. بەڵام خزمەتکارە ژنەکان بە ئەرکێکی رۆحی هەڵدەستان، بۆیە بۆیان نەبوو وەعز بدەن و فێربکەن، هەروەها بۆ ئەوە بوو، کە بێوەژنان بیریان بەتاڵ بێت و خۆیان بۆ نوێژ تەرخان بکەن. بۆیان نەبوو وەڵامی هیچ پرسیارێك لەبارەی ئیمان و زیندووبوونەوە و ئومێدبوون بە خودا و...هتد بدەنەوە.

کەچی تەرتولیان، خزمەتکارە ژنەکان لە هەستان بە پرۆسەی شۆردنەوە بە تەواوی بێبەش دەکات، کاتێك تاوتوێی ریزبەندیی شۆردنەوە دەکات پێی وایە، کە ئوسقوف پێش هەر کەسێکی تر مافی ئەنجامدانی ئەو ئەرکەی هەیە، دوای ئەویش قەشە و کاهین، پاشان شێخی کلێسا و ئینجا خزمەتکاری پیاو، ئەگەر هیچ کام لەوانە دەست نەکەوتن، با رێبوارێك یان پیاوێکی سەر جادە ئەو کارە بکات، بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا نابێت ژنێك بەو کارە هەستێت!

تەرتولیان لەو حەرامکردنەیدا پشت بە قەشە پۆڵس دەبەستێت، دەڵێت: ((چۆن باوەڕ بکەین، کە ئەو کەسەی تەنانەت فێرکردنیشی لە ژنان حەرامکردووە(مەبەستی پۆڵسە) بێت و دەسەڵاتی شۆردنەوە بە ژنان بدات، با ژنەکانتان بێدەنگ بن و لە ماڵەوە راوێژ بە مێردەکانیان بکەن..))[121].

ئەوەی سەیرە، ئەم نەریتە لە کڵێسای رۆژهەڵاتییەوە گواسترایەوە بۆ کڵێساکانی رۆژئاوا، ئەوانیش هیچ ئەرکێکی کلێرکییان بە ژن نەدابوو، هەمیشە لەسەر ئەو بنچینەیە سەیری ژنیان دەکرد، کە پلەیەك لە پیاو کەمتر بوو، شەرمەزاریی بوو بۆ پیاو، کە هیچ جۆرە فێرکردن و تەمبێکردن و رێنوێنییەك، یان تەنانەت بەرەکەتی کڵێساش لە ژنەوە وەربگرێت!

## تەرتولیان و مۆنتانیزم:

دەمانەوێت ئەم باسەمان لەسەر تەرتولیان بە باسکردنی پەیوەندیی لەگەڵ رێبازی مۆنتانیزمدا کۆتایی پێ بهێنین، جا با بزانین ئەو رێبازە چییە؟

مۆنتانیزم رێبازێکی دینیی مەسیحییە، لە نیوەی دووەمی سەدەی دووەمی زایینی (لە نێوان ١٥٦ ــ ١٥٧) لە شارێکی بچووك بە ناوی تیمیۆن لە فریجیا لە ئاسیای بچووك سەریهەڵدا، هەر چەندە چەند توێژەرێك پێیان وایە، کە ماوەیەك دوای ئەوە (ساڵی ١٧١ز) و لەسەر دەستی کاهینێك بە ناوی (مۆنتانۆس) سەریهەڵداوە. گوایە بانگەشەی ئەوەی کردووە، کە ئەو دەنگی رۆحی پیرۆزە و پێشگۆیی ئەوەی کردووە، لە ماوەیەکی نزیکدا مەسیح بگەڕێتەوە سەر زەوی. لەو پێناوەشدا خەڵکی بانگ دەکرد بۆ تەوبە و رۆژووگرتن و شەهیدبوون و خۆگرتنەوە لە هاوسەرگیریی. مۆنتانیزم لە ئاسیای بچووکدا ناو و ناوبانگی خۆی پاراست، تا کاتێك ئیمپراتۆر جۆستنیانی یەکەم (٤٨٣ ــ ٥٦٥) لە سەدەی شەشەمی زایینیدا یاسایەکی توندی لە دژ دەرکرد[١٢٢].

کەواتە ئەو رێبازە لە سەردەمی تەرتولیاندا سەریهەڵداوە، ئەویش لە سەردەمی گەنجێتیدا چووتە ریزەکانییەوە:

وەك سەرەتا ئەو رێبازە رۆڵێکی زۆر و بەرچاوی لە پشتیوانی کردن لە پرسی ژنان لە فریجیادا هەبوو، دواتریش گواستییەوە بۆ هەریەکە لە سوریا، میسر، باکووری ئەفریقیا، ئیتاڵیا، ئیسپانیا و وڵاتی گال. کەسانێك ئەو بڵاوبوونە

خێرایەی ڕێبازی ناوبراو دەگەڕێننەوە بۆ کەمیی گڕوتینی مەسیحییەکان لەو کاتەدا[١٢٣].

سەبارەت بە دۆزی ژنان، هەڵوێستی ڕێبازەکە تارادەیەك نامۆ بوو، سوپاسی حەوای دەکرد، چونکە یەکەم کەس بوو، کە لە داری مەعریفەی خوارد. هەروەها بە باڵای مریەمی خوشکی موسا و چوار کچەکەی فیلیپسدا هەڵیدەدا، چونکە جەختیان لە مافی ژن لە پەیامبەرێتیدا، واتە لە گەیاندنی پەیامی خودا بە خەڵکی، دەکردەوە. هەمیشە لە کڵێساکانی ئەو ڕێبازەدا حەوت پاکیزە هەبوون، کە جلی سپییان دەپۆشی و مەشخەڵیان هەڵدەگرت، بە شێوەیەکی زۆر کاریگەر لەگەڵ ژنان دەدوان، بە ڕادەیەك فرمێسکی تەوبە و پەشیمانی بە سەر گۆنای گوێگراندا جۆگەلەی دەبەست. جگە لەوەش، ژنان لەو ڕێبازەدا پۆستی دینیی باڵایان وەرگرت، ئوسقوف و شێخی کڵێسا و قەشە و خزمەتکاریان تێدا هەڵکەوتبوو، ڕێك وەکو پیاوان، لەوەشدا پشتیان بە وتەیەکی قەشە پۆڵس دەبەست، کە تیایدا دەڵێت: ((لە بڕواهێنان بە یەسوعی مەسیح، نێر و مێ جیاوازییان نییە!)) بە جۆرێك ئەو وتەیەیان ڕاڤەکرد، کە مەبەستی یەکسانیی تەواوی ژن و پیاو بێت، نەك تەنیا باسی ((ئیمان)) بێت.

زۆری نەبرد تەرتولیان وازی لەو ڕێبازە هێنا و دوورکەوتەوە، گروپێکی تایبەت بە خۆی پێکهێنا، هەڵمەتێکی توندی کردە سەر فیکرە سەرەکییەکانی ئەو ڕێبازە، بە تایبەتی دەربارەی ژن، دەڵێت: ((چەند بێ ئابڕوو و حەیاچوون ئەو ژنە بێباوەڕانە! کە وێراویانە فێربکەن و مشتومڕ و گفتوگۆ بکەن و نوێژ و سرود و وتارەکانیان خوێندووەتەوە، هەموو ئەوانەش ناحەقین دەرهەق بە خودا، پێدەچێت بە ئەرکی شۆردنەوەش هەستابن...!

ئەگەر لە کۆتایی قسەکانماندا دەربارەی تەرتولیان، لە هەڵوێستی ئەو لە فەلسەفە بپرسین، دەبینین بە پێچەوانەی کلیمێنتی ئەسکەندەرییەوە، فەلسەفەی بە دوژمنی دین زانیوە، بۆیە هەڵمەتێکی زۆر توندی کردووەتە سەر، یەکەم

فەیلەسوفی دیاری مەسیحیش بوو بە لاتینی بنووسیت، رقێکی زۆری لە بتپەرستی و زانستی بتپەرستانە هەبوو، دەیپرسی پەیوەندیی هاوبەش چییە لە نێوان فەیلەسوف و پیاوی مەسیحی، لە نێوان خوێندکاری یۆنان و دۆستی هەڵە لەگەڵ کوڕی ئاسمان و دوژمنی هەڵە و دۆستی راستەقینەدا؟

هیچ شتێکی هاوبەشیان پێکەوە نییە[١٢٤]: ((پەیوەندیی چییە لە نێوان ئەسینا و ئۆرشەلیم، لە نێوان ئەکادیمیا و کڵێسا، لە نێوان بێباوەڕ و باوەڕداراندا، هیچ! ئێمە لەو کەسانە بێبەرین، کە مەسیحییەتێکی ریواقی یان ئەفلاتونی یان مەشائییان داهێناوە، دوای مەسیح و ئینجیلەکان پێویستمان بە هیچ نییە!)) تەنانەت حیکمەتی سوکرات هیچ بەهایەکی نابێت، تا کاتێك، کە کەس نەتوانێت بەبێ مەسیح خودا و بەبێ رۆحی پیرۆزیش مەسیح بناسێت. سەرەڕای ئەوانەش سوکرات ــ وەك خۆی دانی پیاناوە ــ شەیتان رێبەریی کردووە! هەرچی ئەفلاتونیشە ــ بە بۆچوونی تەرتولیان ــ دانی بەوەدا ناوە، کە گەیشتن بە دروست کەری گەردون (Demiorgos) ئاسان نییە، لە کاتێکدا سادەترین پیاوی مەسیحی پێی گەیشتووە[١٢٥]. ئەرەستۆی ((بەدبەخت))یش، دەتوانی لۆژیکەکەی لە رووخاندن و بنیاتنانیشدا بەکاربهێنیت! سەرباری ئەوانەش، فەیلەسوفە یۆنانییەکان باوکی بێباوەڕانن. تیۆرە ئەخلاقییەکانیان و زۆربەی بیروباوەڕەکانیان لە سەردەمی کەونارای کتێبی پیرۆزەوە وەرگرتووە، پاشان شێواندویانن و کردویانن بە هی خۆیان! بۆیە پشتبەستن بە نووسینی فەیلەسوفان و هەڵهێنجانی بەڵگە لێیانەوە میتۆدێکی نەزۆکە. هەر بەو هۆیەوە تەرتولیان میتۆدێکی نوێ دێنێتە ئاراوە، کە میتۆدی بەدەنگهێنانی نەفسە. لە کتێبی ((دەربارەی نەفس))یشدا ئەوە دەخاتەڕوو، کە نەفس بە سروشتی خۆی مەیلی لە دینە، بە تایبەتی لە سەروەختی ناخۆشی و بێتاقەتیدا، ئەو کات ئەو هەستە دینییانە سەردەردێنن، کە خودا نەفسی لەسەر خولقاندوون. هەر بۆیە تەرتولیان، زیاتر پشت بە هەست و سۆز دەبەستێت، نەك بە ئەقڵ، جا ئایا دوای ئەوە دەشێت

پێمان سەیر بێت، ئەگەر ببینین میتۆدێکی بنیاتناوە، کە لەسەر بڕواهێنان بە مەحاڵ و عەبەس و پارادۆکس و ناماقوڵ بەندە؟ چونکە ئەو خاوەنی ئەو بنەما ناوادارەیە، کە باوەڕدەهێنم چونکە مەحاڵ و عەبەسە، یان بە دەربڕێنێکی تر باوەڕدەهێنم، چونکە مەحاڵە.

## سێیەم: قەشە جیرۆم (٣٤٥ ـ ٤٢٠)
## St. Jerome

یەکێکە لە گەورەترین فەیلەسوف و لاهوتییەکانی کڵێسای مەسیحی لە سەردەمە بەراییەکانیدا، بێرتراند رەسڵ دەڵێت، یەکێکە لەو چوار پیاوەی پێیان دەوترێت ((مامۆستایانی کڵێسای رۆژئاوایی))[١٢٦].

### ١- ژیانی:

جیرۆم ساڵی **٣٤٥** لە شاری سترایدۆن، کە زۆر دوور نییە لە شاری ئەکویلیا لە ناوەڕاستی ئیتاڵیا، لەدایکبووە. ساڵی **٣٧٧** سترایدۆن لە لایەن قووتەکانەوە خاپورکرا. خێزانی جیرۆم حاڵیان باش بوو، بەڵام دەوڵەمەند نەبوون. ساڵی **٣٦٣** چووە رۆما، لەوێش رەوانبێژیی خوێند و گوناهیشی ئەنجامدا، پاش ئەوەی بە وڵاتی گالدا گەڕا، لە ئەکویلیا گیرسایەوە و بوو بە زاهید، پێنج ساڵی دواتری تەمەنی وەك راهیب لە بیابانی سوریا بەسەر برد، پەشیمانییەکی توند لەو گوناهانەی ئەنجامیدابوون تەنیبووی، ژیانی فرمێسك و ئازار بوو، کە چێژی رۆحییان بەدوادا هات، جاروبار ژیانی گوناهبارانە و چاوبەستانەی رۆمای بیردەکەوتەوە. بۆیە لە ئەشکەوتێکدا ژیا، خۆی خۆراکی کۆدەکردەوە و جلێکی لە مووی وشتر پۆشی، دوای ئەو ماوەیەش گەشتی بەرەو قوستەنتینیە کرد و سێ ساڵ لە رۆما نیشتەجێبوو، لەوێ بووە هاوڕێی پاپا داماسوس، هەر ئەویش هانیدا کتێبی پیرۆز بۆ سەر زمانی لاتینی وەربگێڕێت. لە کاتی مانەوەیدا لە رۆما، پەیوەندیی بە زۆر ژنەوە کرد، کە تێکەڵەیەك بوون لە ئەرستۆکرات و خواپەرست، توانی هەندێکیان بخاتە سەر رێگەی زوهد، پاپای نوێش ئەم رێبازە نوێیەی جیرۆمی پێ خۆشنەبوو (بە هۆی مردنی داماسوسەوە کێشەی

لەگەڵ پاپای نوێدا بۆ دروست بوو) زۆرێك لە خەڵكی رۆماش لەگەڵ پاپادا رقیان لەو کارەی جیرۆم دەهاتەوە.

### ٢- جیرۆم و ژن:

هەندێك لە توێژەران پێیان وایە قەشە جیرۆم، کە سێیەم گەورەترین بیرمەندی ئەو سەردەمەیە، ئەگەر بە هەر یەکێك لە باوکانی تری کڵێسە بەراورد بکرێت، لە زۆر لایەنەوە مامەڵەیەکی نەرم و ناسکانەتری لەگەل ژندا کردووە. کاتێك وانەی پێدەوتنەوە، هەستی بە خۆشییەکی زۆر دەکرد، تەنانەت لە کاتی مانەوەیدا لە رۆما ژمارەیەکی بەرچاوی ژنی لە دەوری خۆی کۆکردەوە، کە بە جۆرێك ژیانی ئەرستۆکراتیانە و خواپەرستانەیان تێکەڵکردبوو[١٢٧]. لەو کاتانەشدا کتێبی پیرۆزی بۆ لێکدەدانەوە، بەرەو زوهد هانیدەدان، لە ناو ئەوانەشدا، کە توانی هیدایەتیان بدات مارسێلا و پاولان، کە بێوەژن بوون، لەگەڵ دوو کچی پاولا بە ناوەکانی بلایزێلا و یوستۆخیوم[١٢٨].

دیاردەی ژنانی رۆشنبیر لە سەردەمی قەشە جیرۆمدا باو و بەرچاو بوو، دەتوانین لە رێگەی چەند وشەیەکی سادەوە، کە جیرۆم بۆی ناردوون، لەو یارمەتییە زانستییەی پاولا و کچەکەی لە خەڵوەتی فەلسەفیی خۆیاندا پێشکەشی ناوبراویان کردووە، تێبگەین: ((ئێوە لە ئەدەبی عیبریدا شارەزان، دەتوانن حوکم بە سەر راستی و دروست یی دەقێکی وەرگێڕاودا بدەن، وشە بە وشە بەم وەرگێڕانەدا بچنەوە(دەقەکەش سفری ئەستیر بوو) بۆ ئەوەی دڵنیابین لەوەی من هیچم لە دەقە ئەسڵییەکە زیاد و کەم نەکردووە، هەروەها بۆ دڵنیابوون لە توانای من لە گواستنەوەی راست و دەستپاکانەی ئەم دەقە عیبرییە بۆ سەر زمانی لاتینی..))[١٢٩]. بەو شێوەیە، رۆژ دوای رۆژ و بە یارمەتیی ژنان دەقی بەناوبانگی لاتینیی تەورات، کە بە ڤولگات ناسراوە، لەدایکبوو.

پێویستە باش ئاگامان لەو دۆخە بێت، بێگومان قەشە جیرۆم بە توندیی بەرگریی لە پەیوەندییە دۆستانەییەکانی لەگەڵ ژناندا دەکرد، لەسەر بنەمای ئەوەی، شتێکی خراپ نابێت، ئەگەر مرۆڤ پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ ئەو رەگەزەدا هەبێت، کە مریەمی پاکیزەی لێوە کەوتووەتەوە. چونکە هەرچی بێت ((پەیوەندییەکی ئەفلاتونیی)) بێگوناهە، ژن لە هەر شتێك پەیوەندیی بە مێینە بوونییەوە هەبێت، دادەبڕێت: نە سۆز، نە غەریزە، نە جەستە، نە ژن و مێردایەتی و نە دایك و...هتد[١٣٠] بوونی هەیە. پاپای نوێی رۆماش رقی لەو رێبازە نوێیەی جیرۆم بوو، زۆرێك لە خەڵکی رۆماش هاوشێوەی پاپا رقیان لێدەبووەوە. لە کاتێکدا ئەو رێبازە شایەنی ((تێڕامان))ە!

بە هەرحاڵ، جیرۆم لە هێرش کردنە سەر جەستە و تەنانەت خودی هاوسەرگیریش، بەردەوام بوو. تەنانەت جارێکیان هێرشێکی توندی کردە سەر کەسێك بە ناوی هێلڤیدیوس، چونکە ئاماژەدانی کتێبی پیرۆزی بە برایانی مەسیح بە جدی وەرگرتبوو[١٣١]، لەو ئاماژەیەشەوە گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی، مەریەم پاش لەدایکبوونی پاکیزەییانەی حەزرەتی مەسیح، سێکسی لەگەڵ یوسفی دارتاشدا کردووە. لەوێدا قەشە جیرۆم هێرشێکی توندی کردە سەر ئەو ناحەقییە و لە رەخنەیدا بۆ سەر ئەو پیاوە گوتی: ((تۆ پیرۆزیی رۆحی پیرۆزت پێشێلکردووە، بەوەی ویستوتە بیکەیتە گروپێك لە چوار برا و ژمارەیەك خوشکیش)). جیرۆم رقی لەوە بوو، تەنانەت وەك خانمێکی ئاسایی بیر لە حەزرەتی مەریەم بکرێتەوە، کە لە خۆشویستنی مێردەکەی و بەخێوکردنی منداڵەکانیدا رێچکەی هەر ژنێکی ئاسایی تر بگرێت[١٣٢].

قەشە جیرۆم هیچ شتێکی سەرنجڕاکێشی لە دایکایەتیدا نەدەبینییەوە، بگرە ژنی سکپڕی بە دیمەنێکی قێزەون دەهاتە پێش چاو، نەیدەتوانی بیانوویەك بۆ حەزی زۆری مرۆڤ لە وەچەخستنەوە بدۆزێتەوە: ((چی وات لێدەکات زۆر حەزت لە منداڵێکی بێزارکەر بێت، کە بەسەر سنگتدا گاوڵکێ بکات و پیسایی بە سەر و ملتدا

بکات؟)). ئەو جوانیی ژنی لە بیّ خەوشیی و پاکێتیدا دەویت، بیّ ئەوەی هیچ شتیّك لەکەداری کردبیّت.

ئامۆژگاریی هاوڕیّ ژنەکانی دەکات، کە ئەگەر بۆیان نەلوا بچنە کلّیسا و دیّرەکانەوە، با بە پاکیزەیی لە مالّەکانی خۆیاندا بژین، تەنانەت زۆری نامیّنیّت جیرۆم، هاوسەرگیریی بە گوناه لە قەلّەم بدات و دەلّیّت: ((من مەدحی هاوسەرگیریی ناکەم، تەنیا لەبەر ئەوە نەبیّت، کە پاکیزەکانم بۆ دەهیّنیّت)) و دەیەویّت: ((بە تەوری کچیّنیی، داری هاوسەرگیریی ببڕیّتەوە)) و پۆلّسی هەرزەکاری لە بوتروس، کە هاوسەرگیریی کردبوو، زیاتر خۆشدەویست. خۆشترین نامەی، ئەو نامەیەتی، کە دەربارەی چیّژی کچیّنی بۆ یوستۆخیومی نووسیوە. لە نامەکەیدا دەلّیّت، کە ئەو دژی هاسەرگیریی نییە، بەلاّم ئەوانەی خۆیانی لیّ بە دوور دەگرن، لە راستیدا خۆیان لە ئازاری سکپڕبوون و قیژە و هاواری مندالّ و ماندوێتیی مالّ و ئازاری ئیرەیی کردن بە دوور دەگرن، دان بەوەشدا دەنیّت، کە ریّگەی داویّنپاکیش ئاسان نییە، باجی داویّنپاکیش وریایی هەمیشەییە.

پیّدەچیّت تاکە بیرۆکەیەك بەس بیّت بۆ لە دەستدانی کچیّنی... با هاوڕیّیانت ئەوانە بن، کە روخساریان زەرد هەلّگەڕاوە و جەستەیان بە هۆی رۆژووگرتنەوە لاواز بووە. با دەنگت هەموو رۆژیّك تازە ببیّتەوە، جیّگە خەوەکەت بشۆ، هەموو شەویّك سەرینەکەت بە فرمیّسك تەڕ بکە. با دوورەپەریّزیت لە ژوورەکەتدا پاسەوانی هەمیشەییت بیّت، تەنیا ریّگە بە خودا بدە تا تیایدا یاریت لەگەلّ بکات. ئەگەر خەوت لیّکەوت، لە پشتەوەی دیوارەکەوە بۆت دیّت، لە دەرگاکەوە دەستت بۆ دریّژ دەکات، خەبەرت دەبیّتەوە، لەسەر پیّ دەوەستیت و بانگی دەکەیت ((خۆشەویستیت شکۆیە بۆم)) گویّت لیّیە دەلّیّت، خوشکە خۆشەویستەکەم بەهەشتیّکی داخراو و کانییەکی کراوە و سەرچاوەیەکی سەرمۆرە...)).

جیرۆم دەلّیّت، کاتیّك ئەو نامەیەی بلاّوکردەوە: ((خەلّکی بە بەردبارانکردن وەلاّمیان دایەوە)) و رەنگە هەندیّك لە خویّنەران، لەو ئامۆژگارییانەدا هەستیان بە

جۆش و خرۆشێکی شاراوه له پیاوێکدا کردبێت، که هێشتا نەیتوانیوه خۆی له گەرمیی شەهوەتەکان پاك بکاتەوه.

کاتێك بلایزێلا چەند مانگێك دوای ئەوه له ساڵی ٣٨٤دا کۆچی دوایی کرد، جیرۆم ساڵی دواتر رۆمای بە جێهێشت و هەرگیز نەگەڕایەوه بۆی.

ئەگەر قەشه جیرۆم بایەخێکی تایبەتی به هەندێك له ژنان دابێت، ئەوه لەسەر حسابی ژنان به شێوەیەکی گشتی و رق هاتنەوەی بووه له گرنگترین وەزیفەی بایۆلۆژیی ژن، بۆیه بەو رادەیه رقی له رەگەزی مێ بووه!

ئەوەی سەیره، قەشه جیرۆم هێرشی کردووەته سەر خودی بیرۆکەی هاوسەرگیریش، چەند نامەیەکی بۆ یوستۆخیوم نووسیوه، هێنده سەیرن پێویسته لەسەریان رابوەستین، تیایدا ئامۆژگاریی دەکات کچێنیی خۆی بپارێزێت، ئامۆژگارییەکانیشی هەر زۆر راشکاوانه و وردەکارن. تەنانەت زۆر به وردەکارییەوه راڤەیەکی بایۆلۆژی و توێکارییانه بۆ چەند دەستەواژەیەکی ((سەردەمی کەونارا)) لەو بارەیەوه دەکات، که تەنیا ئاماژەی پێداون و وردەکارییان تێدا نەکراوه! دەبینی له پیاهەڵدانی خۆشییەکانی ژیانی ناو دێرەکان، هانا بۆ جۆرێك له سۆفیگەریی غەزەلی دەبات، که وەك دەروونناسی دەڵێت جۆرێکه له قەرەبووکردنەوه: راهیبه بووکی مەسیحه، له (نشید الانشاد)یشدا زۆر بەسەر ئەم هاوسەرگیرییەدا هەڵدراوه، ئەوەتا جیرۆم نامەیەك بۆ یوستۆخیومی پاکیزه دەنووسیت، داوای لێدەکات لەسەر رەبەنیی بەردەوام بێت، چونکه له داهاتودا شوو به مەسیح دەکات، پێی دەڵێت:

((هەمیشه وریای ئەوه به، که له ژوورەکەتدا حورمەتێك هەبێت پاسەوانیت بکات، هەمیشه وریای ئەوه به، که (زاوا) له ژوورەکەتدا دەستبازیت لەگەڵدا بکات. تۆ نوێژ دەکەیت؟ چونکه له نوێژکردندا لەگەڵ (زاوا)دا دەدوێی. دەخوێنێتەوه؟ چونکه له خوێندنەوەدا دێت و قسەت لەگەڵ دەکات. ئەگەر خەوت بێت، له پشتەوه دێت و له کونی دەرگاکەوه دەستت بۆ درێژ دەکات. ئەو کات دڵت دەلەرزێت، خەبەرت دەبێتەوه و هەڵدەستیت و دەڵێیت ((له خۆشەویستیدا سەرگەرمم)) ئەو کات له

وەڵامدا پێت دەڵێت: بێستانێکی پەرژیندار وەکو خوشك و بووکم وایە، کانییەکی پارێزراوە لەم ژوورەدا، نافوورەیەکی سەرمۆرە!)) جگە لەوەش، قەشە جیرۆم نامەیەك بۆ دایکی دەنووسیت و تیایدا پاساوی ئەوە دەهێنێتەوە، کە بۆچی هانی خوشکەکەی داوە بۆ ئەوەی هاوسەرگیریی رەت بکاتەوە، داواشی لێدەکات بەو کارە دڵخۆش بێت: ((تۆ لە کچەکەت تورەیت، چونکە لەبریی ئەوەی ببێتە ژنی یەکێك لە سەربازەکان، هاوسەرگیریی لەگەڵ پاشا(مەسیح)دا هەڵبژاردووە؟ ئیمتیازێکی زۆر گەورەت دەستگیر بووە، چونکە تۆ ئێستا بوویت بە خەسووی مەسیح...))[١٣٣].

راستییەکەی، هەڵوێستی قەشە جیرۆم دەربارەی ژن توێژەر زۆر ماندوو دەکات، چونکە هەست دەکەیت خۆشەویستییەکی قووڵی بۆی هەیە، بەڵام ئەو خۆشەویستییە گۆڕاوە بۆ رق، بۆیە ویستویەتی ژن لە مێینەیی خۆی دابماڵێت و هەموو پەیوەندییەك، کە مێینە بوونی بیردەخاتەوە، لیێ حەرام بکات. کەچی هەندێ جاری تر هەست دەکەین لە ململانێیەکی توندی نێوان لایەنە دونیایی و لایەنە رۆحییەکەدا دەژی، ئەوەتا لە ژنە ئەرستۆکراتییە جوانەکان و کچی ئەشرافەکان نزیك دەبێتەوە، یوستۆخیوم و پاولای دایکی لە گەشتە دوور و ماندووکەرەکەی خۆی بەرەو بەیت لەحم لەگەڵ خۆی دەبات، کاتێکیش پاولا مرد، لە بەیت لەحم بە خاکی سپارد و دێڕە شیعرێکی نووسیوە تا لەسەر گۆڕەکەی دابنرێت:

کچەکەی سیپیۆ[١٣٤] لێرەدا بە خاکسپێردراوە

ئەو لە نەوەی خێزانی پۆڵسە، کە ناوبانگیان بە هەموو لایەکدا رۆیشتووە

پەلکێکە لە بنەماڵەی رەسەنی گراتشی، یەکەمین نەوەی ئەگامەمنونە، گەوهەرێکی درەوشاوەیە

لێرەدا خاتوو پاولا بە خاك سپێردراوە، کە باوکی زۆر زۆری خۆشویستووە

یوستۆخیومی کچیشی یەکەمین خانمی رۆمانە، کە رێگەی قورسی ئیمانی هەڵبژاردووە، لە پێناوی مەسیحدا بەرەو بەیت لەحم هاتووە

وەك بەڵگەیەك بۆ ئەو ململانێ ناخەکییەی، دەتوانین ئەو نووسینانەی تیایاندا، باسی دان بە خۆداگرتن و رەنجکێشان و ئازارچەشتنی خۆی دەکات، وەك نموونە بهێنینەوە. ئەوەتا بە ڕۆژوو دەبێت و واز لە خواردنی خۆش دەهێنێت، دواتر دێت و شیشیرۆن دەخوێنێتەوە، پاش چەندین شەو و رۆژ لە سەرزەنشتکردنی ویژدانی خۆیدا، دیسان تێدەکەوێتەوە، پلوتۆسی نووسەری شانۆیی کۆمیدیی یۆنانی دەخوێنێتەوە، دوای ئەو خوێندنەوەیەش شێوازی پەیامبەران بە ناشیرین دەبینێت، لە دواییشدا لە خەودا دەبینێت، مەسیح لە رۆژی قیامەتدا پرسیاری ئەوەی لێدەکات، کە چییە؟ ئەویش لە وەڵامیدا دەڵێت مەسیحییە، مەسیحیش لە وەڵامدا پێی دەڵێت: ((درۆ دەکەیت، تۆ شوێنکەوتەی شیشیرۆنی نەك مەسیح)) دوای ئەوە فەرمان دەدات شەلاقی لێبدرێت، لە کۆتاییدا جیرۆم خەبەری دەبێتەوە و دەڵێت: ((گەورەم، ئەگەر لەمەولا کتێبی دونیاییم لای خۆم هێشتەوە، یان ئەگەر لەمەولا ئەو کتێبانەم خوێندەوە، مانای نکولّیکردنم بێت لە تۆ)) پاشان دەڵێت: ((ئەوە خەوەنوتکە نەبوو، خەوێکی بەتاڵیش نەبوو)) [١٣٥].

کەواتە ئاشکرایە، قەشە جیرۆم ئەم ململانێ دونیایی و رۆحییەی هەبووە، هاوکات خۆشەویستیی بۆ ژن و رقی زۆری لە سێکس، وای لێکردبوو بە شان و باڵی پاکیزەیی و کچێتیدا هەڵبدات، بە زمانێکی توند و رەق هێرش بکاتە سەر هاوسەرگیریی و پیاوان لە توانای هەڵخەڵەتاندنی ژنان ئاگادار بکاتەوە! خۆیشی زۆر بە باشی دەیزانی، ئەو کاتەی لە بیابانی سوریا ژیانی راهیبانە دەژیا، خەیاڵی ئەو ژنانەی بە مێشکیدا دەهاتن ماندوویان کردبوو، زۆر جار بە دەست خەیاڵی ئەو کچانەی سەرقاڵی سەماکردنن پارە ـــ پارە بووە [١٣٦]. بۆیە هۆشیاریی دەداتە راهیب، کە نابێت رێگە بە ژنێك بدات بێتە ژوورەوە بۆ لای، یان بە تەنیا لە جێگەیەکی دوورە دەست لەگەڵی دابنیشێت [١٣٧]، پێی دەڵێت:

((باش بزانە، کە تۆ ناتوانی لە پەیامبەر داود ئیماندارتر، یان لە سلێمان داناتر بیت، هەمیشە لە یادت بێت، کە تاکە ژنێك پیاوەکەی لە بەهەشت بە دەرکردن دا، بەو هۆیەشەوە ئادەم ئەو بەهەشتەی خودا پێی بەخشیبوو، لەدەستدا!)).

دەتوانین بڵێین قەشە جیرۆم، زۆر جار کەرتبوونێکی سەیری کەسایەتیی تێدا دەردەکەوێت: لە لایەکەوە پیزانین و سەرسامییەکی زۆر بە پاکیزە و بێوەژنان نیشاندەدا، بەو مەرجەی هاوسەرگیری رەت بکەنەوە (واتە لایەنی مێینەیی خۆیان دابمرکێننەوە)، هەر چەندە دوا جار ئەوان ژنن، بەڵام بە بۆچوونی قەشە جیرۆم هاوەڵی رۆحن. کەچی لە لایەکی تریشەوە رقێکی زۆری لە ژن دەبێتەوە، ئەوەش جگە لە بوغزاندنی جەستە و هەر شتێك پەیوەندیی بە سێکسەوە هەبێت، تۆ بڵێی هۆکاری ئەوە خۆشەویستییەکی قوڵ بووبێت، کە پێشتر باسمانکرد و وتمان وەسیلەیەکی بۆ تێربوون نەدیوەتەوە بۆیە گۆڕاوە بە رقێکی قوڵ؟!

لێرەوە قەشە جیرۆم هێرشێکی توندی کردووەتە سەر جۆڤینیان، چونکە وێراویەتی بڵێت، کە هاوسەرگیریی، هاوشێوەی حاڵەتی پاکیزەیی و کچێنی، دەشێت پەیوەندییەکی چاك و خوازراو بێت. لێرەدا جیرۆم رقێکی زۆر لە ژن نیشان دەدات و لە کتێبی پیرۆزەوە بەڵگە بۆ ئەوە دەهێنێتەوە، کە هاوسەرگیریی وەسوەسەی شەیتانە و نەفسی مرۆیی پیس دەکات. ئایا هەر ئەوە هۆکاری وەدەرنان نەبوو لە بەهەشت؟! قەشە جیرۆم نموونەی سلێمان دەهێنێتەوە، بەوەی پیاوێکە ــ بە وتەی ئەو ــ لە وردەکارییەکانی سێکسدا شارەزا بووە، پاشان ئەو دەقانەی لە (سفر الامثال)ەوە دەیانهێنێت بە خراپ راڤەیان دەکات، تا لە رێگەی ئەزموونی پیاوێکەوە، کە لەگەڵ ژناندا ژیاوە و زۆری بە دەستیانەوە چەشتووە بۆمان روون بکاتەوە، کە هاوسەر (الزوجة) کێیە و ژن (المرأة) کێیە.

قەشە جیرۆم سێ دەق لە (سفر الامثال)ەوە وەردەگرێت، کە دەربارەی سۆزانی و لەشفرۆشەکانن، دەقێکیش دەربارەی ژنێکی دەم درێژ و پێی وایە، بەو دەقانە بەڵگەی یەکلاکەرەوەی دەربارەی خەسڵەتە گشتییەکانی هاوسەر بە تایبەتی و سروشتی ژنیشی بە گشتی بۆ روونکردوینەتەوە.

هەرچی دەقی یەکەمە دەربارەی سێ شتی سەیرە، یەکەمیان: ((رێگەی ژنێکی زیناکارە، پاش نان خواردن، دەمی سڕی و وتی ئەوەی کردوویەتی گوناه بووە))(أمثال ٣٠:٢٠) جا نازانم چۆن دەتوانین لە دەقێکی لەو شێوەیەوە ئیدانەی سەرلەبەری ژنان

بکەین، لە کاتێکدا دەقەکە راشکاوانە تەنیا ئیدانەی ژنی زیناکاری کردووە؟ دەقەکە باس لە خراپەی ژنێکی دیاریکراو دەکات، بێ ئەوەی بە تەنیا وشەیەکیش باسی هەموو رەگەزی ژن بکات، سەرەڕای ئەوەش دەتوانین هەمان شت دەربارەی پیاوی زیناکار بڵێین، قسەکە لێرەدا هیچ نییە جگە لە سەرزەنشتکردنی رەفتارێکی گوناهبارانەی مرۆیی!

دەقی دووەم دەربارەی چوار شتە، کە قەت تێرنابن و ناڵێن بەسە[١٣٨]: ((سۆزانی، رەحمی نەزۆك، زەوییەك کە تێر ئاو نەبێت، ئاگر))(**أمثال ١٥:٣٠ ــ ١٦**). ئەگەر ئەم دەقە باس لەوە بکات، کە ژن لە ڕووی سێکسییەوە تێرنابێت، ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە. ئەگەر باس لەوەش بکات، کە ژنی نەزۆك زۆر ئارەزووی لە منداڵە، نازانم ئەوە چ عەیبەیەکی بۆ ژن تێدایە؟ ئەی مەگەر پیاوی نەزۆکیش زۆر ئارەزووی لە منداڵ نییە؟!

دەقی سێیەم دەڵێت: چوار شت هەن زەوی بۆی هەڵناگیرێن: کۆیلەیەك ئەگەر ئازاد بێت، ژنێکی خراپ ئەگەر هاوسەرگیریی بکات، گەمژەیەك ئەگەر تێر بێت، کەنیزەکێك ئەگەر میراتیی ژنە ئاغاکەی بۆ بمێنێتەوە))(**أمثال ٢:٣٠ ــ ٢٢**).

قەشە جیرۆم پێی وایە، ئەم دەقانە ئەوە ئاشکرا دەکەن، کە ژن مەخلوقێکی سەیرە، ئارەزووی سێکسی تێر نابێت. هێندەش بەسە ــ بە بۆچوونی ئەو ــ کە کتێبی پیرۆز ژنی خستووەتە ناو ئەو چوار شتەوە، کە زەوی توانای هەڵگرتنیانی نییە، لەمەشەوە دەگاتە ئەوەی: ژن دەخرێتە ریزی خراپە گەورەکانەوە. پاش ئەوەی لە کتێبە ونبووەکەی سیۆفراستۆس بە ناونیشانی (خراپییەکانی هاوسەرگیریی)ەوە چەند دەقێك دەخوازێت، بە شانازییەکەوە لەبارەیەوە دەڵێت: ئەو کتێبە هێندەی قورسایی خۆی زێڕ دەهێنێت. دواتر لیستێکی درێژی ناوی ئەو ژنانە دەکاتەوە، کە لە مێژوودا ناویان بە خراپە و خراپەکار هاتووە: تێرینتیا[١٣٩] کە سێ جار شووی کردووە. ئیگزانتیپ[١٤٠] کە هەمیشە ئاوی پیسی دەکردە سەروچاوی سوکرات و شاگردەکانیدا، کاتێك لەبەردەم ماڵەکەیدا گفتوگۆیان دەکرد. میتایا، کە داوێنپیس بوو. ئەکلۆریا پاولا، ئەو مەستەی تەحەدای کاتۆی مێردی کرد. ئۆلۆمپیاس، کە دەرگای بە ڕووی فیلیپی مێردیدا داخست و نەیهێشت بێتە ژووری خەوەکەیەوە[١٤١]. ئەگەر بە قەشە جیرۆم بڵێین، کاکە ئەمەی تۆ باسی دەکەیت نموونەی

ژمارەیەك ژنی خراپن، بەلاّم ئێمە ملیۆنان ژنی چاك و چاكەكار و دلّسۆزمان هەیە[١٤٢]، ئەو كات پێمان دەلّێت: جا بۆچی سەركێشییەكی وا بكەم و ژنێك بهێنم، كە رەنگە باش و رەنگە خراپیش بێت؟ راستییەكەی بە دەگمەن ژنێك دەبینین لەو كەموكورتییانە بەدەر بێت، یان هەلّەی نەبێت، یان هیچ ئەنگێزە و هەلّچوونێكی توندی نەبێت، هەر كەسێكیش هاوسەرگیریی كردبێت باش ئەوە دەزانێت[١٤٣].

ئەگەر قەشە جیرۆم رێزی هەندێك ژن دەگرێت، ئەوە لەسەر حیسابی هەموو رەگەزی مێینە دەیكات. وەك هەموو باوكانی تریش سەرنجی خۆی لەسەر دوو شتی سەرەكی چڕ دەكاتەوە: سێكس و گوناهی یەكەم. لێرەشدا بە تەواوی پشت بە كەلەپووری یەهودی و ترسی لە توانای هەلّخەلّەتاندنی ژن و ئیدانە كردنی شەهوەتی سێكسی و بەسەرهاتەكانی شەمشون و داود و سلێمان و ئەوانی تریش دەبەستێت. ئەو دەقانە لە كتێبی پیرۆزەوە دەردەهێنێت، كە كار لەسەر سڕینەوەی جوانیی ژن دەكەن، زۆر جاریش بە سووربوونەوە ئەوە دووپات دەكاتەوە، كە جەستەی ژن شتێكی سەرنجڕاكێش نییە، بەلّكو قێزەونە، خستنەوەی منداڵیش مایەی دلّخۆشیی نییە، بەلّكو نیشانەی داتەپین و داڕووخانە!

### ٣- پەروەردەكردنی كچ:

رەنگە قەشە جیرۆم لە باوكە فەیلەسوفەكانی تر زیاتر گرنگیی بە پەروەردە و فێركردن دابێت، تەنانەت نامەیەكی تایبەتی بەو بابەتە داناوە، تیایدا فیكری خۆی لەبارەی پەروەردە و فێركردنی كچ دەخاتە ڕوو. مەسیحییەكان لە گەڕانیان بە دوای ژیانێكی رۆحیی بەرزتردا، ژیانی دێرەكانیان داهێنا، كە لە سەدەی چوارەمی زایینەوە بلاّوبووەوە و قەشە جیرۆمیش بەردەوام بانگەوازی بۆ دەكرد و باسی چاكەكانی دەكرد، داوای لە ژنانی رۆما و بێوەژنانیش دەكرد بێنە دێرەكانەوە. پێشتریش باسمانكرد، كە چۆن یوستۆخیوم و پاولای دایكی راكێشا، كە لەگەلّیدا چوون بۆ بەیت لەحم و لەوێ چوار دێری بۆ ژن و دانەیەكیشیان بۆ پیاوان كردەوە، هەر لەوێشدا زۆربەی كتێبەكانی نووسیوە. سالّی ٤٠٣

نامەیەکی بۆ بووکەکەی خاتوو پاولا نووسی، تیایدا ڕێنوێنیی دەکات، کە چۆن ئەو کچەی تازە بوویەتی بەخێو بکات و فێری بکات، تا بە پاکیزەیی بمێنێتەوە و خۆی بۆ خودا تەرخان بکات!

لەو نامەیەدا دەڵێت:

با منداڵەکەت فێربوونێکی شایستە بە ژیانی فێربکرێت. ساموێل لە پەرستگادا گەورە بوو[144] و یوحەنناش لە کێوان[145]. یەکەمیان مەی نەدەخواردەوە و لە تەمەنێکی زۆر مناڵیدا لەگەڵ خودادا دەدوا، دووەمیش رقی لە ژیانی ناو شاران بوو، پشتوێنێکی پێستەی بە خۆیەوە دەبەست، کوللە و هەنگوێنی دەخوارد و پێستەی ئاژەڵانی دەپۆشی، پێویستە بەو شێوەیە ئەو نەفسەی دەبێتە پەرستگایەك بۆ خودا، پەروەردە بکرێت، دەبێت فێر بێت هیچ نەبیستێت و هیچیش نەڵێت، تەنیا ئەوە نەبێت، کە فێری لە خوا ترسانی دەکات، با فێری هیچ قسەیەکی بێمانا و گۆرانیی دونیایی نەبێت، بەڵکو وێردی سەر زمانی مۆسیقای سازگاری ئایەتەکانی کتێبی پیرۆز بێت. مەهێڵە منداڵەکان بە یاریی بێتام و بێمانا و بە هەرزەیی و مەیلی شەڕانیی خۆیان سەرقاڵی بکەن، با دایەنەکەی لە هەموو شتێکی دونیایی دووری بخاتەوە، تا هیچ زانیاریی و زانستێکی خراپی بەرگوێ نەکەوێت[146]. دەربارەی جل و ئەوەی پێویستە کچ لەبەری بکات، جیرۆم دەڵێت:

سەبارەت بە جل و رووکەشی دەرەوەی، پێویستە بەردەوام ئەوەی بیربخەیتەوە، کە ئەو چاوەڕوانی مەسیحە، گوێی نەسمیت، روخساری بە بۆیە و گوڵمەکانی بە رەنگی سوور نەشێوێنیت، ئەوانە هەموو بۆ مەسیح تەرخانن. نەکەی گەردنی بە زێڕ و سەری بە گەوهەر قورس بکەیت، رەنگی سوور نەدەیت لە سەری، چونکە بەو کارەت دەیکەیتە قوربانیی ئاگری دۆزەخ. فێری بکە بە گەوهەری زۆر لەوانە بەهادارتر خۆی بڕازێنێتەوە[147].

قەشە جیرۆم باسی ئەوەی دەکات، کە ژنێك ــ لەسەر داوای مێردەکەی ــ گەوهەری کردبوو بە قەیی کچەکەیدا و پرچیشی جوان داهێنابوو، فریشتە هاتە خەوی و بە دەنگێکی تۆقێنەرەوە پێی گوت:

چۆن دەوێریت فەرمانی مێردەکەت بخەیتە سەرووی راسپاردەکانی مەسیحەوە؟ نیازت وایە ئەو دەستە پیسانە بخەیتە سەر ئەو پاکیزەیەی خۆی بۆ خودا نەزرکردووە؟ لە ئێستاوە ئەو دەستانە هەڵدەوەرێن، بەو ئازارەی دەبێت بیچێژی هەست بە گوناهەکەی دەکەیت، تەنانەت ئەگەر مانگی پێنجەمیش تێپەڕێت، هەر راپێچی ئاگری دۆزەخ دەکرێیت. ئەگەر لوتبەرزیی بنوێنیت و لەو خراپەیە بەردەوام بیت، ئەو کات مێرد و منداڵەکەشت لە دەست دەدەیت.

هەروەها دەڵێت: هەموو ئەو شتانەش راست وەرگەڕان، زۆری نەبرد مەرگ هەموو شتێکی هەڵلوشی. ئەوەش ئەوەمان پێ دەڵێت، کە مەسیح تۆڵە لە هەر کەسێك دەکاتەوە، ئەگەر پەرستگاکەی پیس بکات و بەرگریی لە زێڕ و گەوهەرە بە نرخەکانی خۆی بکات. منیش کاتێك باسی ئەوانەت بۆ دەکەم، مەبەستم ئەوە نییە، کە حەز بە ماڵ وێرانیی خراپەکاران بکەم و پێی دڵخۆش بم، بەڵکو بۆ ئەوەیە بیرت بخەمەوە، پێویستە بە نیگەرانی و ورياييەوە ئاگات لەو کچە بێت، کە نەرزی خودات کردووە. هەر کاتێکیش کچەکە پێگەیی، دەبێت لەگەڵ دایك و باوکیدا بیبەیت بۆ پەرستگا بۆ لای باوکی راستەقینەی[١٤٨].

جیرۆم لە نامەکەی بەردەوام دەبێت و هەموو وردەکارییەکانی ژیانی رۆژانەی پەروەردەکردنی کچان باس دەکات، بۆ نموونە دەربارەی خواردن دەڵێت:

هەرچی دەربارەی خواردنیشە، نابێت لە شوێنە گشتییەکان، یان لەسەر مێزی خێزانەکەیان ئەگەر میوانیان هەبوو، نان بخوات، چونکە رەنگە لەو حاڵەتەدا جۆرە خواردنێك ببینێت، کە دڵی بچێتە سەر. هەر چەندە کەسانێك پێیان وایە، چاکە ئەوەیە مرۆڤ ئەو شتانە ببینێت و ئینجا زوهدیان تێدا بکات، بەڵام بە قەناعەتی من جڵەوگرتنی نەفس لەو حاڵەتەدا بەوە دەبێت، کە بە نەزانیی بمێنێتەوە، چونکە ئەو شتانەی لەسەریان راهاتووین و پێیان ئاشناین، دەربازبوون لێیان ئاسان نییە. لە ئێستاوە خواردنەوەی شەرابی لێ قەدەغە بکە، تا پێدەگات و ئەو کات ئاساییە ئەگەر هەندێك، کە بۆ گەدە باشە، بخواتەوە. فێری رستن و چۆنێتیی گرتنی تەشی و چۆنێتی جوڵاندنەوەی بکە، فێری

بکە رقی لە ئاورێشم و سوفی چینی و ئەو جلانە بێتەوە، کە بە زێڕ رازێنراونەتەوە، با هەر ئەوەندە جل بپۆشێت، کە لە سەرما دەیپارێزێت. با خواردنی، رووەك و سەوزە و نان و ماوە نا ماوەیەکیش پارچەیەکی بچووکی ماسی بێت، نامەوێت زۆر لەسەر رێساکانی خواردن بڕۆم، پێشتر لە شوێنێکی تر بە وردی باسمکردوون. بەڵام ئەوەی دەمەوێت سەرباری بکەم ئەوەیە، وای لیٚ بکەیت پاش هەر ژەمێك برسیی بێت و دەستبەجیٚ دەست بکاتە خوێندنەوە (یان چڕینی) سرودەکانی داود. پێویستە نە توانا و نە زانینی ئەوەی هەبێت بیٚ تۆ بژی، بە جۆرێك ئەگەر هەستی کرد تەنیا دەکەوێت، بلەرزێت. رێگەی نەدەیت مشتومڕ لەسەر مەسەلە دینییەکان بکات، یان پەیوەندیی بەو پاکیزانەوە هەبێت، کە هیچ لەسەر نەزرەکانی خۆیان نازانن، نابێت بڕواتە ئاهەنگی کەنیزەکەکانەوە و بەشداری لە بەزمە گەرمەکانی ماڵاندا بکات. دەزانم هەندێك خەڵکی مەسیحی رێسایەکیان داناوە، گوایە پاکیزەی مەسیحی نابێت لەگەڵ خەسێنراو یان ژنە مێردداره‌کاندا خۆی بشوات، چونکە خەسێنراو هێشتا لە دڵیدا پیاوە و ژنە مێردداره‌کانیش نیگای ئاگرین لە پاکیزە دەبڕن. بەڵام من بە تەواوی خۆشۆرین بۆ پاکیزەی پێگەییو بە باش نازانم، چونکە پێویستە لە کاتی رووتیدا شەرمی لە خۆی بێت و نەتوانێت سەیری خۆی بکات، جا ئەگەر بە نوێژ و رۆژوو جەستەی بمرێنێت و بە داوێنپاکیی سارد، بڵێسەی شەهوەت دابمرکێنێتەوە و جڵەوی ئارەزووی ئاگرینی گەنجانە بگرێت، ئەگەر بە ئەنقەست خۆی پیس بکات و خۆی قێزەون نیشانبدات، لەو رێگەیەوە خێرا جوانیی سروشتیی خۆی بشێوێنێت، ئیتر بۆچی بڵێسە نوستووەکە لە رێگەی خۆشۆرینەوە زیندوو بکرێتەوە؟[١٤٩]

بەو شێوەیە قەشە جیرۆم، ئەو حیکمەتەی دەڵێت پاك وخاوێنی بەشێکە لە ئیمان، تێك دەدات، تەنیا لە پێناوی ئەوەی سیماکانی جوانیی ژنان بشارێتەوە، تا چیتر شەهوەتی پیاوان نەورووژێنن و نەیانخەنە گوناهەوە!

## چوارەم: قەشە یوحەننا "دەم زێڕین" (٣٤٥ ـ ٤٠٧)
## St. John Chrysostom

یەکێکی ترە لە باوکانی کڵێسا و ئەو بیرمەندانەی لە سەرەتای سەرهەڵدانیدا، بەرگرییان لە مەسیحییەت کردووە، ناوی قەشە یوحەننا کریستۆمە، وتاربێژێکی زمانپاراو بووە، خەڵکی زۆریان خۆشویستووە، نازناوی ((یوحەننای دەم زێڕ)) یان ((دەم زێڕین))ی پێبەخشراوە، هەروەها لە مێژووی فیکری مەسیحیدا بە یوحەننای خاوەن دەمی زێڕینیش ناسراوە[١٥٠].

راستە لەو کەسانە نەبووە، کە هەموو پەیوەندییەك بە ژنەوە ئیدانە دەکەن، بەڵام لەو کەشە کولتوورییە گشتییەی، کە باوەڕی وابووە ژن مەخلوقێکی نزمترە لە پیاو و کاریگەریی زۆر خراپیش دەکاتە سەری، بەشداربووە و دەڵێت:

بە هۆی پەیوەندیمان بە ژنەوە، توشی چەندین بەڵا و نەهامەتی بووین، دەگەڕێینە ماڵەوە و رادەستی ئارەزووە کڵپەدارەکان دەبین، پاشان بۆ چەندین رۆژ و شەو نیگەران دەبین، بە ڕاستی جوانیی ژن گەورەترین شیرکە[١٥١]. ئامۆژگاریی گەنجانیش دەکات، بە بێ جیاوازیی لە هەموو ژنان دوور بکەونەوە، تەنیا پیرەژنە ناشیرینەکان نەبێت، کە جوانیی و ئەفسوونی خۆیان لە دەستداوە: ((پێویستە گەنجان وەك چۆن لە ئاگر هەڵدێن، ئاواش لە کچان دوور بکەونەوە))[١٥٢].

بە رای قەشە یوحەننا، ئەو کەسەی هاوسەرگیریی دەکات و ژیانێکی ئاسایی چاکەخوازانە دەژی، تەنیا گەنجێکی منداڵە و ناتوانێت ببێتە راهیب. زۆربەی جار ئامۆژگاریی هێمنانە و ئاگادارکردنەوەی ناسکانە دەخاتە ڕوو، کە دوورە لە زمانی کینە و بوغزەوە!

بەڵام کاتێك دێتە سەر باسی پەیوەندیی راهیب بە ژنەوە، کە زۆر گرنگیی بەو بابەتە داوە، زمانێکی رەق و توندتر بەکاردەهێنێت، هەر چەندە ئەو ویستی لەگەڵ

جیهان بگونجێت و لەگەڵیدا بژی، بەڵام ئاسایی خۆی خستە رەوتی رەبەنییەوە و باوەڕی بە پاکیزەیی هێنا، وەك ئەوەی تاکە رێگەی ژیانێکی چاکەخوازانە بێت، بۆیە پێی وابوو گەنج هەڵە دەکات، کاتێك ژیان و پەیامی رەبەنیی جێدەهێڵێت و روو لە هاوسەرگیریی و منداڵ و خێزان دەکات، چونکە قەشە یوحەننا زۆر بەو هەڵوێستە بێتاقەت دەبێت و بە کەوتنێکی گەورەی تێدەگات. بۆیە هەر زوو نامەیەکی دینی دەنووسیت و ناوی دەنێت ((نامەیەك بۆ تیۆدۆر پاش کەوتنی)) و تیایدا دەڵێت:

تیۆدۆر، پێویستە بە باشی بیر لە ئەنجامی پەیوەندییەکانت بە ژنێکەوە، یان بە ژنانەوە بە گشتی بکەیتەوە، پێویستە دوو جار بیر لەو پرسە بکەیتەوە، بیر لە زیناکانی داود و هەڵگەڕانەوەی سلێمان بکەرەوە. پاشان پێویستە بە باشی لە سروشتی راستەقینەی ئەو جوانییە مێینەییە رابمێنیت، کە خەریکە بە هۆیەوە واز لە فەزیلەتەکانت دەهێنیت.

تیۆدۆر، ئەگەر لەو شتانە رادەمێنیت، کە ئەو چاوە جوانانە حەشاریان داوە، ئەو لوتە رێکە، ئەو دەمە بچووکە، ئەو گۆنا لووسانە، ئەو کات تێدەگەیشتیت ئەو جەستە قنجە جگە لە گۆڕێکی سپی، کە ئەندامەکانی بێ ئەندازە پیسایییان تێدایە، هیچی تر نییە!

سەرەڕای ئەوەش، ئەگەر وای دابنێیت، کە کەسێتییەکی پڕوپوچی پڕ لە پیسایی وەکو بەڵغەم و تف و ئەو شتانەت بینیوە، ئەو کات ناتوانی تەنانەت بە نوکی پەنجەکانیشت دەستی لێ بدەیت. نا، دوای ئەوانە تەنانەت نەتدەتوانی سەیریشی بکەیت، جا تۆ بۆ کۆگایەکی ئەو پیسایی و پاشەڕۆیانە هەڵدەچیت و دەورووژێیت؟

ئەی تیۆدۆر، بۆ لە کۆیلایەتییەکی نەفرەتلێکراو خۆت دەرباز ناکەیت و بگەڕێیتەوە بۆ ئازادییەکەی جارانت[١٥٣].

هەر چەندە ژن لە سەردەمی قەشە یوحەننادا راهاتبوو، بە بێ داپۆشینی جەستەی بە شەقامەکاندا رێ نەکات، بە جۆرێك، کە کەس هیچ شوێنێکی جەستەی نەبینێت، تەنانەت خۆیشی جگە لە بەرپێی خۆی هیچ کوێی لێوە دیار نەبێت، کەچی هێشتا

وەك پاشماوەی داوێنپاکییەکی کۆن، کە لە ئێستادا بوونی نەماوە، سەیری دەکرد، چونکە خراپە هەر زوو لە رێگەی گوێ و چاویشەوە خۆی دەگەیەنێتە ژن، بە رادەیەك زۆربەیان توشی خراپە هاتوون. بەو شێوەیەش خراپە و بەرەڵایی دەگاتە زۆربەی ژنان. دەڵێت: ژنان بە روخساری داپۆشراو، بەڵام بە رۆحی کراوەوە بە شەقامەکاندا دەسورێنەوە، بگرە دەتوانین بڵێین دەرگای لەسەر خۆی خستووەتە سەر گازەرەی پشت[١٥٤].

دەستەواژەیەك هەیە، کە دەتوانێت بۆچوونی یوحەننا کریستۆم ((دەم زێرین)) کورت بکاتەوە، ئەویش: لە ناو درندە کێوییە راوکەرەکاندا، مەحاڵە بتوانیت گیانلەبەرێکی لە ژن ئازاربەخشتر بدۆزیتەوە))[١٥٥].

# پاژی چوارەم

## قەشە ئۆگەستین

## (٣٥٤ ــ ٤٣٠)

## St. Augustine

((ئاااهـ، ئەگەر لەبەر خۆشەویستیی مەلـەکوتی ئاسمـان
رازی بوومایە، کە خەسێنراو بم، ئێستا بەختەوەرتر دەبووم!))
قەشە ئۆگەستین: دانپیانانەکان

# قەشە ئۆگەستین
# (٣٥٤ - ٤٣٠)

**١ - ژیانی:**

قەشە ئۆگەستین گەورەترین باوك و فەیلەسوفی کلێسای مەسیحییە، لە ١٣ی تشرینی دووەمی ساڵی ٣٥٤ لە تاجیست، کە ئەمڕۆ بە (سوق الاخرس) دەناسرێت لە رۆژهەڵاتی جەزائیر، لەدایکبووە. لە ١٤ی ئابی ساڵی ٤٣٠ لە هیبون، کە ئەمڕۆ بە بونە دەناسرێت لە رۆژئاوای تونس، کۆچی دوایی کردووە. باوکی بتپەرست و دایکیشی، مۆنیکا، مەسیحی بوو. باکووری ئەفریقیا لەو کاتەدا ویلایەتێکی رۆمانی بوو، کونسوڵێکی رۆمانی، کە لە قەرتاجە نیشتەجێ دەبوو، بەڕێوەی دەبرد. لە تاجیست نەحو و هەندێك لە زانستەکانی تری خوێند، لە ئامێزی دایکیدا بە ئاسانی فێری زمانی لاتینی بوو، بەڵام زمانی یۆنانی، کە هەوڵیان دەدا لە قوتابخانەدا فێری بکەن، رقی لێدەبووەوە، چونکە توندوتیژ بوون لەگەڵی و هەڕەشەی توندیان لێدەکرد و ئازاریان دەدا، بۆیە ئاستی لە زمانی یۆنانیدا تا کۆتایی تەمەنی هەر بە ناوەندیی مایەوە، ئەو لێدانەی لەسەر دەستی مامۆستاکەی قوتابخانەی دەیخوارد، ناچاری نەکرد فێری زمانی یۆنانی بێت، هێندە هەیە، وەك خۆی دەڵێت، ئەو لێدانانە خۆشیی زیانبەخشیان لەبیربردەوە، بۆیە ئەو رێگەیە بە گونجاو دەزانێت و داوا دەکات لە پەروەردەکردندا پێڕەویی لێبکرێت!.

لە کتێبی (دانپیانانەکان)دا دەگێڕێتەوە، کە چۆن تەنانەت لە سەرەتای تەمەنیدا گوناهی کردووە، بۆ نموونە لە کاتی منداڵیدا هەندێك هەرمێی لە باخچەی دراوسێیەکیان دزیوە، لە کاتێکدا ماڵی خۆیان لەو دارەیان هەبووە، کەچی ئەو حەزی لەوە بووە بیدزێت و برسیشی نەبووە. هەروەها زۆر جار گوناهی درۆی کردووە، ئەوە

جگە لە پەیوەندییەکانی بە ژنانەوە لە تەمەنی هەرزەکاریدا، کە پاش کەمێك باسیان دەکەین، پاش هەموو ئەوانەش وای لێهاتووە بڵێت، گوناهـ گەورەترین بەربەستە بۆ مرۆڤ!

لە تەمەنی شانزەساڵیدا رۆیشتە قەرتاجە، تا لەوێ خوێندنەکەی لە بواری یاسادا تەواو بکات و کتێبێکی شیشیرۆنی بە ناوی (هۆرتینسیۆس) خوێندەوە (ئێستا ئەو کتێبە نەماوە)، ئەوەش وای لێکرد بە قوڵی گرنگی بە خوێندنی فەلسەفە بدات، پاشان ئاینزای مانیزمی خوێند و باوەڕی پێهێنا، گەشتی بۆ ئیتاڵیا کرد، سەرەتا رۆما و دواتر میلان، لەوێدا کەوتە ژێر کاریگەریی ئەفلاتونیزمی نوێوە، کە پێی وابوو ئەو رێبازە، رێبازێکی میتافیزیکییە و باوەڕی بە لۆگۆس (الکلمە) هەیە، بەڵام رێبازی بەرجەستەبوون یان رزگاربوونی مرۆڤی تێدا نەبینییەوە. پاشان گوێی لە وەعز و ئامۆژگارییەکانی قەشە ئامبرۆز گرت، بە هۆی زۆرلێکردنی دایکیشییەوە، کە دەیویست ئۆگەستین ببێتە مەسیحی، توشی ململانێیەکی ناخەکیی توند بووەوە، ئەوەش قەیرانی یەکلاکردنەوە بوو لە ژیانی رۆحیدا. ئۆگەستین بۆ خۆی لە وەسفیدا دەڵێت، وەك گەردەلولێك بوو، کە بارانێکی بەخوڕی بە دوادا بێت، هەستی دەکرد نەفسی لە نێوان ویستی چاکە و ویستی خراپە، داواکارییەکانی رۆح و داواکارییەکانی جەستەدا، پارچە ـــ پارچە بووە، لە وەسفی ئەو حاڵەیدا دەڵێت:

((من بووم دەمویست و هەر منیش نەمدەویست، ئەو ئازارەشی منی لە خۆم داماڵیبوو، ئەو کەرتبوونە لە نێوان ویست و تواناد‌ا بە هۆی سروشتێکی بێگانە بە منەوە نەبوو، بەڵکو لە ئەنجامی ئەو ئازارەوە بوو، کە لە سروشتی گیرۆدە و نێچیری دەستی گوناهی خۆمەوە، کەوتبووەوە))[١٥٦].

یەکێك لە هاووڵاتییە ئەفریقییەکانی بەسەرهاتی ژیانی رەبەنیی لە بیابانی میسر بۆ گێڕایەوە، بە تایبەتی ژیانی قەشە ئەنتوان، کە بە تەواوی وازی لە دونیا هێنابوو و لە خەڵوەتدا خۆی بۆ خواپەرستی تەرخانکردبوو، ئەو بەسەرهاتەش زۆر کاری لێکرد، کەچی هێشتا هەر ملەجەڕێی دەکرد، پێی داخ بوو واز لە شەهوەت و

چێژپەرستییەکانی بهێنێت، بۆیە سکالای بردە لای خودا: تا کەی خودایە لێم تووڕە دەبیت، ئایا بەردەوام ئەو کارە بۆ سبەینێ دوادەخەیت؟ بۆچی دەستبەجێ ئەو ژیانی شەرمەزارییەی کە هەمە کۆتایی پێنەهێنم؟[157] ئەو قسانەشی لە خەڵوەتێکدا بوو لە نزیك ماڵەکەی، کە لە کاسیکیاکوم لەگەڵ ئالوسی[158] هاوڕێیدا تێیدا دەژیا، لە کاتی ئەو موناجاتەشدا لە ماڵە دراوسێکەیانەوە دەنگی کچێك هاتە بەر گوێی، کە ئاوازی Tolle Lege، واتە هەڵگرە و بخوێنەی دەچڕی. دەنگەکە چەند جارێك دووبارە بووەوە، رایکردە ماڵەوە و کتێبی پیرۆزی هەڵگرت، بە رێکەوت لەسەر نامەکانی قەشە پۆڵس کردییەوە، کە زۆر نەبوو جێی هێشتبوو، ئەمەی خوێندەوە[159]: ((نە سەرسامی و نە سەرمەستی، نە خەوتن و نە خەمخواردن، نە دووبەرەکی و نە حەسوودی، بەڵکو یەسوعی مەسیح بپۆشن، لەبەر خاتری شەهوەتەکان رێوشوێن بۆ جەستە سازمەدەن))[160]. ئیتر ئارەزووەکان ساردبوونەوە، دڵی نور و دڵنیایی لێدەڕژا، بە بێ هیچ پەرێز و گەڕانەوەیەك خۆی سپاردە دەستی خودا، لە دانپیانانەکاندا دەڵێت: هێندە بەس بوو بۆم، پێویستم بە لەوە زیاتر نەما، هەر ئەوەندەی لە خوێندنەوەی ئەو چەند دێڕە بوومەوە، تیشکی دڵنیایی و دڵنەوایی لە دڵمدا بریسکایەوە و هەموو تاریکیی وەهمەکانی رامالی، کتێبم داخستەوە و رووداوەکەم بۆ ئالوسی گێڕایەوە، هێمنیی بە روخسارمەوە دیاربوو، ئەویش کتێبەکەی برد و ئەمەی سەرباركرد: ((ئەو کەسەی لاوازە، دەستی یارمەتیی بۆ درێژ بکەن))[161] و ئەو وتەیەشی وا لێکدایەوە، کە ئاڕاستەی خۆی کرابێت، لەسەر ئەوەی بڕیارمدابوو پێی هەستم، پیرۆزبایی لێکردم و خۆیشی ئەهلی ئەوە بوو، چونکە رابردووی ئەو لە رابردووی من باشتر بوو))[162]. ئینجا نوێژی سوپاسگوزاریی کرد: ((ئەی خودا من کۆیلەتم، کوڕی کەنیزەکتم، تۆ کۆتەکانی منت تێکشکاند، منیش سوپاسگوزارتم، قوربانیی سوپاسگوزاریشم بۆ تۆ دەبێت))(مەزمور ١٦:١٦، ١٧).

ئۆگەستین، وەك خۆی لە کتێبی (دانپیانانەکان ــ کتێبی هەشتەم، بەشی دوانزەیەم)دا باسی دەکات، گوێی بۆ ئەو قسەیە شلکرد و شوێنی کەوت، ئیتر بە

تەواوی ژیانی ڕۆحیی دەستپێکرد، ئەوەش لە ئەیلولی ساڵی ٣٨٦دا بوو، بڕیاریدا واز لە هاوسەرگیریی و هەموو شەهوەتێکی دونیایی بهێنێت، ئەو کات تەمەنی سی و سێ ساڵان بوو. لە سەروەختی جەژنی هەستانەوە (الفصح) لە نیسانی ساڵی ٣٨٧، لە تەمەنی سی و چوار ساڵیدا لەسەر دەستی قەشە ئامبرۆز (٣٤٠ ــ ٣٩٧)، ئوسقوفی میلان، شۆردرایەوە (تەعمید کرا): ((دەستبەجێ هاتینە لای دایکم، هەواڵەکەمان پێ ڕاگەیاند و زۆر خۆشحاڵ بوو))[١٦٣]. کاتێك ویستی بگەڕێتەوە بۆ زێدی خۆی، دایکی لە یەکێك لە گەڕەکەکانی ڕۆمادا نەخۆشکەوت، لە تەمەنی پەنجا و شەش ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، دواتر کرا بە قەشە و پێگەیەکی بڵندی لای ژنە قەشەکانی تری کڵێسای کاسۆلیکی هەبوو. ئۆگەستین هاتە ڕۆما و چەند مانگێك لەوێ مایەوە، لە دواییدا گەڕایەوە (تاجیست)ی زێدی خۆی، بەشێك لە موڵکەکانی بەخشییە کڵێسا و بەشێکی تریشی دا بە هەژاران، تەنیاماڵێکی بۆ خۆی هێشتەوە، کردی بە شوێنی خواپەرستیی خۆی و ژمارەیەك لە لایەنگرانی. کاتەکانی بەسەر خواپەرستی و وەرزێریدا دابەشکرد، سێ ساڵ ژیانی ڕەبەنیی ژیا، ناوبانگی بە ناوچەکانی دەوروبەریدا بڵاوبووەوە، تەنانەت کاتێك ساڵی ٣٩١ چووە هیپۆ (ڕۆژئاوای تونس) دانیشتوانەکە داوایان لە ئوسقوفەکەیان کرد، ئۆگەستین بکات بە کاهینێك، تا چاودێرییان بکات، ئەویش داواکەیانی جێبەجێ کرد، دوای پێنج ساڵ ئوسقوف مرد، خەڵکی ئۆگەستینیان بۆ جێگرتنەوەی هەڵبژارد، ئەویش بۆ زیاتر لە سی و پێنج ساڵ و تا مردنی لە ساڵی ٤٣٠دا، ئەرکی بڵاوکردنەوەی ئیمان و بەرگری کردنی لە مەسیحییەت بە دەم و بە قەڵەم گرتە ئەستۆی خۆی.

### ٢- پەیوەندیی بە ژنانەوە:

قەشە ئۆگەستین بە سەرکێشی و پەیوەندیی زۆری بە ژنان و ئەنجامدانی گوناه و هەڵەی زۆرەوە بە ناوبانگە، خۆیشی بەشێکیانی لە کتێبی دانپیانانەکان گێڕاوەتەوە. لە کتێبی دووەم (بەشی یەکەم)دا دەگێڕێتەوە، کە کاتێك بووەتە هەرزەکار، شەهوەتە جەستەییەکان بە سەریدا زاڵبوون، ئەویش تا بنی گوێی تیایاندا نوقمبووە: تینویەتیم

بۆ چێژە جەهەنمییەکان گڕی تێبەردابووم، نامەردیم وای لێکردم بە چەندین جۆر چێژپەرستی بکەم، ئیتر جوانیم شێوا، لەبەر چاوی تۆدا پاکییەکەی جارانم نەما))[١٦٤].

جڵەوی بۆ نەفسی خۆی شلکرد، تا چی پێ خۆشە بیکات: ((ئەو کات تەنیا خۆشەویستیم بە لاوە گرنگ بوو، خۆشەویستی. بەڵام گرنگیم بە ڕێگە ڕووناکەکانی هاوڕێییەتی نەدەدا، کە دوو دڵ پێکەوە کۆ دەکەنەوە. بۆیە کاتێك پێگەیشتم لە شەهوەتی جەستەییمەوە هەڵمێك دەهاتە سەرێ، کە دڵی پڕکردم و فشاری بۆ دەهێنا، چیتر جیاوازیم لە نێوان خۆشەویستیی پاك و ڕووناك و خراپەی پیس و تاریکدا بۆ نەدەکرا، لە نەفسمدا تێکەڵ بووبوون، بۆیە ملیان پێوەنام بەرەو شەهوەت و چێژپەرستی و لە خراپەکاریدا نوقمیان کردم))[١٦٥].

دایکی، وەك باسمانکرد، مەسیحییەکی زۆر ئیماندار بوو: ((دایکم ئامۆژگاریی کردم، کە هەرگیز یاری بە شەرەفی ژنێکی مێرددار نەکەم و خراپە ئەنجام نەدەم و...هتد)). ئۆگەستین پێی وابوو ئەو قسانە، جگە لە کۆمەڵە ئامۆژگارییەکی ژنێك هیچی تر نین، کە شەرمەزارییە بۆ ئەم کاریان پێ بکات، بۆیە کوێرانە ڕووەو گوناه هەنگاوی دەنا! ((ئەگەر بە وردی گوێم لە تەقینەوەی هەورە بروسکەکانت لە کتێبی پیرۆزدا بگرتایە" لە گۆماوی جەستەیاندا فڕێدەدرێن، هەروەها، باشتر وایە بۆ پیاو گوێ لە ژن نەگرێت" چۆن گوێی خۆمم لەو قسانە کەڕدەکرد؟! ئاااه ئەگەر لەبەر خۆشەویستیی مەلەکوتی ئاسمان ڕازی بوومایە، کە خەسێنراو بم، ئێستا بەختەوەرتر دەبووم[١٦٦]. لە کوێ بووم، ئەی بۆچی خۆم لە لەزەتەکانی ماڵەکەت دوور گرت خودایە! لە ساڵی شانزەیەمی تەمەنی جەستەمدا، کاتێك شەهوەتی شێتانە تەنگی پێهەڵچنیم، کە بە هۆی مەیلی مرۆڤەوە لە خراپە بێ هیچ کۆتێك دەسوڕێتەوە، هەر چەندە بە حوکمی شەریعەتی تۆ خراپەکاری حەرامە خودایە، ئەو کاتە لە کوێ بووم، کاتێك هەموو جڵەوی خۆم دایە دەستی شەهوەتی جەستەم؟!)). هەر چەندە هەوڵی وازهێنان و دوورکەوتنەوەشی دەدا: ((شەپۆلەکە بەسەرمدا زاڵدەبوو و ڕاپێچی دەکردم، منیش لە شەریعەتەکانت لامدا و لە سەرزەنشتی تۆ بە دوورنەبووم، جا مرۆڤ

هەیە لێی رزگار بێت؟! تۆ هەرگیز لە من دوورنەکەوتیتەوە هەی بەخشندە لە سزا و قینی خۆتدا، بەڵکو هەموو چێژە حەرامەکانمت بە بێزارییەکی تاڵ قەرەبووکردەوە، وات لێکردم بە دوای چاکەی ئەوتۆدا بگەڕێم، کە کەس لێیان بێزار نابێت))[١٦٧].

کاتێك لە زێدی خۆیەوە بەرەو قەرتاجەی پایتەخت بە ڕێکەوت: ((دیتم پشێویی ئەشق بە دەور و خولمدا شەپۆل دەدات، تا ئەو کاتیش ئاشق نەبووم، بەڵام حەزم لێبوو ئاشق بم، لە قوڵایی نەفسمدا هەستم بە پێویستی بە ئەشق دەکرد، لە قوڵایی نەفسیشمدا رقم لەوە بوو، کە لەو رووەوە دواکەوتووم، بە دوای شتێکدا دەگەڕام ئاشقی بم، ئاشقیش بووم، رقم لە ژیانی بەرەڵایی دەهاتەوە، هەستم کرد تامێکی خۆشتری دەبێت ئەگەر چێژم لەو کەسەی، کە خۆشمدەویست وەربگرتایە، بەو شێوەیەش پاکیی هاوڕێیەتیم کردە قوربانیی ئەشقی سێکسی و شەهوەتی ئاژەڵی، هەموو رووناکییەکیم بە پەڵە هەورێك لە خراپەی جەهەنمی لێ ونبوو، پەڕە درەوشاوەکەشی بە دۆزەخی شەهوەتەکان تاریك بوو))[١٦٨].

لە کۆتاییدا، لەسەر دۆستێك، کە ژنێکی سۆزانیی بوو گیرسایەوە، ساڵانێکی زۆر خۆشیویست. ژنێکم بۆ خۆم قەراردا، کە شەرعیی نەبوو، بۆ تێرکردنی شەهوەتێکی بێ جڵەو قەرارمدا، کەسی ترم جگە لەو نەبوو، هەموو بەڵێنەکانیشم لەگەڵیدا بردە سەر، دواتر بۆم دەرکەوت، بەڵێننامەی هاوسەرگیریی ئاقڵانە، کە لە پێناو بەخشینی ژیاندا رێکخرا بێت زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەوەیاندا، کە بۆ تێرکردنی شەهوەتی ئاژەڵی و خستنەوەی منداڵ بێت بەبێ خواستی باوانیان، کە کاتێك چاو هەڵدێنن خۆشەویستیی خۆیان بەسەر باوانیاندا دەسەپێنن[١٦٩].

هەر چەندە وازی لە سێکسی بەردەوام لەگەڵ ژنی جیاوازدا هێنا و لەگەڵ ئەو سۆزانییەدا گیرسایەوە، بەڵام ساڵی ٣٨٢ کاتێك هێشتا تەمەنی ١٨ ساڵان بوو، کوڕێکی لێ بوو، کە هەندێ جار پێی دەوت کوڕی گوناهەکەم و هەندێ جاری تریش دیاریی خودا و هەندێ جاری سێیەمیش بە بەخششی خودا ناوی دەبرد، ئۆگەستین

زۆری خۆشدەویست، پاش ئەوەی چووە سەر دینی مەسیحی بە وردی پەروەردەیەکی دینیی دەکرد.

دایکی لە قۆناغێکی تەمەنیدا دەیویست لەو سۆزانییە دووری بخاتەوە، زۆری بۆ دەهێنا تا هاوسەرێك بۆ خۆی پەیدا بکات و چیتر خۆی نەخاتە گوناهەوە، هەر بە ڕاستیش هەنگاوێکی جدیی بۆ نا، کچێکی مارەکرد، کە دایکی پێی رازیبوو، چیتر دەبوو لە سۆزانییەکەی جیاببێتەوە، لەو بارەیەوە دەڵێت: ((کاتێك دۆستەکەمیان لێکردم، گوایە بەربەستە لەبەردەم هاوسەرگیریمدا، دڵم پارە و بریندار بوو، خوێنی لێهات، چونکە بەوەوە پەیوەست بوو و گەڕایەوە بۆ ئەفریقیا( ئەو کات ئۆگەستین لە میلان بوو و دۆستەکەشی لەگەڵ بوو) و نەزری ئەوەی بۆ کردی خودایە، کە پیاوێکی تر نەبینێت، کوڕەکەشی لەگەڵ جێهێشتم)). لەگەڵ ئەوەشدا، بە هۆی منداڵیی کچەکەوە، نەدەبوو پێش دوو ساڵ هاوسەرگیرییەکە بکرێت. لەو ماوەیەشدا پەیوەندیی بە سۆزانییەکی ترەوە کرد، کە هێندەی ئەوەی یەکەمی ئاشکرا نەبوو، هاوشێوەی ئەویش دانی پیانەدەنا، رۆژ بە رۆژ ویژدانی زیاتر ئازاری دەدا و داوای لە خوداش دەکرد، کە دڵپاکی و داوێنپاکیی پێببەخشێت. لە کۆتاییدا و پێش تێپەڕینی دوو ساڵەکە و هاتنی وادەی هاوسەرگیرییەکەی، ئەنگێزەی دینی بە تەواوی بە سەریدا زاڵبوو، پاشماوەی تەمەنی بە رەبەنیەتێکی دوور لە هەموو ژنێك بەخشی[١٧٠].

## ٣- ئۆگەستین و ژن:

ساڵی ٣٨٦ ئۆگەستین وازی لەو ژنە هێنا، کە بۆ زیاتر لە دە ساڵ وەك ژن و مێرد پێکەوە ژیان و پێی دەوت دۆستەکەم، کوڕێکیشی لێ هەبوو، بە ناوی دیۆ داتۆس، واتە دیاریی خودا، سێ ساڵ پاش لەدایکبوونی کوڕەکەیان ئۆگەستین ژنەکەی بەجێهێشت، هەڵوێستی ژنەکەش لە ئۆگەستین، وەك هەندێك لە توێژەران دەڵێن، زۆر لە هەڵوێستی ئەم لە ژنەکە مەردانەتر بوو[١٧١]. ئۆگەستین بوو بە مەسیحی، بەوەش رێڕەوی ژیانی لە نوقم بوونی نێو چێژپەرستی و تێرکردنی شەهوەتی سێکسیەوە بۆ

چالاکییە رۆحییەکان و بەدیهێنانی نموونە باڵا دینییەکان گۆڕی، لەوانە زوهد و رقبوونەوە لە لایەنی مادی، بەوەش هەڵوێستە سەلبییەکانی ئەفلاتونی دەربارەی جەستە بە گوێماندا دایەوە[١٧٢].

راستییەکەی، تیۆری قەشە ئۆگەستین دەربارەی سروشتی مرۆڤ لە رووی فەلسەفییەوە بە تەواوی ئەفلاتونییە: لای ئەو مرۆڤ، رۆحێکی زیندانی کراوە لە جەستەدا، لە رووی لاهوتیشەوە ئەو تیۆرەی دەستکاری کرد، تا لەگەڵ دەقەکانی کتێبی پیرۆز لەبارەی خەڵقکردنەوە بگونجێت، لە کتێبێکیدا بە ناوی (دەربارەی سێ رەنگی) کە ساڵی ٤١٥ تەواوی کرد، وێناکردنی بۆ دەستەواژەی وێنەی خودا Image Dei بەو شێوەیەی لە سفری تەکویندا هاتووە، روون دەکاتەوە: (( خودا، مرۆڤی لەسەر وێنە ــ شێوە ــ ی خۆی خەڵقکرد، لەسەر شێوەی خۆی بە نێر و مێی خەڵقیکردن))(التکوین ١:٢٧). لەبەرئەوەشی خودا نامادییە، کەواتە وێنەکەشی، کە رۆحە، نامادییە. لەبەر ئەوەشی خودا سێ رەنگە (باوك، کوڕ، رۆح) ئەو کات وێنە مرۆییەکەشی سێ رەنگ دەبێت، لە رێگەی سێ هێزی رۆحییەوە لە مرۆڤدا، ئەوانیش یادەوەری و ئەقڵ و ویستن. بە هەمان رادەی، کە ئەو هێزە رۆحییانە روو لە خودان، مرۆڤەکان لەسەر وێنەی خودا زیاد دەکەن.

بەڵام ئەگەر سروشتی مرۆیی، کە خودا لەسەر وێنەی خۆی خەڵقی کردووە، لای ژن و پیاویش بە هەمان شێوە بێت، ئیتر جیاوازیی نێوانیان لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت؟ بۆچی ژن لە پیاو نزمتر بێت؟ بۆچی هەندێك فەرمانی تایبەت بە ژن هەن و بۆ پیاو نین؟ قەشە پۆڵس، بۆ نموونە، پێی وایە دەبێت ژن سەری داپۆشێت، بەڵام پیاو پێویستی بەوە نییە، چونکە پیاو شکۆی خودایە، ژنیش شکۆی پیاوە. قەشە ئۆگەستین دەڵێت:

دەتوانین چی لەو بارەیەوە بڵێین؟ ئەگەر ژن وەك کەسێك، کە سێ رەنگیی کامڵ بکات، ئیتر بۆ بڵێین پیاو وێنەی خودایە، نەك ژن؟ ئەی بۆچی ژنیش وێنەی خودا نەبێت؟ ئەم جیاوازییە وای لە پۆڵسی پەیامبەر کرد فەرمان بە ژن بدات، کە سەری

داپپۆشێت، لە کاتێکدا ڕێگەی بە پیاو نەداوە هەمان کار بکات، چونکە پیاوی بە وێنەی خودا زانیوە.

پێویستە لەو وتانەی پۆڵسی پەیامبەر، کە دەڵێت پیاو وێنەی خودایە، نەك ژن، رابمێنین. ئەو قسەیەش لەگەڵ کتێبی پیرۆزدا دژ نابێتەوە، کە تیایدا هاتووە: خودا مرۆڤی لەسەر وێنەی خۆی خەڵقکردووە، لەسەر وێنەی خۆی بە نێر و مێی خەڵقیکردوون، مرۆڤ لەسەر وێنەی خودا خەڵقکراوە. لێرەدا ژن ئاوارتە ناکات، چونکە ژنیش تێدەگات، کە وێنەی خودایە. کەواتە بە چ مانایەك لەو قسەیەی پۆڵس تێبگەین: کە پیاو وێنەی خودایە، بۆیە نابێت سەری داپپۆشێت، بەڵام ژن پێویستە سەری داپپۆشێت؟ چارەسەر بە رای من لەو قسەیەدایە، کە پێشتر لە کاتی گفتوگۆکردن لەبارەی سروشتی رۆحی مرۆیی کردومە، بەوەی ژن و مێرد پێکەوە وێنەی خودان، ئەوان یەك جەوهەرن، کە وێنەکە پێك دەهێنێت، بەڵام کاتێك کتێبی پیرۆز وەسفی ژن دەکات بەوەی یارمەتیدەر و پاڵپشتە بۆ پیاو، لێرەدا ئەو وەزیفانەی تایبەتن بەو دەستنیشان دەکات، پاشان لەو حاڵەتەشدا وێنەی خودا نابێت، لە کاتێکدا پیاو لە خۆیدا وێنەی خودایە، جا بە تەنیا بێت یان لەگەڵ ژندا[١٧٣].

ئەگەر دەستەواژەیەکی روون و راشکاو بخوازین، بۆ ئەوەی بیرۆکەکەی ئۆگەستین راڤە بکەین، دەڵێین کاتێك وەك مرۆڤ، واتە وەك رۆحێك بیر لە ژن دەکەینەوە، ئەو کات وێنەی خودایە، بەڵام کاتێك لە رووی وەزیفەکەیەوە، واتە وەك جەستەیەك سەیری بکەین، ئەو کات سەر بە شتە زەمینییە زوو گوزەرەکانە، کە شتی نزمن و لەم حاڵەتەدا ئەویش دەبێتە هەبوویەکی نزم و لەسەر وێنەی خودا نابێت! تا ژن زیاتر گرنگی بە شتە جەستەیی و دونیاییەکان بدات، کە زۆر جاریش دەیدات، زیاتر پێویستیی بە جڵەوگیر دەبێت، بە دەربڕینێکی تر، پێویستە دەسەڵاتێك بەسەر سەرییەوە هەبێت، ئەویش خۆی لەو سەرپۆشەدا دەبینێتەوە، کە مانای وایە ئەو سەرە پێویستی بە دیسپلینە!

بەڵام مەبەستی قەشە پۆڵس لە جیاوازی کردنی نێوان نێر و مێ، ئاماژەدانە بە راستییەکی شاراوە لە پشتەوەی ئەو جیاکردنەوەوە، کە دەکرێت لە قسەیەکی تریپەوە لەو دەربڕینە تێبگەین. لە جێگەیەکی تردا وتوویەتی، ژن لە راستیدا بێوەژنێکی تەنیای بێ منداڵە، پێویستە لەسەری تەنیا متمانە بە خودا بکات و شەو و رۆژ لەسەر نوێژەکانی بەردەوام بێت.

بەڵام ئەو کەسەی بە راستی بێوەژن و تەنیایە، دەبینین پەنا بۆ خودا دەبات، شەو و رۆژ لەسەر نوێژ و داواکارییەکانی بەردەوام دەبێت، بەڵام ئەو ژنەی نیعمەتی پێ بەخشرابێت، وەکو مار وایە[١٧٤]. ئەوەش داوایەکە لە ژنان بۆ وازهێنان لە جەستە و رووکردنە خودا، بۆ ئەوەی بە راستی بڕواتە سەر وێنەی خودا و شایەنی ئەوەش بێت!

کاتێك قەشە پۆڵس دەڵێت، کە رێگە بە ژن نادات دەسەڵاتی بە سەر پیاودا هەبێت، بەڵکو پێویستە بێدەنگ بێت، هۆکارەکەی ئەوەیە لە لایەکەوە ئادەم لە پێشدا خەڵقکراوە، لە لایەکی تریشەوە ئادەم هەڵنەخەڵەتێنرا، بەڵکو ئەوە ژن بوو هەڵخەڵەتێنرا و بێ فەرمانیی کرد، بەڵام دەتوانێت بە خستنەوەی منداڵ رزگاری بێت، ئەگەر لەسەر ئیمان و خۆشەویستی و پیرۆزیی و ئاقڵبوون بمێنێتەوە[١٧٥].

ئەوەش مانای وایە، قەشە ئۆگەستین بیرۆکەی ئەفلاتونی دەربارەی رقبوونەوە لە جەستە و ئەوەی مرۆڤ رۆحێکی زیندانیکراوە لە جەستەدا، وەرگرتووە. مرۆڤ بەو رادەیەی لە پرسە رۆحییەکان نزیك دەبێتەوە، زیاتر مرۆیی بوونی دەردەکەوێت، بەڵام ژن، بەو شێوەیەی دەردەکەوێت، لایەنی جەستەیی بەسەردا زاڵە، بۆیە هەمیشە پێوەی پەیوەست دەبێت و ناتوانێت رۆحیی و بە دوای ئەوەشدا وێنەی خودا بێت. راستییەکەی، لێرەدا توێژەرێکی وەك ماری دەیلی ناهەقی نییە، کاتێك دەڵێت ئۆگەستین پێی وایە، ژن لەسەر وێنەی خودا خەڵق نەکراوە[١٧٦] و بە چاوێکی کەم سەیری ژن دەکات، چونکە چۆن دەبێت ژن وێنەی خودا بێت ئەگەر لەگەڵ مێردەکەیدا لە یەك شوناسدا بتوێتەوە[١٧٧] کەچی پیاو وێنەی خودایە چ بە تاکی بێت یان بە جووتی. بۆچی ئۆگەستین لە دوو گۆشەنیگاوە سەیری ژن دەکات: گۆشەنیگای جەستە، کە تیایدا ژن پلە دوو دەبێت، لەگەڵ گۆشەنیگای

ڕۆح، کە بەرزتر دەبێتەوە، کەچی لەگەڵ پیاودا بە هەمان پێوەر مامەڵە ناکات. ئایا ئەوەی گوایە پیاو لە پێشدا خەڵقکراوە، بۆیە دەبێت پێشینەیی و باڵایی هەبێت، زۆر ساویلکانە نییە؟ هەرچی پرسی هەڵخەڵەتاندنیشە، بە ڕاستی هەولێکە، وەك ماری دەیلی دەڵێت، بۆ دۆزینەوەی قوربانییەك: ((ژن لە کەلەپووری مەسیحیدا قۆچی قوربانی بوو، ئەوان بە دوای ئەوێکی تردا دەگەڕان، تا سەرکۆنە و سەرزەنشتی بکەن، بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی، کە حوکمەکان دەردەکەن وەك خەڵکێکی پاك و چاکەکار دەربکەون))[١٧٨]. بۆیە دەبینین، هەمیشە وەك نموونەی هەڵخەڵەتاندن و خراپە و ڕەفتاری ناشیرین، ئاماژە بە لەشفرۆش و سۆزانییەکان دەدەن، وەك بڵێی ئەو ژنانە لەگەڵ خۆیاندا سێکس بکەن، نەك لەگەڵ پیاواندا. پاشان لاهوتییەکان جەخت لەوە دەکەنەوە، کە ئەو ژنانە پێویستن بۆ کۆمەڵگە، نەك بۆ ئەوەی کەسێك بۆ سەرکۆنە و ئیدانەکردن هەبێت، بەڵکو بۆ ئەوەی پیاوچاکەکانیان لێ دووربخەینەوە، بۆیە هەمیشە ژنی خراپ لەو کۆمەڵگایەی بەرەڵایی سێکسیی تێدا باو بووە، سەرکۆنە کراوە)). دەتوانین لە نێو قسەی لاهوتییەکاندا دەربارەی لەشفرۆشی بۆ ئەوە بگەڕێین، قەشە ئۆگەستین دەڵێت:

((چ شتێك هەیە هێندەی بابەتی لەشفرۆشان و ماڵەکانی لەشفرۆشی و خراپییەکانی تری هاوشێوەی ئەوان، پیس و بێمانا بێت و مرۆڤ تووشی ئابڕووچوون و شەرمەزاری بکات. پاشان ئەگەر بێیت و لەشفرۆشی قەدەغە بکەیت، دەبینیت شەهوەت زۆر شتی تر پیس دەکات، ئەگەر لەشفرۆشەکانیش بخەیتە ناو ژنانەوە، ئەو کات زۆر شت تووشی کاری نەشیاو و نەخوازراو دەکەیت))[١٧٩].

قەشە تۆمای ئەکوینی، وەك پاش کەمێك دەیبینین، لەسەر هەمان بیرۆکە دەوەستێت و جۆرێك لە جوانکاری بۆ دەکات، ئەوەش هەمان بیرۆکەیە، کە ماری دەیلی ناوی دەنێت حیکمەتی نێران، دەڵێت:

((لەشفرۆشی لەم دونیایەدا وەك پیسیی دەریا و بۆڕی ئاوەڕۆی کۆشکەکان وایە، بەڵام ئەگەر ئەو بۆڕییانە لاببەیت، کۆشکەکان پڕ دەبن لە پیسی، بە هەمان شێوەش ئەگەر لەشفرۆش و سۆزانییەکان لە دونیا دەربکەیت، ئەو کات پڕ دەبێت لە نێربازی)). لێرەشدا

قەشە ئۆگەستین دەڵێت: ((شاری سەرزەمینی، لەشفرۆشان بەکاردەهێنێت و کردوونیەتی بە کارێکی بێ رەوشتانە، بەڵام رەوا یان یاسابییە[180] رەنگە هەر ئەوەش مەبەستی بووبێت، کە مێژووی ئەخلاق بنووسیتەوە، کاتێك لەشفرۆشانی بە گەورەترین پاسەوانی فەزیلەت ناوبردووە))!!

**٤- هاوسەرگیریی:**

مرۆڤ بۆ ئەوەی لە کاریگەریی سۆزانی و لەشفرۆشان بە دوور بێت، پێویستە هاوسەرگیریی بکات، کە دەیپارێزێت و لە خراپە بە دووری دەگرێت، قەشە ئۆگەستینیش جەخت لەو پەیوەندییە پیرۆزەی نێوان ژن و مێرد دەکاتەوە، پێی وایە کتێبی پیرۆزیش هاوسەرگیریی بە شتێکی باش و پەسەند لەقەڵەم دەدات و هانی بۆ دەدات، بەڵام رێگە بە ژن نادات، تا مێردی پێشووی مابێت جارێکی تر شووبکاتەوە. وەك چۆن پیاویش بۆی نییە، تا ژنی پێشووی مابێت ژنێکی تر بهێنێت. پاشان حەزرەتی مەسیحیش جەخت لە گرنگیی هاوسەرگیریی دەکاتەوە و لە ئینجیلدا پێشوازیی لێکردووە، نەك تەنیا لەبەر ئەوەی بە هۆی زیناوە نەبێت تەڵاقی قبوڵ نەکردووە، بەڵکو چونکە چووەتە شاییەوە، وەکو شاییەکەی قانا جەلیل، کاتێك بانگهێشتکرا و رۆیشتنیشی مانای موبارەك کردنی هاوسەرگیرییەکە بوو!

قەشە ئۆگەستین لە توێژینەوەیەکی بە ناوی هاوسەرگیری و چەند بابەتێکی تردا[181] دەڵێت، پێم وایە هاوسەرگیری تەنیا لەبەر خستنەوەی منداڵ شتێکی باش نییە، بەڵکو لەبەر تەندروست یی سروشتیی ژن و مێردەکەش، ئەگەرنا نەماندەتوانی باسی هاوسەرگیریی لای گەلە کۆنەکان بکەین، بە تایبەتی ئەگەر منداڵەکانیان لەدەست دابێت و چیتر منداڵیان نەبووبێت، لە هاوسەرگیریی باشدا هەر چەندە چەندینساڵ بەردەوام دەبێت، تەنانەت ئەگەر گەرموگوڕیی گەنجانە کەم بێتەوە و سۆزی گڕگرتووی نێوان ژن و مێرد ساردبێتەوە، ئەوا خۆشەویستی و بەزەیی لە نێوان ژن و مێرددا هەر دەمێنێت[182].

ئۆگەستین بۆچوونی خۆی لەبارەی هاوسەرگیرییەوە زیاتر روون دەکاتەوە، دەڵێت:

((هاوسەرگیریی خاڵێکی تری پۆزەتیڤی تێدایە، ئەویش ئەوەیە، کە شەهوەتی جەستەیی، هەر چەندە خراپیشە، بەڵام لە هاوسەرگیریدا دەگۆڕێت بە شتێکی قبوڵکراو، کاتێك لە خستنەوەی منداڵدا دەخرێتەگەڕ. بەو شێوەیە ژیانی هاوسەرگیریی، شتێکی باش لە خراپییەکانی شەهوەتەوە هەڵدەکرێنێت. لە کۆتاییشدا ئارەزووی جەستەیی دەچەپێنرێت و لاواز دەبێت، چونکە جۆرێك لە کەرامەت دێتە ئاراوە، کاتێك ژن و مێردێك لە پەیوەندیی هاوسەرگیریدا یەك دەگرن و بە چاوی دایك و باوك سەیری یەکتری دەکەن))[١٨٣].

بەڵام قەشە ئۆگەستین هۆشیاریی ئەوەمان دەداتێ، کە لە هەموو حاڵەتێکدا داوێنپاکیی زوهد لە هی هاوسەرگیریی باشترە، هەر چەندە هەردووکیان شتی باشن، بەڵام کاتێك بەراوردی خەڵکی دەکەین، کە کامیان باشترینن، دەبینین زاهیدەکان باشترینن!

**٥- زوهد:**

قەشە ئۆگەستین هاوشێوەی هاوسەردەمەکانی تری، لە بابەتی زوهد و خواپەرستیدا توندڕەو نەبوو، ڕاستە لە نووسینەکانیدا دەربارەی هاوسەرگیری و شەهوەت، داوێنپاکیی بۆ خزمەتی خودا دەخاتە پێش هەموو شتێکەوە، بەڵام هاوکات پێی وایە هاوسەرگیری و پەروەردەکردنی منداڵ کارێکی ئەخلاقیی باش و خوازراوە، بە مەرجێك چالاکیی سێکسی کۆتوبەند بکات و تەنیا بۆ خستنەوەی نەوەکانی داهاتوو بێت. بەوەش ڕازییە، کە کردەی سێکسیی نێوان ژن و مێرد ڕێگەدراو بێت، ئەگەر تەنیا بۆ خستنەوەی منداڵیش نەبێت، هەر چەندە پێی وایە ئەو کردە سێکسییە کارێکی باش نییە و ڕەنگە گوناهیش بێت، با لە گوناهی زیناش کەمتر بێت. دەشێت بە فیعلی ئەوەش ڕوو بدات، ئەگەر لایەنێکی هاوسەرگیرییەکە، بەبێ ڕەزامەندیی لایەنەکەی تر، سوور بێت لەسەر سنوردارکردنی چالاکیی سێکسی بۆ خستنەوەی منداڵ و بەس.

ئۆگەستین بە وردیی باسی ئەوەی کردووە: چۆن پێش وەدەرنانی ئادەم، کردەی سێکسی بەبێ شەهوەت و ئارەزوویەکی توندی جەستەیی بوو، چونکە ئەندامە سێکسییەکان لە ژێر کۆنترۆڵ و دەسەڵاتی ویستدا بوون و ملەجەڕییان نەدەکرد، بەو شێوەیەی ئێمە ئەمڕۆ

دەست و پێیەکانمان دەجولێنینەوە. دواتر شەهوەت، وەك بەشێك لەو سزایانەی بە هۆی سەرپێچیکردن لە فەرمانی خودا بە سەر مرۆڤدا سەپێنران دەرکەوت، لەوەش بە دواوە ئەندامە سێکسییەکان شەهوەت و ئارەزووی توند کۆنترۆڵیان کرد، نەك ویست، لە کاتێکدا هەموو ئەندامانی تری جەستەمان لە ژێر کۆنترۆڵ و ویستی خۆماندان. ئۆگەستین دەڵێت: ((کاتێك مرۆڤ پێویستە بە ئەرکی گەورەی خۆی لە خستنەوەی منداڵ هەستێت، ئەو کات ئەندامە سێکسییەکانی، کە بە هەستان بەو ئەرکە راسپێردران راستەوخۆ ملکەچی ویست نابن، بەڵکو چاوەڕوانی شەهوەت دەبن بێت و بیانجولێنێت، وەك بڵێی مافێکی رەوای بەسەریانەوە هەبێت، تەنانەت هەندێ جار بەو شێوەیەی ئەقڵ دەخوازێت ناجولێنەوە و کار ناکەن، بگرە زۆر جار دژی خواستی ئەقڵ دەوەستنەوە[١٨٤]. راستییەکەی، قەشە ئۆگەستین لێرەدا جارێکی تر پەنا دەباتەوە بەر قەشە پۆڵس، کە لە نامەکەیدا بۆ خەڵکی رۆمیە، جیاوازییەکی ئاشکرا لە نێوان کار و کاریگەریی ویستدا دەکات، چونکە ئەو دوو لایەنە هەمیشە پێکەوە ناسازێن، دەڵێت:

((ئێمە دەزانین، کە شەریعەت رۆحییە، بەڵام من جەستەیەکی فرۆشراوم لە ژێر رەحمەتی گوناهدا، چونکە نازانم خەریکی چ کارێکم، چونکە ئەو کارە ناکەم، کە دەمەوێت، بەڵکو ئەو کارە دەکەم، کە بێزم لێ دێتەوە. ئەگەر ئەو کارەش دەکەم، کە نامەوێت، ئەو کات دان بە باشیی شەریعەتدا دەنێم، بەڵام هێشتا من نیم، کە ئەو کارە دەکەم، بەڵکو ئەو خراپەیەیە، کە تێمدا پەنهانە، من دەزانم لە هیچ جەستەیەکدا هیچ شتێکی باش بوونی نییە، چونکە من ویستم هەیە، بەڵام ئەگەر بمەوێت چاکە بکەم، ناتوانم ئەو چاکەیە بکەم، کە دەمەوێت، بەڵکو ئەو خراپەیە دەکەم، کە نامەوێت))(ئیسحاحی دووەم ١٤ ــ ٢٠).

ئۆگەستین هەمان بیرۆکە لە کتێبە ناودارەکەی (شاری خودا)دا دەخاتەڕوو. پێی وایە (شیشیرۆن) کە باسی شێوازە جیاوازەکانی حوکمڕانیی دەکات، بەراوردێك لە نێوان دەوڵەت لە لایەك و سروشتی مرۆیی لە لایەکی ترەوە دەکات. بە پێی ئەو بەراوردەش گەیشتووەتە ئەوەی، کۆنترۆڵکردنی ئەندامانی جەستە وەك کۆنترۆڵکردنی منداڵان وایە،

چونکه بە ئاسانی ملکەچ و گوێڕایەڵ دەبێت، بەڵام ڕەگەزە سرکەکانی نەفس زیاتر لە کۆیلە دەچن. هەر چەندە سروشتی نەفس بەرزترە لە سروشتی جەستە، کەچی خودی نەفسیش دەبینێت کۆنترۆڵکردنی جەستە ئاسانترە لە کۆنترۆڵکردنی خودی خۆی، لە ڕاستیدا ئەو شەهوەتەی دەیبینین ئەوەیە، کە نەفس پێی شەرمەزارە، نە ئەوەتا بە تەواوی کۆنترۆڵی بکات، بە جۆرێك، کە هەر فەرمانێکی پێدا گوێڕایەڵی بێت، تا لەوێشەوە لە کۆتی شەهوەت دەربازی بێت، نە ئەوەتا بتوانێت کۆنترۆڵی جەستە بکات، چونکە ئەو ئەندامانەی پێی شەرمەزارە ویست دەیانجولێنێت، نەك شەهوەت[١٨٥].

ئەوەش مانای وایە، کە نەفس لە ئەندامە سێکسییەکان شەرمەزار دەبێت، کاتێك سرك دەبن و ملکەچی فەرمانەکانی نابن، بەڵکو لەبریی ویست گوێڕایەڵی شەهوەت و ئارەزووی توند دەبن، کە ڕووەو چاکە ئاراستەیان دەکات، مەبەستمان لەوەش خستنەوەی منداڵە بەبێ چێژوەرگرتن و شەهوەتبازی. بەو پێیەش کردەی سێکسی وەزیفەیەك دەبێت، کە لە ڕێگەیەوە ئامانجێك بەدیدەهێنین، ئەویش بەردەوامیدانە بە نەوەکان. وەك پێشتر باسمانکرد، شەهوەت بە هۆی گوناهە بنەڕەتییەکەوە کە ئادەم بێ فەرمانیی خودای کرد، هاتە ئاراوە. بەو شێوەیەش شەهوەت، وەك بەشێك لە سزاکەی، وەکو بازێکی شووم لەسەر شانی مرۆڤ نیشتەوە، بەڵام بێگومان لە بەهەشتدا هاوسەرگیریی ئەو ململانێیەی نێوان ویست و شەهوەت بەخۆوە نابینێت، شەڕ و دژوازیی نابێت لە نێوانیاندا (ئەوەش وەك بەشێك لە یاخیبوونەکە هاتە ئاراوە)، لە بریی ئەوە هەموو ئەندامەکان، بە ئەندامە سێکسییەکانیشەوە گوێڕایەڵی ویست دەبن، بەو شێوەیەش دەبینین ئەندامە سێکسییەکان تۆوی خۆیان لە کێڵگەی زاوزێدا دەچێنن، وەك ئەوەی ئێستا دەستەکان تۆو لە زەویدا دەچێنن.

باوەڕ ناکەم خوێنەر بە قسەکانی من شۆك بێت، ئەگەر هێرشەکەی پەیامبەر پۆڵس بۆ سەر خراپەکارییە تۆقێنەرەکانی ژن شۆکی نەکردبێت، کاتێك دەڵێت: ((چونکە مێینەکانیان بەکارهێنانی سروشتییان گۆڕیوەتەوە بەوەی پێچەوانەی سروشتە))(نامەکەی بۆ خەڵکی ڕۆمیە ئیسحاحی یەکەم: ٢٦). بەڵام من، بە پێچەوانەی پۆڵسەوە، باسی ناکەم

و کارە بێزراوەکانیش سەرکۆنە ناکەم، پاڵپشت بەوەش لە لێکدانەوە و روونکرنەوەمدا بۆ پرۆسەی زاوزێی مرۆڤ، هێندەی بۆم بلوێت خۆم لە وشە زبر و سێکسییەکان بە دوور دەگرم))[186].

## ٦- یەکسانیی رۆحی و ملکەچبوونی سروشتی:

دەتوانین بڵێین، پەیوەندیی پاشکۆیەتی نێوان ژن و مێرد، لە کەلەپووری مەسیحیدا بە گشتی لەگەڵ هاتنە ئارای کۆمەڵێك تەفسیری نوێی کتێبی پیرۆزدا مایەوە، لە سەدەی چوارەمی زاینیشدا، قەشە ئۆگەستین چەند تەفسیرێکی نوێی بۆ چیرۆکی خەڵقکردن و وەدەرنان لە (سفری تەکوین)دا خستەڕوو. خەڵقکردن بە نێر و مێینەوە لەسەر وێنەی خودایە، واتە یەکسانیی هەیە، بەڵام ئەوە ژن بوو پیاوی هەڵخەڵەتاند و بووە هۆی وەدەرنانی لە بەهەشت، بۆیە دەبێت لە پیاو کەمتر بێت، هاوکات دەبێت شوێنکەوتە و ملکەچی بێت. راستییەکەی، ئەو تێکەڵە سەیر و سەمەرەیە دەربارەی ژن لە فەلسەفەی قەشە ئۆگەستیندا، لە ئەنجامی پێکگەیشتنی کۆمەڵێك وێناکردنی جیاوازەوە دروست بووە، کە هەندێکیانی لە کتێبی پیرۆزەوە و هەندێکیانی لە فەلسەفەی یۆنانییەوە وەرگرتووە، نموونە باڵاکانی ئەقڵ لە فەلسەفەی یۆنانیدا وایان لێکرد باوەڕی بەو یەکسانییە هەبێت، کە لە مەسیحییەتدا دەیبینی، بەڵام لە لایەکی ترەوە بیرۆکەی گوناه و وەدەرنان باوەڕیان بەوە تێدا دەچاند، کە ژن بوونەوەرێکی دونیاییە و لەوێشەوە پێویستی بە سەرپەرشتیار و جڵەوگیرە.

زۆر جار لە دانپیانانەکاندا بە بڕێکی زۆر لە پێزانین و پشتیوانییەوە، رووداوەکانی نێوان حەوارییەکانی دایکی و ژنە میوانەکانی دەگێڕێتەوە، دەڵێت:

((زۆر جار رێککەوتووە ژنانێکم دیوە، کە مێردەکانیان کەللەشەق بوون، کاتێك دەهاتنە لای دایکم سکاڵایان لە مامەڵەی خراپی مێردەکانیان دەکرد، دایکیشم بە شێوەیەکی جدیی تێکەڵ بە گاڵتە وەڵامی دەدانەوە: ئێوە شایەنی زۆر لەوە زیاترن، چونکە زمانی خۆتان ناگرن بۆیە سەلامەت نابن، چیتان لەم سکاڵاکردنانە داوە؟ لە کاتی گرێبەستی هاوسەرگیریدا گوێتان لە کاهینەکە نەبووە، کە بە هەریەکە لە ئێوە چی

دەگوت: لە هەموو شتێکدا جگە لە گوناه ملکەچی پیاوەکەت بە، قسەی تاڵی لەگەڵ نەکەیت، بیکە بە ئاغا بە سەر خۆتەوە، ئەوانە و چەندین ئامۆژگاریی تریش))[١٨٧].

هەر چەندە ئۆگەستین دژی ئەو تەفسیرە بوو، کە دەیوت ژن بە جیا لە پیاو خەڵقکراوە، چونکە تەفسیرێکی وەها جدییەتی مەبەستی خودا لە خەڵقکردنی هەردوو رەگەزە جیاوازەکە دەخاتە ژێر پرسیارەوە، هەر چەندە تەفسیری تایبەتیی ئۆگەستین بە رەمزی سێکس لە سفری تەکویندا، وەك ئاشکرایە مەبەست لێی بەرگری کردنە لە ژن، سەرەڕای ئەوانەش تەفسیرەکانی لە پەیوەست بە ئەقڵەوە، ژن دەخەنە پێگەیەکی نارِوونەوە[١٨٨].

راستە ئۆگەستین پێی وایە، بوونی مێینە لە خۆیدا مانای خراپە نییە، بەڵکو شتێکی سروشتییە، بەڵام دەشێت پەیوەندیی نێوان نێر و مێ ببێتە رەمزێك بۆ دەسەڵات و ملکەچی لە خودی سروشتی مرۆییدا، پاشان بەجدی هەوڵیداوە کرۆکی ملکەچیی ژن و رۆڵی هاورِێی یارمەتیدەر، کە کتێبی پیرۆز ژنی پێ ناوبردووە بدۆزێتەوە، ئەوەش رۆڵێکە لە چوارچێوەی ئەقڵ دەیکاتە دەرەوە، چونکە تەنیا دەیکاتە شوێنکەوتە یان جۆرێك لە کۆیلە، کە پێویستە لەسەری ملکەچی ئاغاکەی بێت. قەشە ئۆگەستین هەوڵیدەدا لە ناو تێکەڵەی دەقە پیرۆزەکان و وێناکردنەکانی فەلسەفەی یۆنانیدا، یەکسانیی نێوان هەردوو رەگەزەکە لەگەڵ رێزگرتنی ئەقڵ بدۆزێتەوە، لە کاتێکدا ئەو دەقانەی کتێبی پیرۆز لە سفری تەکویندا تەفسیر دەکات، کە ژن دەکەنە ملکەچی پیاو، هەر ئەوەش کێشە گەورەکەی بوو.

وا دیارە ئەم کێشەیە، لە بنچینەدا لە ژیانی تایبەتیی ئۆگەستین و پەیوەندیی بە ژنانەوە هاتبووە ئاراوە، چونکە دوو جۆری دژوازی لێ ناسیبوون: سۆزانیی دۆست، کە لای ئەو تەنیا جەستە بوو، لەگەڵ قەشە مۆنیکای مەسیحیی خواپەرستی دایکی، کە زۆر جار هێندە داوای لە کورِەکەی دەکرد ببێتە مەسیحی، بە لێزمە فرمێسکی هەڵدەرِشت. کەواتە ژن ئەو مەخلوقەیە، کە لە دوو جۆری سەیر پێکهاتووە: جەستە، کە هەموو رەمزەکانی وەدەرنان و پیسی و پەستی و..هتد تێدا پەنهانە، لەگەڵ رۆح، ئەو دیوە پاك و

روونەی، کە وێنەی خودایە و لای پیاو و ژن جیاوازیی نییە. ژن وەك رۆحێکی ئاقڵ، پێویستە لە هەموو رەمزەکانی جەستەی، یان جیاوازیی جەستەیی لەگەڵ پیاودا جیاواز بێت، پێویستە ئەم جیاوازییە جەستەییەش، کە خاوەنی قورسایی و کێشی رەمزییە، بێ ئەوەی زیان بە یەکسانیی ژن لەگەڵ پیاو وەك بوونەوەرێکی ئاقڵ بگەیەنێت، روون بکەینەوە[189].

ئۆگەستین لە دانپیانانەکاندا هەوڵیداوە ئەو کێشەیە چارەسەر بکات، بەوەی وتوویەتی خودا مرۆڤی ئاقڵی لە وێنەی خۆی خەڵقکردووە و کردویەتی بە ئاغا بە سەر گیانلەبەرە کێوییە بێ ئەقڵەکانەوە، وەك چۆن لە ناو نەفسی مرۆڤیشدا دوو هێزی خەڵقکردووە، یەکێکیان بە هۆی پەلەنەکردنەوە کۆنترۆڵی ئەوەکەیان دەکات، دووەمیشیان ملکەچە و شوێنکەوتەی یەکەمە. لێرەوە ژن، لە توانای زەینی، یان لە لایەنە رۆحییەکەیدا لەگەڵ پیاو یەکسانە، بەڵام بە هۆی جەستەیەوە ملکەچی پیاوە، جەستەی ژن ملکەچی رەگەزی نێرە، بە هەمان ئەو شێوەیەی، کە شەهوەت ملکەچی ویست دەبێت[190].

ژنیش، هەر وەکو پیاو، لە لایەنە رۆحییەکەیدا تەنیا ملکەچی خودا دەبێت، هەر چەندە جیاوازیی جەستەیی لەگەڵ پیاو و ملکەچبوونی بۆی بەو هۆیەوە نکوڵی لێناکرێت، چونکە بەشێکە لە سروشتی و مەحاڵە لێی دابڕێت، ئەوەش لە لایەنی رەمزییەوە وێنەی پەیوەندیی شوێنکەوتەیی نێوان هەردوو لایەنەکەی نەفسە، ئەمەش مانای وا نییە، ژن لە وەزیفەی تێڕامانی باڵای ئەقڵ بێبەریی بێت، کە بە هۆیەوە، وەك سفری تەکوین دەڵێت، مرۆڤ چووەتە سەر وێنەی خودا، هەر چەندە تەنیا پیاو وێنەی خودایە. لە راستیشدا قەشە ئۆگەستین دەگەڕێتەوە سەر پۆڵسی پەیامبەر: دەمەوێت بزانن، کە سەری هەموو پیاوێك مەسیحە، بەڵام سەری ژن پیاوە، سەری مەسیحیش خودایە...هتد (نامەی یەکەمی پۆڵس بۆ خەڵکی کۆرینتیۆس، ئیسحاحی یانزەیەم ٣:١٠).

لە راستیدا قەشە ئۆگەستین، لەو دەقانەدا هەوڵی زۆر دەدات، تا سنورێك بۆ ئەو پرسانە دابنێت، کە لە بازنەی سروشتی مێینە و رۆڵی ژن وەك جەستەیەکی شوێنکەوتە و ملکەچی پیاو دەخولێنەوە، لەگەڵ ئەو پرسەدا، کە دەڵێت ژن دوورە لەوەی بتوانێت لە

مەسیحدا نویٚ ببێتەوە. بۆ یەکەمیان رازییە، بەڵام دووەمیان رەت دەکاتەوە، دەیەوێت ئەو رەگەزەی ناو سروشتی مرۆڤ جەخت لیٚ بکاتەوە و بەهێز بکات، کە بە هۆیەوە مرۆڤ لە خودا دەچێت، واتە ئەقڵ Reason. ئەوەش لایەنی رۆحییە و هەقی بە رەگەزەوە نییە، رۆحێکی نێر و یەکێکی میٚ بوونی نییە، بەڵکو رۆح لە مرۆڤدا یەکە، ئەگەر هەندیٚ جاریش ژن لادەدات، مانای وا نییە توانای لەوە بالاٚتر، واتە فۆرمی تیٚرامانی ئەقڵیی نەبێت.

هەر چەندە لەوەی ویستویەتی لە رووی رۆحییەوە ژن بەرز بکاتەوە بۆ ریزی پیاو، سوپاسی ئۆگەستین دەکەین، بەڵام رەخنەی ئەوەشی لێدەگرین، کە تەنیا ژنی بە خاوەنی لایەنێکی جەستەیی زەق زانیوە، وەك ئەوەی پیاو هەمان ئەو لایەنە جەستەییەی نەبێت. ئەوەی فەیلەسوفە بوونگەرا هاوچەرخەکان دەیڵێن چەندە جوانە، لەوەی سێکس ئاماژەیە بۆ راستییەکی گرنگ، ئەوەش ئەوەیە، کە تاك ناتوانێت بەبیٚ ئەویتر کامڵ بێت، پێکهاتەی جەستەیی مرۆڤیش بە ئاشکرا دەبڕی ئەو راستییەیە: هەر چەندە ئەو جەستەیە کۆمەڵێك کۆئەندامی کامڵی تێدایە، وەکو کۆئەندامی دەمار، کۆئەندامی هەرس، کۆئەندامی هەناسەدان و...هتد، بەڵام نیوەی کۆئەندامی زاوزێی هەیە، بۆیە بەبیٚ کەسێکی تر لە رەگەزی بەرامبەر کامڵ نابێت، لێرەوە سێکس لای بوونگەراکان رەهەندێکی مرۆیی بەرچاو بە خۆوە دەگرێت.

هەرچی ئۆگەستینە، سەرەڕای هەوڵەکانی، کەچی لە کۆتاییدا نێرینەیی و بالاٚیی پێکەوە بەست، مێینەیی و بێبەهایی یان داتەپینیشی پێکەوە گرێدا. کەوابێت جینیڤیڤ لیۆد هەقی بووە کاتێك وتوویەتی ئۆگەستین یەکسانیی رۆحی بڕیارداوە، بەڵام مێینەی خستووەتە لێواری مەترسییەوە، بەوەی خستوویەتیە چەند ئالۆزییەکی هەستەکییەوە، کە ئەقڵ دژیان دەوەستێتەوە، هەروەها جەختی لەوە کردووەتەوە، کە لە مامەڵەی لەگەڵ هەستدا ویستی خۆی دەدۆڕێنێت، پاشان پاڵپشتی لەو بیروباوەڕە کۆنانەی مێینە و لاوازیی ئەقڵییان پێکەوە دەبەست، دەکرد[191].

لای قەشە ئۆگەستین، نەفسی ئاقڵ دەتوانێت کۆنترۆڵی شتە دەرەکییەکان بکات، بەڵام لە لایەکیشەوە دەکرێت لە رێگەی خۆشەویستیی توندەوە سەرنجی بە لای ئەو شتانەدا بڕوات، ئەوەش فۆرمێکی تایبەتی خۆیەتی لە کەوتن و شکستهێنان، کە بەردەوام بە ژنەوە پەیوەست دەبێت، هەر چەندە لە ئێستادا پێی دەوترێت بەکارهێنانێکی خراپی ئەقڵ[192] ئەو جۆرە بەکارهێنانەش دەبێتە هۆی دروست بوونی کەلێنگەلێك، کە خودی ئۆگەستین بە کەم وکورتی لە ویستدا ناوی دەبات، ئەوەش تەنیا لە دونیای واقیعدا روونادات، بەڵکو دەشێت لە دونیای خەونەکانیشدا روو بدات، وەکو نموونەیەکیش باسی زینا دەکات لە خەیاڵدا. لە موناجاتەکانیدا دەڵێت:

((تۆ فەرمانم پێ دەدەیت جڵەوی شەهوەتەکانی جەستەم بگرم، منیش بە نیعمەتی تۆ لەو قودرەتە قێزەونانە دابڕام، بۆشم دەرکەوت، کە رەبەنی لە هاوسەرگیریی باشترە)).

بەڵام لە خەوندا زۆر دەمبزوێنێت، بە جۆرێك تەنیا پاڵنەرەکانی بیرکردنەوە و چێژوەرگرتنم ناجولێنێت، بەڵکو پەلکێشم دەکات بەرەو شتێك، کە وەك جۆرێك لە رازیبوون یان کردن وایە.

ئەو خەیاڵکردنەوە درۆزنانەیە کار لە نەفس و جەستەشم دەکات، بە جۆرێك لە کاتی خەوندا ئەو وێناکردنە وەهمییانەم بۆ زیندوو دەکاتەوە، دەمبات بەرەو ئەو شتانەی، کە راستییەکان لە کاتی بێداریدا ناتوانن بمبەن[193].

ئایا لە هەردوو حاڵەتەکەدا، چ خەو و چ بێداریش هەر من نیم، ئیتر ئەم جیاوازییەی نێوان ئەو دوو کاتە چییە، ئەی کوا ئەقڵم، کە لە کاتی بێداریدا لەگەڵ ئەو وەسوەسانەدا دەجەنگا[194].

خۆ بەدەستەوەدان و لاوازیی ویست لای ئۆگەستین لە رووی رەمزییەوە پەیوەندیی بە ژنەوە هەبوو، ئەوەش بەشێکی کەمە لەو پەیوەندییە فراوانەی لە نێوان ژن و سۆز و هەڵچوونە توندەکان و شەهوانی بوونی نەفسدا هەیە، کە ئەنجامێکی راستەوخۆی لە دەستدانی دەسەڵات و کۆنترۆڵە لای ژن. ئەو لە دەستدانی کۆنترۆڵەش وای لە قەشە ئۆگەستین کرد، تا ئەوپەڕی رقی لە شەهوەتی جەستە ببێتەوە، کە بە هۆیەوە جەستە لە

دەسەڵاتی نەفس یاخی دەبێت. جارێکی تریش دەبینین ئەو شەڕ و ململانێیەی نێوان شەهوەت و ویست بەوە لێك دەداتەوە، کە ئەنجامی گوناهە بنەڕەتییەکەی مرۆڤە، گوناهی یاخیبوون، کە بەبێ ئەو گوناهە ئەندامەکانی زاوزێ لە جڵەوی ویست دەرنەدەچوون، وەك چۆن ئەندامەکانی تری جەستەش ملکەچی بوون، بە هەمان ئەو شێوەیەی دەست تۆو لە زەویدا دەچێنێت، ئەویش تۆوی لە کێڵگەی زاوزێدا دەچاند، ژنیش بە حوکمی ئەوەی بابەتی شەهوەتی پیاوە، پەیوەستە بەو ملکەچییە ئازاربەخشەوە، مەبەستمان ملکەچبوونی نەفسە بۆ جەستە[195].

قەشە ئۆگەستین هەوڵیدا رەمزییەتی کۆنی سێکسی بگۆڕێت و لە جێگەکەیدا یەکسانیی رۆحی دابنێت، بەڵام لە راستیدا هات و جەختی لە هەمان هەڵوێستی پێشوو کردەوە، کە ژن پەیوەستە بە جەستەوە، بە تێکچوونە هەستەکییەکانەوە لە دژایەتی کردنی ئەقڵدا، هێشتاش هەر بە حوکمی سروشت شوێنکەوتەی پیاوە، پیاویش بە حوکمی ملکەچبوونی جەستە بۆ رۆح، کە سیستەمی تەندروست ی شتەکان پێویستی دەکات، مافی دەسەڵاتی ئەقڵیی هەیە بەسەریدا [196].

**٧- ژن لە ئاسمان:**

یەك کێشەی کۆتایی ماوەتەوە، کە قەشە ئۆگەستین باوەڕی بە یەکسانیی تەواوی ژن و پیاو هەبووە تیایدا، ئەویش بوونی هەردوو رەگەزەکەیە لە رۆژی قیامەتدا، کە تیایدا سێکس بە تەواوی کپ دەبێتەوە و شەهوەت بە یەکجاریی نامێنێت. ئەو کێشەیەش قەشە ئۆگەستین لە رۆژانی پیریدا زۆر پێیەوە سەرقاڵ بوو، بە جدی و گرنگییەکی زۆرەوە لێی دەکۆڵییەوە، بیری باوی کڵێساش لەو کاتەدا وا بوو، کە لە قیامەتدا وێنەی ژن دەگۆڕێت بۆ پیاو و بوونیان نامێنێت. لەوەشدا پشتیان بە وتەکانی قەشە پۆڵس دەبەست، ئێمە هەموومان بە یەکێتیی ئیمان تەواو دەبین و کوڕی خوداش دەبێتە مرۆڤێکی کامڵ (نامەی پۆڵس بۆ خەڵکی ئەفسوس ٤:١٣). هەروەها ئەو وتەیەی دەڵێت: ((ئەو ژنانەی، کە پێشتر ناسیونی دەچنە سەر شێوەی کوڕی خودا، تا ئەویش ببێتە برا گەورە لە ناو هەموو براکانیدا))[197]. هەندێك کەس لەو وتانەوە گەیشتنە ئەوەی، هەر کەسێك، کە لەو

رۆژەدا زیندوو دەبێتەوە پێویستە بڕواتە سەر وێنەی کوڕی خودا و وەکو مەسیح ببێتە پیاو، ژنان بچنە سەر وێنەی پیاوان، بە تایبەتی، کە خودا پیاوی لە قوڕ و ژنیشی لە پەراسووی پیاو دروست کردووە، منیش پێم وایە، ئەو کەسانەی باوەڕیان بەو قسەیە هەیە، زۆر هەستەکییانە لێکیان داوەتەوە و ئەوەشیان لە بیرکردووە، کە لە قیامەتدا شەهوەتی سێکسی، کە مایەی شەرمە بوونی نابێت، چونکە مرۆڤەکانی سەرەتا، واتە ئادەم و ژنەکەی، پێش ئەنجامدانی گوناهەکەیان هەردووکیان رووت بوون و شەرمیشیان نەدەکرد(سفر التکوین ٢:٢٥).

بەو شێوەیەش دەبینین، لە کاتێکدا هیچ کەموکوڕییەکی جەستەییان نامێنێت، کەچی سروشتی بنەڕەتیی خۆیان دەپارێزن، چونکە لە وەها حاڵەتێکدا هیچ کەموکورتییەك لە رەگەزی ژندا نابێت، بەڵکو رەگەزێکی سروشتی دەبێت، هەروەها لەو رۆژەدا پەیوەندیی سێکسی و خستنەوەی منداڵ نابێت، بۆیە ئەندامە سێکسییەکانی ژن هیچ سوودو کاریگەرییەکیان نابێت و هاوشێوەی جاران بەکارنایەن، بەڵکو دەبنە بەشێك لە جوانییەکی نوێ، شەهوەتی سەیرکەر و بینەرانی ناورووژێنێت، چونکە بە هیچ شێوەیەك لەو دونیایەدا شەهوەت نامێنێت، بەڵکو هەمووان یادی خودا دەکەنەوە و بەهۆی حیکمەتەکەیەوە بەرز رایدەگرن، نەك تەنیا لەبەر ئەوەی لە هیچەوە خەڵقیکردووین، بەڵکو لەبەر ئەوەی دروست کراوانی خۆی لە تیاچوون رزگار کردووە[١٩٨].

قەشە ئۆگەستین هەوڵ دەدات چیرۆکی خەڵقکردن، بەو شێوەیەی لە سفری تەکویندا هاتووە، بە شێوەیەکی نوێ راڤە بکاتەوە، کاتێك خودا لە سەرەتای خەڵقکردنی مرۆڤدا ژنی خەڵقکرد: ((خودا خەوی خستە چاوی ئادەمەوە و ئەویش خەوت، پەراسوویەکی لێکردەوە و جێگەکەی بە گۆشت پڕکردەوە، پاشان خودا لەو پەراسووەی لە ئادەمەوە بردبووی ژنێکی خەڵقکرد))(تکوین ٢:٢ ــ ٢٣).

دەبێت خالق لەو کارەیدا، مەبەستی ئاماژەدان بووبێت بە پێشبینییەکەی مەسیح و کڵێساکەی: ((خەوی ئادەم بە ئاشکرا رەمزە بۆ مەرگی مەسیح، سنگی مەسیحیش لەسەر خاچ چەقۆی پیاکرا، ئەوە بوو یەکێك لە سەربازەکان چەقۆیەکی کرد بە سنگیدا و

دەستبەجێ خوێن و ئاو دەرپەڕین))(ئینجیلی یوحەننا ۱۹:۳٤). ئەو نهێنییانەش گرنگییەکی زۆریان لای کڵێسا هەیە، لە راستیدا ئەوە دەربڕینە تەواوەکەیە، کە کتێبی پیرۆز لە خەڵقکردنی ژندا بەکاریهێناوە، ئەو نەیوتووە خودا وێنەی ژنی کێشاوە یان شێوەی پێداوە، بەڵکو دەڵێت لەو پەراسووەی لە ئادەمی کردەوە ژنێکی خەڵقکرد. کەواتە ژنیش، هەر وەکو پیاو، خودا خەڵقیکردووە، خەڵقکردنیشی لە پەراسووی پیاوەوە دەرخەری یەك بوونی نێوانیانە، شێوازی خەڵقکردنیشیان ئاماژەیە بە مەسیح و کڵێساکەی[۱۹۹].

چیرۆکی ئینجیلی مەتی دەربارەی گفتوگۆی سدوقییەکان لەگەڵ حەزرەتی مەسیح دەربارەی قیامەت و ژن کردوویانە[۲۰۰] بەم شێوەیە بووە:

رۆژێك کۆمەڵێك سدوقی هاتنە لای و پێیان گوت قیامەت بوونی نییە، لێیان پرسی: ((موسا پێی وتین، کە ئەگەر کەسێك بمرێت و منداڵی نەبێت، براکەی ژنەکەی دەخوازێت و بەردەوامی بە نەوەی براکەی دەدات. ئەگەر حەوت برا هەبن، یەکێکیان ژن بهێنێت و بەبێ هەبوونی منداڵ بمرێت، ژنەکەی بۆ برای دووەمی دەبێت، لەویشەوە بۆ سێیەم و بۆ چوارەم و بەو شێوەیە تا حەوتەمین، ژنەکەش مرد، لە قیامەتدا دەبێتە ژنی کام لە براکان، چونکە لەم دونیا ژنی هەموویان بووە. مەسیح لە وەڵامدا پێی گوتن ئێوە گومڕان و ئاگاتان لە کتێب و هێزی خودا نییە، چونکە لە قیامەتدا ژن و ژنخوازیی نامێنێت، بەڵکو وەك فریشتەی خوا دەبن لە ئاسمان))(ئینجیلی مەتی ۲:۲۲ ــ ۳۰).

کەواتە وەڵامی ئەوە نەبوو، کە ئەو ژنەی باسی دەکەن وەك ژنێك زیندوو نابێتەوە، بەڵکو دەبێتە پیاو، وەلێ مەسیح نکوڵی لە هاوسەرگیریی لە قیامەتدا کرد، بەڵام نکوڵی لە بوونی رەگەزی ژن لەو دونیایەدا نەکرد، بەڵکو جەختی لە بوونی هەردوو رەگەزەکە لەوێدا کردەوە، وتی نە ژن بە شوو دەدرێت و نە پیاویش ژن دەهێنێت، مەبەستی ئەوە بوو ئەو کەسانەی لەم دونیایەدا بە شێوەی سروشتی هاوسەرگیرییان کردووە لە قیامەتدا دەبن، بەڵام لە ئاسمان چیتر هاوسەرگیریی نامێنێت[۲۰۱].

ژن لە دیدی ئۆگەستینندا، لە لایەك لە شێوەی دایکیدا، بەو رۆڵەی لە ژیانیدا گێڕاویەتی، تروسکایی ئومێد و رۆحیی پێبەخشیوە، لە لایەکی تریشەوە لە شێوەی دۆست و مەعشوقدا چێژی جەستەیی پێبەخشیوە، چی لەو بارەیەوە بڵێین؟ دەڵێین ئۆگەستین زۆر بە توندی بە بیرۆکەی گوناهی یەکەم کاریگەر بووە، ئەوەش عەقیدەیەك بووە خۆی داینەهێناوە، چونکە پێش ئەو پۆڵس و تەرتولیان و ئامبرۆز و غەیری ئەوانیش فێری خەڵکییان کردووە. ئەو گوناهانەی ئەنجامی داون و ئەم جۆرە عەقیدەیەش لەولاوە، هەستی ئەوەیان تێدا چاندووە، کە ویستی مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە بەلای شەڕدا کێش کراوە، هیچ شتێکیش جگە لە فەزڵی خودا ناتوانێت بیگێڕێتەوە، فەزڵێك، کە خودا بەبێ بەرامبەر بە خەڵکی دەبەخشێت.

ئۆگەستین هەر هێندەی لە توانادا بوو، کە ویستی مرۆڤ لە خراپە و گوناه بەوە لێك بداتەوە، کە ئەنجامی گوناهەکەی حەوا و خۆشەویستیی ئادەم بۆ حەوا بێت، ئۆگەستین دەڵێت ئێمە لەبەر ئەوەی هەمووومان نەوەی ئادەمین، هەمووومان لە گوناهەکەیدا بەشدارین، بەڵکو راستییەکەی ئێمە هەمووومان نەوەی ئەو گوناهەین، چونکە گوناهی یەکەم بە هۆی شەهوەتەوە کەوتەوە و هێشتاش ئەو شەهوەتە ماوە و هەموو کردەوەیەکی پرۆسەی منداڵ خستنەوە پیس دەکات، بە هۆی ئەو شەهوەتە سێکسییەشەوە، هەموو رەگەزی مرۆیی زەرەرمەندن و زۆرینەی رەهای ئادەمییەکان نەفرەت لێکراو بوون، بەڵێ، دەشێت هەندێکمان رزگارمان بێت، بەڵام رزگاربوونی ئەوانەشمان پەیوەندیی بەو ئازارانەوە هەیە، کە کوڕی خودا چەشتونی، بە شەفاعەتی ئەو دایکە دەبێت، کە بە پاکیزەیی پێی دووگیان بوو، ئێمە بە هۆی ژنێکەوە تیاچوونمان لەسەر نووسرا، هەر بە هۆی ژنێکیشەوە دەرفەتی رزگارمان بۆ گەڕایەوە!

# پاژی پێنجەم

## قەشە تۆمای ئەکوینی
## St. Thomas Aquinas

((پیاو لە ژن بەرزترە، وەك چۆن حەزرەتی مەسیحیش لە پیاو بەرزترە. یەکێك لە مەسەلە جێگیرەکانیش، کە ناکرێت بگۆڕێت ئەوەیە: چارەنووسی ژن لە ژیاندا بە پێی کاریگەریی پیاو دەبێت، ئەویش هیچ دەسەلاتێکی بەسەر ئاغاکەیدا نییە)).

تۆمای ئەکوینی

((مرۆڤ بە هۆی حەواوە، کە لە حوکمدانیدا بەوەی چی باشە و چی خراپە هەڵەی کرد، بێ فەرمانیی خودای کرد، ئێستاش لە هەموو نەوەیەکدا باری ئەو گوناهی یەکەمەی لەسەر شانە)).

تۆمای ئەکوینی

# قەشە تۆمای ئەکوینی

**سەرەتا:**

ئەکوینی گەورەترین فەیلەسوفی مەسیحییە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، چەند نازناوێکی لێنراوە، لەوانەش مامۆستای گەورەی کلێسا و مامۆستای فریشتەیی، فەلسەفەکەشی بەوە وەسفکراوە، کە سیمفۆنییەکی ئەقڵییە، ئاوازەکانی بە ڕێکی و هارمۆنییەوە بە دوای یەکدا دێن. دەربارەی نووسینە زۆرەکانیشی وتراوە، کە کاتدرائییەکی گەورەی بیرۆکەکانە، تا پاپا لە ساڵی **١٣٢٣**دا رایگەیاند، ئەکوینی (قەشە)یە و تۆماوییەتیش بەخششێکی خودایییە! مەزهەبی کاسۆلیکی، نووسینەکانی ئەکوینیی بە چەکێکی فەلسەفیی کاریگەر دەزانی بۆ بەرەنگاربوونەوەی بێباوەڕی و ڕێبازی (لا أدري). هێشتا کاریگەریی زۆری لەسەر کلێسای کاسۆلیکی و فیکری مەسیحی بە گشتی هەیە، چونکە ئەو تەنیا بۆ سەدەکانی ناوەڕاست بە سوود نەبوو، بەڵکو بۆ سەردەمی هاوچەرخیش، بە بەڵگەی ئەوەی ئێمە لەمڕۆدا بزوتنەوەی تۆمایی نوێ دەبینین، کە یاوەرانی دەیانەوێت بگەڕێنەوە سەر ئەنگێزەی مرۆیی مەسیحیی قەشە تۆمای ئەکوینی، هەوڵی زۆریش دەدەن لە سایەی ئەو فەلسەفە لاهوتییەی قەشە تۆمای ئەکوینی پایە سەرەکییەکانی دامەزراندووە، کێشەکانی مرۆڤی ڕۆژئاوایی هاوچەرخ چارەسەر بکەن[٢٠٢].

## ١- ژیانی:

تۆما لە کۆتایی ساڵی ١٢٢٤ یان سەرەتای ساڵی ١٢٢٥ لە کۆشکی رۆکاسیکا (واتە بەردی وشك)، کە کۆشکێکی هاوشێوەی قەڵایە و سێ میل لە ئەکوینۆوە دوورە، کە دەکەوێتە باکووری شانشینی کۆنی سیسیلی، لە باشووری ئیتاڵیا، لە نێوان رۆما و ناپۆلی لەدایکبووە[٢٠٣]. هەر بەوەش نازناوی (ئەکوینی)ی لێنراوە.

باوکی تۆما کۆنتی هەرێمی ئەکوینۆ بوو، تۆماش بچووکترین برای ناو خێزانەکەیەتی، ساڵی ١٢٣٠، کاتێك تەمەنی گەیشتووەتە پانزە ساڵ، باوکی ناردویەتییە دێری مۆنتی کاسینۆ، کە مامی سەرپەرشتیی دەکرد، نۆ ساڵ لەوێدا خوێندی تا تەمەنی بوو بە چواردە ساڵ. لەو دێرەدا فێری ژمارەیەك لە زانستە جیاوازەکان بوو، هەر وەك رێساکانی ژیانی رۆحیشی خوێند. ئەو دێرە بەشێك بوو لە موڵکەکانی پاپا، بەڵام هێزەکانی پاشا فردریکی دووەم (١١٩٤ ــ ١٢٥٠)پاشای سیسیلی، ناوچەی دێرەکەیان داگیرکرد، بەڵام راهیبەکان هێشتا لەسەر وەفای خۆیان بۆ پاپا مانەوە، بۆیە پاشا زۆر توڕەبوو، لە ساڵی ١٢٩٠دا فەرمانیدا بە شێوەی سەربازی دێرەکە داگیربکرێت و راهیبەکانی لێ وەدەربنرێن، تۆماش ناچار جلی دێرەکەی داکەند و بۆ چەند مانگێك گەڕایەوەماڵەوە.

زۆر لەگەڵ خێزانەکەی نەمایەوە، باوکی لە پاییزی هەمان ساڵدا ناردی بۆ زانکۆی ناپۆلی، کە پاشا فردریکی دووەم لە ساڵی ١٢٢٤دا دایمەزراندبوو، تا لەوێ خوێندنەکەی تەواو بکات، ئەوە بوو حەوت هونەرە ئازادەکەی خوێند: شیعر، نەحو، لۆژیك، وتاربێژی، ئەندازیاری، بیرکاری و گەردونناسی[٢٠٤]. لە شاری ناپۆلی، تۆمای لاو لەگەڵ رەهبانییەتی برا واعیزەکاندا ئاشنابوو، کە ماوەیەك لەوەوبەر قەشە دۆمینیکۆ (١١٧٠ ــ ١٢٢١) دایمەزراندبوو. دۆمینیکۆ قەشەیەکی کاسۆلیکیی ئیسپانی بوو، لە فەرەنسا کاری دەکرد، بەشێکی زۆری تەمەنی لە بەرەنگاربوونەوەی بێباوەڕیی و بانگەوازی بێباوەڕان بۆ گەڕانەوە بۆ باوەشی کڵێسای رۆمانی، بەسەر برد، پاشان لە ساڵی ١٢١٦دا کۆمەڵەی رەهبانییەتی دۆمینیکانی دامەزراند، کە تۆماش، سەرەڕای دژایەتیی توندی خێزانەکەی، بوو بە ئەندام تیایدا[٢٠٥]. چونکە کاتێك خێزانەکەی لە سەرەتای تەمەنیدا خستیانە دێری مۆنتی کاسینۆ، مەبەستیان ئەوە بوو فێرببێت و بەس، بەڵام ئێستا، کە گەیشتووەتە بیست ساڵی دەیەوێت ((بسوتێت))، واتە بە تەواوی لە دونیا دوور بێت، بە هۆشیاریی تەواوەوە و بە زانست و فێرکردنەوە سەرقاڵی خزمەتکردنی خودا بێت. سەرۆکەکانی تۆما لەو دژایەتییەی

خێزانەکەی ترسان، بۆیە بڕیاریاندا بەرەو پاریس دووری بخەنەوە، بەڵام دووان لە براکانی، بە فەرمانی دایکیان ڕێگگەیان لێگرت، گرتیان و هێنایانەوە بۆماڵەوە لە کۆشکی رۆکاسیکا، لەویٚ خرایە ژێر چاودێرییەوە و چیتر ماڵەکەیان بوو بە زیندانێك، کە تیایدا ئەو گەنجە رووبەڕووی چەوساندنەوە و گاڵتەپێکردن و هەڵخەڵەتاندنی پڕوپووچ دەبووەوە[٢٠٦]، ئەو زیندانییەش ساڵێکی خایاند[٢٠٧]، لەو ماوەیەشدا تۆما دەستی لە باوەڕی خۆی هەڵنەگرت و سووریش بوو لەسەری، تەنانەت توانی یەکێك لە خوشکەکانی بە ناوی مارکۆتا، پاش گفتوگۆکردنێکی زۆر، بهێنێتە سەر رەهبانییەتی بەنەدۆکتی، خێزانەکەشی بە ناچاری ئازادیان کرد، بە هێزی خواپەرستییەکەی، دایکی هێنایە ریزی خۆیەوە و وای لێکرد لە هەڵهاتندا یارمەتیی بدات، ئەویش بڕیاریدا پلانەکەی پێشووی جێبەجیٚ بکات، بۆ ئەو مەبەستەش چووە پاریس[٢٠٨] و ــ وەك دەوترێت ــ ماوەیەکی کورت مایەوە و دواتریش چووە کۆلۆنیا لە ئەڵمانیا.

لە کۆلۆنیا ئەلبێری مەزن (١٢٠٠ ــ ١٢٨٠)ی ناسی[٢٠٩]، ئەو فەیلەسوف و لاهوتییە ئەڵمانییەش هەر لە ساڵی ١٢٥١وە سەرقاڵی وانە وتنەوە بوو لەو پەیمانگە گشتییەی، کە لەو ماوەیەدا بۆ پەروەردەکردنی راهیبە دۆمنیکانییەکان دروست کرابوو، تۆما لەسەر دەستی ئەویش خوێندی، مامۆستاکەش زۆر بە تۆما سەرسام بوو، بۆی دەرکەوت، کە خوێندکارەکەی ئارەزوویەکی زۆری لە زانین هەیە، بە رادەیەك نازناوی ((گای سیسیلی))[٢١٠] لێنا، هەر لەو ماوەیەشدا، کە ئەو لە کۆلۆنیا بوو، بەردی بناغەی کاتیدرائییە بەناوبانگەکەی ئەو شارە دانرا.

ساڵی ١٢٥٢ قوتابخانەی (دێری سانت جاك)ی دۆمنیکانی لە پاریس، پێویستی بە مامۆستایەکی یاریدەدەر هەبوو، ئەلبێری مەزنیش تۆمای بۆ وەرگرتنی ئەو پۆستە پێشنیازکرد، دوای ماوەیەکیش پۆستەکەی پێدرا. لە هاوینی ١٢٥٢دا رووی کردە فەرەنسا و لەو دێرەدا دەستی بە وانە وتنەوە کرد. وانەکانیشی بریتی بوون لە راڤەکردن و لێکدانەوەی کتێبی پیرۆز و کتێبی حوکمەکانی بوتروس لومباردی(١١٠٠ ــ ١١٦٠)، کە لاهوتییەکی بە رەگەز ئیتاڵی بوو.

لەو نێوانەدا، دەمەقاڵێ لە نێوان پیاوانی دینیی غەیرە راهیب و راهیبەکاندا لەسەر مافی وانە وتنەوە لە کۆلێژی لاهوت لە زانکۆی پاریس، دروست بوو. ساڵی ١٢٥٧ و بە فەرمانی راستەوخۆی پاپا ئەلیکسەندەری چوارەم، تۆما وەك مامۆستا لە زانکۆی پاریس دامەزرا. ساڵی ١٢٦٠ ئەرکی واعزی گشتیی و ساڵی ١٢٦١یش ئەرکی خوێنەری لە دێری ئۆرڤیتۆ لە ناوەڕاستی ئیتاڵیا پێ سپێردرا، ماوەی چەند ساڵێکیش بە ئەرکی خوێنەری پاپایی هەستا. لە کاتی مانەوەیدا لە ئیتاڵیا کتێبەکەی بە ناوی (کورتەیەك دژی نەتەوەکان)ی نووسی، ساڵی ١٢٦٦یش دەستیکرد بە نووسینی کتێبە سەرەکییەکەی (خولاسەی لاهوتی). ساڵی ١٢٧٢ لە زانکۆی ناپۆلی وانەی وتەوە، لە شوباتی ١٢٧٤یشدا چووە فەرەنسا تا بەشداریی لە کۆمەڵەی لیۆندا بکات، بەڵام لە رێگەکەیدا سەردانی دێری فۆسا نۆڤای کرد و لەوێ توشی نەخۆشییەکی نەزانراو بوو، لەو دێرەدا لە ٧ی ئاداری ١٢٧٤ و لە تەمەنی چل و هەشت یان چل و نۆ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. پاشان تەرمەکەی گواسترایەوە بۆ زانکۆی پاریس و دواتریش بۆ تۆلۆز و لەوێ بە خاك سپێردرا. ساڵی ١٣٢٣ پاپا یوحەننای بیست و دووەم، تۆمای وەك قەشە ناساند، ساڵی ١٥٦٧یش پاپا بیۆسی پێنجەم رایگەیاند، کە تۆما دکتۆری کڵێسای کاسۆلیکییە، ساڵی ١٨٨٠یش پاپا نازناوی پارێزەر یان سەرپەرشتیای (قوتابخانە کاسۆلیکییەکان)ی پێ بەخشی[٢١١].

## ٢- سەدەکانی ناوەڕاست و ژن:

پێشتر گوتمان، کە قەشە تۆمای ئەکوینی، گەورەترین فەیلەسوفی مەسیحیی سەدەکانی ناوەڕاستە، جا ئایا مەبەستمان لە سەدەکانی ناوەڕاست چییە، وا ئەکوینی نوێنەرایەتیی فیکری ئەو سەردەمەی کردووە و بووە بە گەورەترین فەیلەسوفی؟ خەسڵەتەکانی چین، دۆخی ژن تیایدا چۆن بووە؟

بێگومان هەمیشە دابەشکردنی سەردەمە مێژووییەکان کارێکی مەترسیدارە، چونکە مەحاڵە بتوانیت بە وردی بەو کارە هەستیت، هۆکاری ئەوەش بە یەك

داچوونی سەردەمەکانە، بە جۆرێك، کە جیاکردنەوەیان لە یەکتری ئاسان نییە، چونکە مێژوو وەك ئەو رووبارە وایە، کە بە خێرایی و بە بێ وەستان بەرەو خوار دەڕوات. بۆیە هەموو ئەو دابەشکردنانەی کراون، بە رادەیەکی زۆر وەهمین و زیاتر لە دابەشکردنی جوگرافییانەی هێڵەکانی پانی و هێڵەکانی درێژی دەچێت، مەبەستیش لێی کارئاسانی کردنە بۆ توێژەر تا باشتر لە رووداوە مێژووییەکان تێبگات.

دەشێت بڵێین، زاراوەی سەدەکانی ناوەڕاست، بەشی خۆی گونجاوە بۆ ناونان و ناسینەوەی ئەو ماوەیەی مێژووی ئەوروپا، کە دەکەوێتە نێوان روخانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی و سەردەمی رێنیسانسەوە، واتە نزیکەی هەزار ساڵ (لە سەدەی چوارەمەوە تا سەدەی چواردەیەم). بیرمەندانی سەردەمی رێنیسانس دووبارە فیکر و هونەری یۆنانی و رۆمانییان زیندووکردەوە، بۆیە ئەوەی کەوتە نێوان سەردەمی کۆن و سەردەمەکەی خۆیانەوە، ناونرا بە ناوەڕاست یان نێوانگیر، یان سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست[212].

لە شەش سەدەی دوای مردنی جۆستنیان (٤٨٣ ــ ٥٦٥)دا کۆمەڵێك دۆخی جیاواز پێکەوە کەڵەکە بوون، کە کاریگەرییەکی ــ هەر چەندە لەسەرخۆش بێت ــ زۆری لەسەر گۆڕانی بنەڕەتیی کۆمەڵگا ئەوروپییەکان لە لایەنی ئابووری و سیاسی و ئەخلاقی و...هتد هەبوو. لەوێشەوە پێکهاتەیەکی تری ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی سەریهەڵدا، کە دواتر ناونرا بە سەردەمی دەرەبەگایەتی. چونکە کاتێك ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی روخا، خێڵەکانی باکوور هاتنە خوارەوە و گالی رۆمانی (فەرەنسای ئەمڕۆ) و ئیتاڵیایان داگیرکرد، دانییەکانیش لە بەریتانیادا جێگیربوون[213].

پاش ئەوەی شارەکانی ئیتاڵیا و گال بە هۆی هێرشی جێرمەنەکانەوە چیتر جێگەی سەلامەتی و دڵنیایی نەبوون، بەرپرسانی ئەو شارانە گواستیانەوە بۆ ناوچە گوندییەکان، هەرچی شوێنکەوتەشیان هەبوو لە وەرزێر و لایەنگر و گروپێك سەرباز، لە دەوری خۆیان کۆکردەوە. بزوتنەوەی جیابوونەوە، کە مەبەست لێی پێکهێنانی

یەکەی ئابووریی نیمچە سەربەخۆ بوو لە گوندەکاندا و پێکهێنانی ئەو دێرانەی راهیبەکانیان زەوییان دەکێڵا و کاری دەستییان دەکرد، تا دەهات بەهێزتر دەبوو، رێگەکانیش چیتر بە کەڵکی گواستنەوە و جوڵەی بازرگانی نەدەهاتن، بۆیە بەرپرسانی گوندەکان هەوڵیاندا لە رووی ئابورییەوە پشت بە خۆیان ببەستن. لە سەدەی نۆیەمیشەوە ئەو دەرەبەگایەتییە بوو بە میراتی و نیمچە سەربەخۆ. لەبەر ئەوەی زۆرینەی هێرشبەران سوارە بوون، بۆیە خواست لەسەر ئەو کەسانەشی، کە ئەسپیان هەیە و دەتوانن بەرگری بکەن زیاتر بوو، بەو هۆیەشەوە سوارەکان لە پیادەکان گرنگتر و کاریگەرتر بوون. لەوێشەوە، لە فەرەنسا و ئیتاڵیا و بەریتانیا و ئیسپانیا چینێکی سوارە دروست بوون، کە دەکەوتنە نێوان کۆنت و بارۆنەکان لە لایەکەوە و وەرزێرەکانیش لە لایەکەی ترەوە. گەلیش رقی لەو گۆڕانکارییانە نەبوو، چونکە حەزی بەوە دەکرد، کە سیستەمێکی سەربازی ئەوتۆی هەبێت، لە هێرشە ناوەخت و مەترسییە دەرەکییەکان بیپارێزێت، بەو شێوەیەش سیستەمی دەرەبەگایەتی دروست بوو، کە تیایدا دەبوو پیاو لە رووی ئابووری و سەربازییەوە، لە بەرامبەر رێکخستنێکی ئابووری و پارێزگارییەکی سەربازیدا، ملکەچی پیاوێکی لە خۆی باڵاتر بێت.

هەرچی کۆمەڵگای سەدەکانی ناوەڕاستە، لە ئازادەکان (خانەدان، پیاوی دینی، سەرباز و وەرزێر و..هتد) و کۆیلەکان پێك دەهات. یاساکانی کڵێساش ئەوەیان لە کۆیلە قەدەغەکردبوو، کە ببێتە قەشە، یان لەگەڵ ژنە مەسیحییە ئازادەکاندا هاوسەرگیری بکات. وەك چۆن قەشە تۆما کۆیلایەتی بەوە لێکدەدایەوە، کە ئەنجامی گوناهەکەی ئادەمە، هاوکات ئامرازێکی ئابووریشە لە جیهانێکدا، کە پێویستە هەندێك خەڵك زەحمەت بکێشن، تا ئەوانی تر بتوانن بیانپارێزن، ئەم بۆچوونانەش بە تەواوی لەگەڵ تیۆری ئەرەستۆدا دەربارەی کۆیلایەتی وێك دێنەوە[٢١٤].

بێگومان خێڵە جێرمەنییەکان لەگەڵ خۆیاندا، نەریت و یاسا و رێساکانی خۆیانیان هێنا و تا رادەیەك بەسەر یاسا و رێسا و نەریتی ئەو گەلانەیاندا سەپاند،

که داگیریان کردن[٢١٥]. بەڵام دینی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی ـــ دینی مەسیحی ـــ بوو بە دینی رەسمیی هەموو ئەوروپای خۆرئاوایی، تەنانەت لە هەندێك ماوەی سەدەكانی ناوەڕاستدا، پاپای رۆما نوێنەری خودا بووە لەسەر زەوی. هەروەها بە باوكی پیرۆزیش بانگیان دەكرد، لە زۆربەی پاشا و ئیمپراتۆری نەتەوە ئەوروپییەكان بەهێزتر بوو، لە لایەكی تریشەوە، بە درێژایی سەدەكانی ناوەڕاست، كڵێسا و تیۆرەكانی بوونە بەشێكی دانەبڕاو لە ژیانی رۆژانەی هەر كەسێكی ئەوروپیدا. لەبەر ئەوەش كاریگەریی هەڵوێستی كڵێسا لەسەر ژن، بە هۆی ئەو مانا و كرۆكەی لە خۆی دەگرت، هەروەها بە هۆی ئەو كاریگەرییە زۆرەی لەسەر ژیانی تاكەكان هەیبوو، زۆر گرنگ بوو. تیۆرەكانی كڵێساش لە سەرەتای سەدەكانی ناوەڕاستدا، بە زۆری پشتیان بە نووسینەكانی سەردەمی باوكە فەیلەسوفەكان دەبەست[٢١٦].

یاسا و تیۆرەكانی پیاوانی كڵێسا بە گشتی، دژی ژن بوون، تەنانەت هەندێك لە یاساكانی كڵێسا لە ملكەچپێكردنی ژناندا زیادەڕەوییان دەكرد. ژن لە دیدی قەشە و پیاوانی دینیدا، بە هەمان شێوەی خۆی لە دیدی قەشە یوحەننای دەم زێڕیندا مایەوە: خراپەیەكی پێویست، هەڵخەڵەتاندنێكی سروشتی، كارەساتێكی خوازراو، مەترسییەكی ناوماڵی، فیتنەیەكی تیابەر، خراپەیەكی بۆیەكراو. هێشتا حەوا لە هەموو شوێنەكاندا بەرجەستە دەبوو، بە هۆی حەواوە رەگەزی مرۆیی بەهەشتی لەدەستدا، هەر ئەویش وەسیلەی خۆشەویستی دەستی شەیتانە، كە بە هۆیەوە پیاوان راپێچی دۆزەخ دەكات[٢١٧]. تۆمای ئەكوینیش، كە زۆرجار بە پەیامبەری رەحمەت ناودەبرا، بە هەمان شێوەی راهیبەكان باسی ژنی دەكرد، لە هەندێك روویشەوە دەیهێنایە ئاستی كۆیلەوە.

((ژن، بە هۆی لاوازیی سروشتی ئەقڵی و جەستەییشەوە ملكەچی پیاوە. پیاو سەرەتا و كۆتایی ژنە، وەك چۆن خودا سەرەتا و كۆتایی هەموو شتەكانە. بە یاسای سروشت ملكەچی بەسەر ژندا سەپێنراوە، بەڵام بۆ كۆیلە وا نییە. پێویستە لەسەر مندالان، باوكیان زۆر زیاتر لە دایكیان خۆشبوێت))[٢١٨].

ئەگەر یاسای کڵێسا لەسەر مێردی فەرزکردووە، کە ژنەکەی بپارێزێت، لەسەر ژنیشی فەرزکردووە، کە گوێرایەڵی مێردەکەی بێت. خودا پیاو، نەك ژنی لەسەر وێنەی خۆی خەڵقکردووە. زانا کڵێساییەکەش لەو بارەیەوە دەڵێت: لەمەوە دەردەکەوێت، کە پێویستە ژن ملکەچی مێردەکەی بێت، تەنانەت پێویستە بە جۆرێك لە جۆرەکان خزمەتکاری پیاوەکەی بێت[٢١٩].

یاسای مەدەنی زۆر لە یاسای کڵێسایی زیاتر دوژمنایەتیی ژنی دەکرد، لە هەردوو یاساکەدا لێدانی ژن رێگەپێدراو بوو، هەروەها پێویست بوو لە دادگا بە هۆی (لاوازیی) ژنەوە رێگەی نەدرێت یەك وشەش بڵێت. ئەگەر پیاو خراپ مامەڵەی ژنی بکردایە، نیوەی ئەو غەرامەیەی بۆ هەمان حاڵەت بەسەر ژنێکدا دەسەپێنرا، غەرامە دەکرا. یاسا رێگەی لە ژنان گرتبوو ــ تەنانەت ئەوانەشیان کە سەر بە چینە باڵاکان بوون ــ نوێنەرایەتیی گوندەکانیان لە پەرلەمانی ئینگلتەرا، یان لە کۆمەڵەی گشتیی چینەکان لە فەرەنسادا بکەن. هاوسەرگیریی مافی تەواوی بە پیاو دەدا، کە سوود لە هەموو موڵکێکی ژنەکەی لە کاتی هاوسەرگیریدا وەربگرێت و مامەڵە بە قازانجەکەشییەوە بکات[٢٢٠].

سەرباری ئەوەش، بیرمەندانی سەدەی یانزەیەم و دوانزەیەم ئەرەستۆیان بە شێوەیەکی تر و بە وەرگێڕانی راستەوخۆی کتێبەکانی لە یۆنانییەوە، زیندوو کردەوە. بە وتەی مێژوونووسان ئەکوینی داوای لە ویلیام مۆربیك، هاوڕێ قەشەی دۆمنیکانیی کردووە، کە وەرگێڕانی ئەو کتێبانەی لە یۆنانییەوە بۆ لاتینی بۆ فەراهەم بکات. چونکە بە لایەوە گرنگ بوو بگەڕێتەوە سەر دەقە بنەڕەتییەکان، بە غەیری ئەو رێگەیەش نەدەکرا فەلسەفەی ئەرەستۆ لە سەربارکردنەکانی گەورە بیرمەندانی عەرەب، لە وێنەی ئیبن سینا و ئیبن روشد جیابکرێتەوە، بە تایبەتی، کە زۆر بیروباوەڕی سەر بە ئەفلاتونیزمی نوێ خرابووە سەر فەلسەفەی ئەرەستۆ. ئەوەشی پێی دەوترێت شۆردنەوە (تعمید)ی ئەرەستۆ، جگە لە ئاشتکردنەوەیەکی رووکەشانەی نێوان ئەو و مەسیحییەت هیچی تر نەبوو، ئەکوینی ویستی بەڵگاندنی فەلسەفیی تا

قولّترین ئاستی خۆی ببات، نەك بێت و کەرەستەیەکی زۆر کەڵکە بکات، کە بشێت بخرێتە چوارچێوەیەکی لاهوتییەوە بەو شێوەیەی هەیە[٢٢١].

تێڕوانینی قەشە تۆما بۆ ژن، بەبێ مشتومڕ، لەسەر بە کەم سەیرکردن بەند بوو، لای ئەو ڕۆڵی سەرەکیی ژن لە زاوزێدایە، پێویستە ئێمەش لەبەر ئەو هۆکارە سەرەکییە پارێزگاریی لێبکەین. لەو بارەیەوە دەڵێت: ئێمە پێویستمان بە ژنە، تا پارێزگاریی لە ڕەگەزی مرۆیی بکەین، هەروەها بۆ ئەوەشی خواردن و خواردنەوەمان پێبدات، هەر چەندە تاکە ڕۆڵی بێ هاوتای ئەو لە منداڵ خستنەوەدایە، چونکە ئامانجە مرۆییەکانی تر پیاو دەتوانێت بە شێوەیەکی باشتر و بە یارمەتیی پیاوەکانی تر پێیان هەستێت[٢٢٢]. لەبەر ئەو هۆکارەش تۆما هەستی دەکرد ژن پێویستیی بە پارێزگارییە، بە تایبەتی، کە ئەو هەڵگری ڕەگەزی مرۆییە. لێرەوە پێویستە مێردەکان بایەخ بە ژنەکانیان بدەن، هاوسەرگیریی ڕاستەقینەش ئەوەیە، تیایدا مێرد بایەخ بە ژن و منداڵەکانی دەدات، ئەوەش زۆر گرنگە، بەشێکی دانەبڕاویشە لە ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانی پیاو[٢٢٣].

بەڵام ئەو قسانەی کردمان، پێویستیان بە جۆرێك لە ڕوونکردنەوە و درێژەپێدان هەیە.

## ٣- سروشتی مرۆیی:

قەشە ئۆگەستین لە کەلەپووری یۆنانی و بە تایبەتیش ئەفلاتون سوودمەند بوو، بەڵام لەگەڵ هاتنی سەدەی سیانزەیەمدا، کە لەو کاتەدا کەلەپووری ئەرەستۆیی هاتبووە مەیدانەوە و تەنانەت دروشمی (گەڕانەوە بۆ ئەرەستۆ) بەرزکرابوویەوە، فیکری ئۆگەستین و لەگەڵیشیدا تۆنە ئەفلاتونییەکە وردە وردە لاواز بوون. قەشە تۆمای ئەکوینیش گەورەترین فەیلەسوفی بەدیبهێنەری ئەو دروشمە بوو، هەوڵیدا تێکەڵەیەك لە فیکری مەسیحی و فەلسەفەی ئەرەستۆیی دروست بکات، کە بە ڕوونی لە نووسینەکانیدا، لە پێش هەمووشیانەوە کتێبە مەزنەکەی (کورتەی لاهوتی)دا دەردەکەوێت.

ئەکوینی تیۆرێکی تەواوی ئەرەستۆی دەربارەی سروشتی مرۆیی وەرگرت، رەنگە زۆر لەوەی ئۆگەستین لەگەڵ ئەفلاتوندا کردی، زیاتر بووبێت، لە کاتێکدا ئۆگەستین بەوەندەوە وەستا، کە ئیلهام لە رۆحییەتی ئەفلاتونیی وەربگرێت.

قەشە ئۆگەستین، سەرەڕای جیاوازیی پرۆسە و جۆرەکانی، جەختی لە یەکێتیی نەفسی مرۆیی دەکردەوە. بەڵام جیاوازی کردنی ئەرەستۆ لە نێوان بوونی هێزەکی (بالقوه) و بوونی کردەنی (بالفعل) و لە نێوان هێز و توانا و وەزیفە و خود و بنەماکان و ...هتد دەرفەتی ئەوەی بۆ ئەکوینی رەخساند، بە هەمان رێچکەدا بڕوات و بە وردی جیاکاری لە نێوان هێز و توانا جیاوازەکانی نەفسی مرۆییدا بکات[٢٢٤]. بۆ نموونە، ئەویش هاوشێوەی ئەرەستۆ پێی وایە نەفس سێ پلەیە: نەفسی رووەکی (واتە توانای گەشەکردن) و نەفسی هەستیار (واتە توانای هەستکردن) و نەفسی ئاقڵ (واتە توانای ئەقڵ و بەڵگەکاری). ئەوەی یەکەم لە هەموو بوونەوەرە زیندووەکاندا هەیە، دووەمیش تەنیا لە گیانلەبەر و مرۆڤدا هەیە، هەرچی سێیەمیشە تەنیا لە مرۆڤدا هەیە. بەڵام ئەکوینی وردەکاری و روونکردنەوەی زیاتر بە بیرۆکەکانی ئەرەستۆ دەدات[٢٢٥]. پێی وایە نەفس سێ فۆرم یان هێزە: نەفسی رووەکی (بەمیان رێکدەخەین و گەشەدەکەین و زیاد دەکەین) و نەفسی هەستیار (بەمیان کارتێکەرە دەرەکییەکان وەردەگرین) و نەفسی شەهوانی (بەمیان ئارەزوو دەکەین و دەمانەوێت) و نەفسی بزوێنەر (بەمیان دەجوڵێین) و نەفسی ئاقڵ (بەمەشیان بیر دەکەینەوە)[٢٢٦]، بەڵام نەفس سەرەڕای جیاوازیی هێز و تواناکانی، هەر یەك یەکەیە. هەروەها ئەقڵیش، سەرەڕای جیاوازیی وەزیفەکانی هەر یەك یەکەیە، هەر چەندە نەفسی ئاقڵ وێنە نزمەکان یان ئەوانەی کەمتر کامڵن، ئەوانەی بەرپرسی چەند کردەوەیەکی پلە نزمانەن، لە خۆ دەگرێت، وەك وەزیفە نائەقڵییەکانی سروشتی مرۆیی، بەڵام دوا جار مرۆڤ یەك وێنەی جەوهەریی لایە. لێرەشەوە نەفسی ئاقڵ سەرەتای تێگەیشتن و ویستیش دەبێت، هەستکردن لە نەفسدا ئامادەیی نابێت، تەنیا لە تێکەڵبوونی نەفس

و جەستەدا نەبێت. ئەو تێکەڵەیە لە ڕێگەی نەفسی ئاقڵەوە توانای هەستکردنی دەبێت[227].

بەڵام ئایا ئەو سروشتە مرۆییە، سروشتی هەموو مرۆڤێك دەبێت؟ بە مانایەکی تر: ئایا ئەو هێزانەی سروشتی مرۆییان لێ پێکدێت، لای پیاو و ژنیش هەن؟ تۆما بە بەڵێ، بەڵام بە جۆرێك لە پارێزەوە، وەڵام دەداتەوە:

بە بۆچوونی تۆما چیرۆکی خەڵقکردنی ناو سفری تەکوین، بە روونی وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە، تیایدا هاتووە: ((خودا مرۆڤی لەسەر وێنەی خۆی خەڵقکرد، لەسەر وێنەی خودا خەڵقیکردن، لە ڕەگەزی نێر و مێ خەڵقیکردن)) (تکوین ١:٢٧). وێنەی خوداش لێرەدا، لە بنەڕەتدا سروشتە ئاقڵەکەیە، ئەوەش لای پیاو و ژنیش وەك یەك بوونی هەیە[228]. بۆیە کتێبی پیرۆز بە شێوەی کۆ باسی مرۆڤ دەکات و دەڵێت (لە ڕەگەزی نێر و مێ خەڵقیکردن) بۆ ڕەواندنەوەی گومانی ئەوەی، کە هەردوو ڕەگەزەکە لە تاکە کەسێکدا یەکیان گرتبێت[229].

ئەگەر قەشە تۆما بە هێندەوە ڕاوەستایە، هەنگاوێکی گەورە دەبوو لە مامەڵەکردنێکی دادپەروەرانە لەگەڵ ژن و یەکسانکردنی بە پیاو، هەروەها زۆر لە فەلسەفەی ئەرەستۆش دوور دەکەوتەوە، بەڵام ـــ بە داخەوە ـــ دەگەڕێتەوە سەر هەمان پارێزکردنەکانی پێشوو، کە بیرۆکەکە لە بنەوە هەڵدەتەکێنن، کاتێك، وەك ئەوەی چاوی بە وشەگەلێکی تری کتێبی پیرۆز کەوتبێت، کە وتەی پۆڵسی پەیامبەرن و دەپرسێت: ئەی چی دەربارەی وتەکانی پەیامبەر بڵێین؟ وا دیارە وێنەی خودا لای هەموو مرۆڤەکان وەك یەك نییە، چونکە قەشە پۆڵس دەڵێت: پیاو وێنەی خودایە و ژنیش وێنەی پیاوە[230]. ئینجا لەبەر ئەوەی ژن تاکێکە لە تاکەکانی ڕەگەزی مرۆیی، کەواتە وێنەی خودا لای هەموو تاکەکانی ڕەگەزی مرۆیی بوونی نییە.

لێرەدا ئەکوینی، بۆ دەرچوون لەو تەڵەزگەیە، پێشنیازێك دەخاتە ڕوو، کە خۆی لە ((مانای دووەم))ی وێنەی خودادا دەبینێتەوە، دەڵێت: وێنەی خودا مانایەکی دووەمی هەیە، کە خۆی لە پیاودا دەبینێتەوە، نەك لە ژندا، چونکە پیاو سەرەتا و کۆتایی و

ئامانجی ژنە، ڕێك وەك چۆن خودا سەرەتا و کۆتایی و ئامانجی گەردوونە، بۆیە کاتێك پەیامبەر وتوویەتی: خودا وێنە و شکۆی پیاوە و پیاویش وێنە و شکۆی ژنە، ئەو هۆکارەی باسکردووە، کە وای لێکردووە وەها بڵێت، ئەویش ئەوەیە: ((پیاو لە ژن نییە، بەڵکو ژن لە پیاوە، پیاویش لەبەر ژن خەڵقنەکراوە، بەڵکو ژن لەبەر پیاو خەڵقکراوە))[٢٣١].

ئایا لەبەر ئەوە وای وتووە، کە ژن لە پەراسووی پیاو خەڵقکراوە و بەوەش بووەتە بوونەوەرێکی پلە دوو، کەچی پیاو سەرەتا و بنەڕەت و بنچینەیە و هەر ئەویش کۆتایی و ئامانجی ژنە؟ با تاوێك لەسەر کێشەی خەڵقکردنی ژن بوەستین.

## ٤- خەڵقکردنی ژن:

قەشە تۆمای ئەکوینی لە چوار وتاری کتێبی کورتەی لاهوتیدا باسی خەڵقکردنی ژن دەکات[٢٣٢]. لە وتاری یەکەمدا دەپرسێت: ئایا پێویست بوو لە سەرەتای پرۆسەی خەڵقکردندا ژن خەڵقبکرێت؟ سێ ڕەخنە لەسەر خەڵقکردنی ژن دەورووژێنێت و پاشان وەڵامیان دەداتەوە، ئەوەش بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

**ڕەخنەی یەکەم:**

وا دیارە لە سەرەتای پرۆسەی خەڵقکردندا پێویست نەبوو ژن خەڵق بکرێت، چونکە فەیلەسوفەکە[٢٣٣] وتوویەتی ژن دەرهاویشتەیەکی شێواوی پیاوە[٢٣٤] (ئەکوینیش هەمان بۆچوونی هەیە و چەندین جاریش دووپاتی دەکاتەوە) و نابێت لە سەرەتای خەڵقکردندا شتێکی کەموکورت یان شێواو بوونی هەبێت، بۆیە نەدەبوو لە سەرەتای خەڵقکردنی بوونەوەرەکاندا ژن خەڵق بکرێت.

**ڕەخنەی دووەم:**

ملکەچی و کۆتوبەندکردنی ژنان لە ئەنجامی گوناهەکەوە بووە، بۆیە دوای گوناهەکە خودا پێی وتووە: ((ئازار و ماندووبوونی سکپڕیت زۆر دەبێت، بە ئازارەوە منداڵت دەبێت، هەمیشە بیری پیاوەکەت دەکەیت، ئەویش دەبێتە ئاغا

بەسەرتەوە))(تکوین ١٦:٣). گریگۆری دەڵێت: ئەگەر گوناه نەکرایە، جیاوازی و نایەکسانی بوونی نەدەبوو، بۆیە زۆر ئاساییە ئەگەر ژن لاوازتر و ڕێزی لە پیاو کەمتر بێت، چونکە بکەر ــ وەك ئۆگەستین بەردەوام دووپاتی دەکاتەوە ــ پلەی بەرزترە لەو کەسەی بەرکارە، بۆیە نەدەبوو لە سەرەتای خەڵقکردنی بوونەوەراندا پێش گوناهەکە ژن خەڵقبکرێت.

**ڕەخنەی سێیەم:**

دەبوو هۆکار و پاڵنەرەکانی گوناه لە بەردەم پیاودا نەبن، لەگەڵ ئەوەشدا خودا دەیزانی، کە ژن دەبێتە دەرفەتێك بۆ ئەوەی پیاو گوناه بکات، بۆیە نەدەبوو لە سەرەتای خەڵق کردندا ژن خەڵقبکرێت، بەڵام پێچەوانەی ئەوە ڕوویدا، لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە: ((خودای گەورە وتی باش نییە ئادەم بە تەنیا بمێنێتەوە، بۆیە هاوەڵێکی یارمەتیدەری بۆ خەڵق دەکەم))(تکوین ٢:١٨).

تۆمای ئەکوینی دەڵێت: وەڵامی من بۆ ئەو ڕەخنانە بەم شێوەیە دەبێت:

بە باوەڕی من پێویست بوو ژن خەڵق بکرێت، تا ببێتە هاوەڵێکی یارمەتیدەری پیاو، وەك ئەوەی لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە، نەك بۆ ئەوەی لە کارە جیاوازەکانیدا یارمەتی بدات، وەك ئەوەی هەندێك لە توێژەران دەڵێن. چونکە ڕاستییەکەی پیاو دەتوانێت ئەو کارانە ئەنجام بدات، تەنانەت هەموو ئەرکەکان لە ژن باشتر ئەنجام بدات ــ بە خودی کاری ناوماڵیشەوە ــ ئەگەر پیاوێکی تریش یارمەتی بدات چالاکتر دەبێت، بەڵکو مەبەست لێرەدا ئەوەیە، لە پرۆسەی زاوزێدا یارمەتیی پیاو بدات و کارئاسانیی بۆ بکات، دەتوانین بە باشی لەوە تێبگەین، ئەگەر لە جۆرەکانی زاوزێی گیانلەبەرە جیاوازەکان وردبینەوە: هەندێك گیانلەبەر خۆی ناتوانێت زاوزێ بکات، بۆیە پێویستی بە بکەرێکی دەرەکییە، هەندێکی تریشیان توانای زاوزێی ئیجابی و سەلبیشیی هەیە، وەك ئەوەی لە ڕووەکدا دەیبینین، کە لە ڕێگەی تۆوەوە زیاد دەکات[٢٣٥].

توانای ئیجابی لە پرۆسەی زاوزێدا دەگەڕێتەوە بۆ ڕەگەزی نێر، لە کاتێکدا توانای سەلبیی دەکەوێتە سەر ژن، لە رووەکیشدا توانای ئیجابی و سەلبی بە شێوەیەکی پێویست دەبنە یەك. لە گیانلەبەرانیشدا نێرینە جیا یان یەککگرتوو نابێت لەگەڵ مێینەدا، تەنیا لە حاڵەتی سێکسدا نەبێت، لێرەوە دەتوانین بڵێین نێر و مێ لە حاڵەتی سێکسدا دەبنە یەك، لە رووەکدا بە شێوەی بەردەوام دەبنە یەك، هەر چەندە لە هەندێك حاڵەتدا یەکێکیان کاریگەریی زیاتر دەبێت و پێش ئەوی تر دەکەوێت، لە حاڵەتەکانی تریشدا ئەوەکەی تریان سەردەکەوێت. بەڵام مرۆڤ وا خوڵقاوە، کە ڕۆڵێکی شیاوتر ببینێت، مەبەستمان وەزیفەی ئەقڵییە، بەوەش جیاکردنەوەی ئەو دوو توانایە لە مرۆڤدا پاساوێکی بەهێزی دەبێت، بۆیە دەبوو بە جیا لە پیاو خەڵق بکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت لە رووی جەستەییەوە و بە مەبەستی زاوزێ، ببن بە یەکێك [236].
ئەوەتا لە کتێبی پیرۆزدا راستەوخۆ دوای خەڵقکردنی ژن هاتووە: ((بۆیە پیاو باوك و دایکی جێدەهێڵێت و لەگەڵ ژنەکەیدا یەك دەگرێت و دەبن بە یەك جەستە))(تكوين ٢٤:٢).

پاش ئەو پێشەکییە درێژە دەربارەی پێویستیی خەڵقکردنی ژن لە پێناو زاوزێدا، بەم شێوەیە وەڵامی یەك بە یەکی رەخنەکان دەداتەوە:

**وەڵامی رەخنەی یەکەم:**

لە پەیوەست بە سروشتی فەردانییەتی ژنەوە، دەبینین هەبوویەکی نوقسان و شێواو و کەم وکورتە، چونکە توانای ئیجابیی نێر(کە لە پرۆسەی زاوزێدا بنەڕەتە) مەیلی لەوەیە منداڵێکی هاوشێوەی نێر (باوکی) بخاتەوە. جا ئەگەر منداڵەکە کچ بێت، بەڵگەی هەبوونی نوقسانییەکە لە توانای ئیجابیدا، دەشێت ئەنجامی هەندێك لادانی مادیش بێت (بەو شێوەی لە خوێنی سوڕی مانگانەدا هەیە) یان ڕەنگە ئەنجامی چەند کارتێکەرێکی دەرەکی بێت، لەوانەش بای باشوور، کە شێی زۆری هەڵگرتووە، بەو شێوەیەی، کە فەیلەسوفەکە باسیکردووە [237].

بەلاّم لە پەیوەست بە سروشتی مرۆییەوە وەك گشتێك، دەبینین ژن هەبوویەكی نوقسان یان شێواو و كەم وكورت نییە، بەڵكو دەبێتە بەشێك لە مەبەستەكانی سروشت، كە بەرەو پرۆسەی زاوزێ دەیبات، ئەو مەبەستە گشتییانەی سروشتیش پشت بە خودا دەبەستن، كە خالقی هەموو سروشتە. بۆیە كاتێك خودا بوونەوەرانی خەڵقكرد، نەك تەنیا پیاو، بەڵكو ژنیشی خەڵقكرد[٢٣٨].

لێرەدا دەبێت تێبینیی ئەوە بكەین، ئەكوینی دەیەوێت ئەو بیرۆكەیەی ئەرەستۆ، كە پێی وایە ژن هەبوویەكی نوقسان و شێواو و كەموكورتە، چونكە سروشت تەنیا لە حاڵەتی لاداندا ژن خەڵقدەكات، هۆكاری ئەوەش مەیلی بەردەوامی سروشتە لە خستنەوەی نێرینەیەكی هاوشێوەی باوك، لەگەڵ ئەو بیرۆكە دینییەدا بگونجێنێت، كە پێی وایە خودا چاكە و غەیری چاكەش خەڵقناكات، جا ئەگەر ژن خەڵقكراوی دەستی خودا بێت، چۆن دەبێت هەبوویەكی نوقسان و كەموكورت بێت؟ چۆن دەتوانین بڵێین لە سەرەتای خەڵقكردنی بوونەوەراندا، هەبوویەكی نوقسان و كەموكورت هەبووە؟

چارەسەری ئەكوینی لێرەدا ئەوەیە، كە بیرۆكەكەی مامۆستای یەكەم تەنیا بەسەر ژندا وەك تاكێك راست دەردەچێت: ئەم ژنە و ئەو ژنە هەبووی نوقسانن، چونكە لە ئەنجامی پرۆسەی زاوزێوە، كە پێكگەیشتنی گیانلەبەری مەنەویی پیاو و خوێنی ژنە، كەوتوونەتەوە. رەنگە لە ئەنجامی لاوازیی توانای پیتاندنی باوك، یان بە هۆی هەر فاكتەرێكی ترەوە، وەك بای شێداری باشوور كەوتبێتنەوە. ژن لادانە لە رێڕەوی راستەقینەی سروشت، كە هەمیشە دەیەوێت نێر بەرهەم بهێنێت، ژن لە وەها حاڵەتێكدا نێرینەیەكی بەدبەختە، بۆیە مەخلوقێكی عارزی لاواز دەبێت.

ژن لە گۆشەنیگایەكی ترەوە، مەخلوقێكی راستەوخۆی دەستی خودایە، بۆیە لێرەدا هەبوویەكی فەردیی نوقسان و لاواز نییە، چونكە لە وەها حاڵەتێكدا باس لە ژن وەك تاك ناكەین، بەڵكو باسی ئەو سروشتە هەمەكییە دەكەین، كە خودا خەڵقیكردووە و ئەركی پاراستنی رەگەزی مرۆیی خستووەتە سەری. مادام دەبێت پارێزگاریی لە رەگەزی مرۆیی بكەین، كەواتە خودا شان بە شانی پیاو، ژنیشی

خەڵقکردووە، واتە سروشتی هەمەکیی ژن، یان بیرۆکەی ژن بە شێوەی گشتی نوقسان و کەم وکورت نییە. پێشتریش بینیمان، کە دەیوت: لەبەر ئەو رۆڵە بێ وێنەیەی لە پاراستنی رەگەزی مرۆییدا پێی هەڵدەستێت، پێویستمان بە ژنە.

**وەڵامی رەخنەی دووەم:**

ملکەچکردنی ژن بۆ پیاو مانایەکی دوو سەرەی هەیە: یەکەمیان، ملکەچیی کۆیلە ئاسایە، بەمەش ئەوەی باڵاترە، ئەوەی نزمتر بەکاردەهێنێت و بۆ خۆی سوودی لێ وەردەگرێت، ئەم جۆرە لە ملکەچی دوای گوناهەکە هاتە ئاراوە. دووەمیان: پێی دەوترێت ملکەچیی مەدەنی یان ئابووری، ئەوەی باڵاترە، ئەوەی نزمتر بۆ بەرژەوەندی و خێری تایبەتیی خۆی بەکاردەهێنێت، ئەم جۆرە ملکەچییە تەنانەت پێش گوناهەکەش هەر هەبووە، چونکە سیستەمی باش و گونجاوی خێزانی مرۆیی، ئەگەر کەسێك تیایدا حوکم نەکات و لە ئەندامانی تر داناتر نەبێت، نوقسان و کەم وکورت دەبێت. لێرەوە ژن، بە سروشتی خۆی ملکەچی پیاوە، هۆکاری ئەو ملکەچییەش ئەوەیە، لای پیاو توانای ئەقڵ باڵادەستە، لە کاتێکدا لای ژن هەڵچوون و سۆز زاڵن، ئەوەش شتێکی سروشتییە، چونکە پیاو توانای جیاکردنەوە و باڵادەستیی ئەقڵی هەیە. جیاوازیی نێوان خەڵکیش ئەگەرێکی بەهێزە، تەنانەت لە منداڵیشدا.

**وەڵامی رەخنەی سێیەم:**

ئەگەر خودا هەموو دەرفەتەکانی گوناهکردنی نەهێشتایە، جیهانی لەو دەرفەت و بۆنانەی، کە وا دەکەن مرۆڤ بکەوێتە گوناهەوە بێبەش بکردایە، ئەو کات سیستەمی گەردوون نوقسان و ناکامڵ دەبوو، نەشماندەتوانی بڵێین دەکرا لەبەر سوودی گشتی رێگە لە خراپەی فەردی بگیرێت، بە تایبەتی، کە خودا بۆ هەموو شتێك بە توانایە، تەنانەت دەتوانێت خراپە بەرەو مەبەستێکی چاك ئاراستە بکات[٢٣٩].

## ٥- خەڵقکردنی ژن لە پیاوەوە:

کێشەی دووەم، کە ئەکوینی لێی دەکۆڵێتەوە، خۆی لەم پرسیارەدا دەبینێتەوە: ئایا پێویست بوو ژن لە پیاوەوە خەڵقبکرێت؟ لێرەشدا سێ رەخنە دەورووژێنێت و وەڵامیشیان دەداتەوە:

**رەخنەی یەکەم:**

نەدەبوو ژن لە پیاوەوە خەڵق بکرێت، چونکە مرۆڤ و گیانلەبەر پێکەوە سەر بە یەك رەگەزن. لەبەر ئەوەی مێینە لە گیانلەبەرەکانی تردا لە نێرینەوە خەڵق نەکراوە، دەبوو لە حاڵەتی مرۆڤیشدا بە هەمان شێوە بێت.

**رەخنەی دووەم:**

سەرەڕای ئەوەش، هەموو بوونەوەران، کە سەر بە هەمان جۆرن، لە هەمان مادە خەڵقکراون.

لەبەرئەوەشی نێر و مێ لە مرۆڤدا سەر بە هەمان جۆرن، دەبوو لە هەمان مادەوە خەڵق بکرانایە. مادام پیاو لە قوڕێکی لینجەوە خەڵقکراوە، دەبوو ژنیش لە هەمان ئەو مادەیە خەڵق بکرایە، نەك لە پیاوەوە[٢٤٠].

**رەخنەی سێیەم:**

ژن بۆ ئەوە خەڵقکراوە تا هاوەڵێکی یارمەتیدەری پیاو بێت لە پرۆسەی زاوزێدا. بەڵام پەیوەندیی توندی سۆز و خۆشەویستی بەس نییە تا کەسێك بەو رۆڵە هەستێت، بۆیە لە کتێبی پیرۆزدا هاوسەرگیری لەگەڵ خزمە نزیکەکاندا حەرام کراوە ((نابێت مرۆڤ لە خزمەکانی نزیك بێتەوە و عەورەتیان ئاشکرا بکات، من خواوەندم، عەورەتی باوك و عەورەتی دایکت ئاشکرا مەکە))(لاوییەکان ٦:١٨-٩). بۆیە نەدەبوو ژن لە پیاوەوە خەڵق بکرێت، هەر چەندە کتێبی پیرۆز دەڵێت (لەوەوە) واتە (لە پیاو) هاوەڵێکی یارمەتیدەری بۆ خەڵقکرد، کە ژن بوو.

ئەکوینی پێش ئەوەی وەڵامی هەریەکە لەو ڕەخنانە بداتەوە، وەڵامێکی گشتییان دەداتەوە و دەڵێت: ((کاتێك لە سەرەتاوە بوونەوەران خەڵقکران، بۆ ژن زۆر لە گیانلەبەرانی تر گونجاوتر بوو، کە لە پیاوەوە خەڵق بکرێت، ئەوەش لەبەر ئەو هۆکارانە:

**یەکەم:** بۆ ئەوەی ڕێزێکی تایبەتی بە پیاوی یەکەم بدرێت، چونکە خودا ـــ بە حوکمی ئەوەی سەرەتای هەموو گەردوونە ـــ پیاوی یەکەمی لەسەر وێنەی خۆی خەڵقکردووە، تا ببێتە سەرەتای هەموو ڕەگەزی مرۆیی. بۆیە پۆڵسی پەیامبەر وتوویەتی: ((خودا ڕەگەزی مرۆیی لە یەك خوێنەوە خەڵقکردووە))(**أعمال الرسل ١٧ ـــ ٢٦**).

**دووەم:** پیاوی یەکەم ژنی زۆر خۆشویستووە و پێوەی پەیوەست بووە، وەك لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە ((خودا لەو پەراسووەی لە ئادەمەوە بردی ژنێکی خەڵقکرد، هێنای بۆ ئادەم و ئەویش وتی: ئەمە چیتر ئێسکێکە لە من و گۆشتێکە لە گۆشتی من، بەمە دەڵێین ژن(امرأة) چونکە لە پیاوێکەوە(امرئ) خەڵقکراوە. بۆیە پیاو دایك و باوکی جێدەهێڵێت و بە ژنەکەیەوە پەیوەست دەبێت و دەبن بە یەك جەستە))(**تکوین ٢:٢٣ ـــ ٢٤**).

ئەوەش لە ڕەگەزی مرۆییدا، کە ژن و پیاو تیایدا لە ژیانێکی هاوبەشدا پێکەوە دەژین، شتێکی زۆر پێویست بووە، بەڵام لە گیانلەبەراندا وا نییە.

**سێیەم:** وەك فەیلەسوفەکە دەڵێت، نێرینە و مێینەی مرۆڤ تەنیا لەبەر زاوزێ یەك ناگرن، وەك ئەوەی لە گیانلەبەرانی تردا دەیبینین، بەڵکو لە پێناو پێکەوەنانی ژیانێکی خۆش یەك دەگرن، کە ژن و مێرد ئەرکی خۆیان جێبەجێ دەکەن و پیاویش تیایدا سەری ژن دەبێت[٢٤١].

لەبەر ئەو هۆکارە وا گونجاو بوو، کە ژن لە پیاوەوە خەڵق بکرێت، چونکە لە وەها حاڵەتێکدا لە سەرچاوەی خۆیەوە خەڵق دەکرێت.

**چوارەم:** هۆکارێکی تر هەیە پەیوەندیی بە نهێنییە پیرۆزەکان (نهێنیی هاوسەرگیری)یەوە هەیە، واتە کڵێسا بنەڕەتی خۆی لە مەسیحەوە وەرگرتووە، بۆیە پۆڵس وتوویەتی ((ئەی گرۆی ژنان، وەك چۆن ملکەچی خودا دەبن، ملکەچی پیاوەکانتان بن،

چونکە پیاو سەری ژنە، وەك چۆن مەسیحیش سەری کڵێسا و رزگارکەری جەستەیە، بەڵام وەك چۆن کڵێسا ملکەچی مەسیح دەبێت، دەبێت ژنانیش لە هەموو شتێکدا ملکەچی پیاوەکانیان بن))(نامەی پۆڵس بۆ خەڵکی ئوفسوس ٥:٢٢ ــ ٢٤).

بەو شێوەیە، ئەکوینی لە ناواخنی ئەو وەڵامە گشتییەدا وەڵامی رەخنەی یەکەمی داوەتەوە، کە دەڵێت: نەدەبوو ژن لە پیاوەوە خەلْق بکرێت، چونکە شتی وەها لە گیانلەبەرانی تردا روونەداوە. پێوانەکە لێرەدا هەڵەیە، چونکە لە حاڵەتی مرۆڤدا رۆڵی سەرەکیی ژن پێکهێنانی خێزانە، کە پارێزگاریی لە رەگەزی مرۆیی دەکات. ئەوەش پێویستیی بە پەیوەندییەکی بەهێزە لە نێوان ژن و پیاودا، جا چی لەوە بەهێزترە، کە لە پیاوەوە خەلْق بکرێت؟!

وەڵامی ئەکوینی بۆ رەخنەی دووەم، تایبەت بەو مادەیەی مرۆڤی لێ خەلْقکراوە بریتییە لەوەی، مادەیەکی دیاریکراو شتێکی دیاریکراو بەرهەم دەهێنێت، لەبەر ئەوەشی توانای خودا بێ سنور و بێ کۆتاییە، بۆیە دەتوانێت لە هەر مادەیەکەوە بێت بوونەوەری هەمەجۆر بەرهەم بهێنێت، توانای ئەو پەیوەست نییە بە جۆرێکی دیاریکراوی خەلْقکردنەوە، ئەوەش لە خەلْقکردنی مرۆڤدا بە ئاشکرا دیارە: خودا پیاوی لە قوڕی زەوی خەلْقکرد، لە کاتێکدا ژنی لە پەراسووی پیاوەوە خەلْقکرد.

هەرچی رەخنەی سێیەمیشە، کە هاوسەرگیریی لەگەڵ خزمەکاندا حەرام دەکات، بەوە وەڵام دەدرێتەوە، کە خۆشەویستی و سۆز لە زاوزێی سروشتییەوە دروست دەبن، بۆیە دەبێتە رێگر (مانع) لە هاوسەرگیری. بەڵام ژن لە پرۆسەی خەلْقکردنی یەکەمدا لە رێگەی زاوزێوە لە پیاو نەکەوتەوە، بەڵکو بە تەنیا بە توانای خودایی خەلْقکرا، بۆیە ئێمە حەوا بە کچی ئادەم نازانین. بەم شێوەیەش لاوازیی ئەو رەخنەیەمان سەلماند[٢٤٢].

## ٦- ژن و پەراسووی پیاو:

کێشەی سێیەم، کە ئەکوینی لێی دەکۆڵێتەوە ئەوەیە: ئەگەر باوەڕ بکەین بەوەی شیاوە ژن لە پیاوەوە خەڵق بکرێت، ئایا ئەوەش شیاوە، کە لە پەراسوویەوە خەڵق بکرێت؟ ئەکوینی، وەك هەمیشە، سێ ڕەخنە دەورووژێنێت و وەڵامیان دەداتەوە:

**ڕەخنەی یەکەم:**

ئاسان نییە باوەڕ بەوە بکەین، کە ژن لە پەراسووی پیاو خەڵقکراوە، چونکە قەبارەی پەراسووی پیاو زۆر لە قەبارەی جەستەی ژن بچووکترە. ڕاستە دەشێت گەورەترین شت لە بچووکترین شت دروست بکرێت، بەڵام بە یەکێك لەم دوو ڕێگەیە دەبێت: یەکەمیان لە ڕێگەی زیادکردنەوە، واتە کەرەستەی تر بخەینە سەر ئەو شتە بچووکە، بەڵام ئەگەر بڵێین لە حاڵەتی خەڵقکردنی ژندا مادەی تر سەربارکراوە، ئەو کات ناتوانین بڵێین بە تەنیا لە پەراسووی پیاو خەڵقکراوە. دووەمیان لە ڕێگەی هەواتێکردن(الخلخله)ەوە[٢٤٣] چونکە ناکرێت بارستایی تەنێك زیاتر بکرێت ـــ وەك ئۆگەستین دەڵێت ـــ لە ڕێگەی هەواتێکردنەوە نەبێت، بەڵام وەك تێبینیی دەکەین جەستەی ژن، ڕێژەی هەوای تێدا لە جەستەی پیاو زیاتر نییە، یان بەلای کەمەوە هێندەی پەراسوویەك بۆ جەستەی حەوا، کەواتە حەوا لە پەراسووی ئادەم خەڵقنەکراوە.

**ڕەخنەی دووەم:**

جگە لەوەش، لە سەرەتای خەڵقکردندا هیچ شتێکی زیادە بوونی نەبوو، بۆیە پەراسووی ئادەم دەبێت کاریگەریی لە جەستە و سەلامەتی کردبێت، کەواتە ئەگەر ئەو پەراسووە لابرێت، جەستەی ئادەم نوقسان دەبێت، ئەوەش کارێکی ناماقوڵە و لەگەڵ ئەو مەبەستەدا، کە خودا ئادەمی بۆ خەڵقکردووە، نایەتەوە.

**ڕەخنەی سێیەم:**

هەروەها ناکرێت پەراسووی پیاوێك بەبێ ئازار لابرێت، بەڵام خۆ پێش گوناهەکە ئازار نەبوو، بۆیە دروست نییە پەراسووی پیاوێك ببرێت تا حەوای پێ دروست بکرێت، بەڵام

پێچەوانەی ئەوەمان بینی، ئەوەتا لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە: ((خودا لەو پەراسووەی لە ئادەم بردی، ژنێکی خەڵقکرد))(تکوین ٢:٢٢).

ئەکوینی وەڵامی ئەو رەخنانە دەداتەوە و بەشێوەیەکی گشتی دەڵێت: لەبەر ئەم هۆیانەی لای خوارەوە، دەکرا ژن لە پەراسووی ئادەم خەڵقبکرێت:

**یەکەم:** وەك جەختکردنەوەیەك لە یەکێتیی کۆمەڵایەتیی ژن و پیاو، نابێت ژن دەسەڵاتی بەسەر پیاودا هەبێت، بۆیە لە سەرییەوە خەڵقنەکراوە. هەروەها نابێت پیاو مامەڵەی کەنیزەك لەگەڵ ژندا بکات، بۆیە لە پێیەوە خەڵقنەکراوە، بۆیە باشترین جێگەیەك: پەراسووی پیاو بوو.

**دووەم:** پەیوندیی بە نهێنییە پیرۆزەکانەوە هەیە، چونکە لە کەمەری مەسیحەوە، کە لەسەر خاچ خەوی لێکەوتبوو، نهێنییە پیرۆزەکان: واتە خوێن و ئاو، کە کڵێسایان لەسەر بەندە، هەڵقوڵان[٢٤٤].

پاشان ئەکوینی وەڵامی یەك بە یەکی رەخنەکان دەداتەوە:

**وەڵامی رەخنەی یەکەم:**

دروست ە بڵێین، ژن لە پەراسووی ئادەم خەڵقکراوە بێئەوەی بە هیچ شێوەیەك هیچ مادەیەکی سەربار کرابێت، نموونەیەکی باشیش بۆ ئەوە هەیە: ئەو کاتەی مەسیح توانی لە پێنج پارچە نانەوە ژمارەیەکی زۆری نان دەربهێنێت و هەزاران کەسیان پێ تێربکرێت[٢٤٥]، چونکە زیادەیەکی لەو شێوەیە یان بە گۆڕینی جەوهەری مادەکە، یان بە گۆڕینی خەسڵەتەکانی دەبێت. جا ئەگەر جەوهەری مادەکە شیاوی گۆڕین و دەستکاریکردن نەبێت، ئەوکات فرەیی و هەمەجۆری و قەبارە، مەسەلەگەلی دەرەکین و دوورن لە جەوهەری مادەکەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین، کە لە رێگەی خەڵقکردنەوە دەکرێت رەگەزی تر بۆ مادە سەربار بکرێت. لێرەدا ئۆگەستین وتوویەتی، کە مەسیح بە پێنج پارچە نان پێنج هەزار پیاوی تێرکردووە، وەك چۆن چەند دەنکە تۆوێك بەرهەمێکی زۆری گەنم دروست دەکەن، بە هەمان ئەو شێوەیەی دەڵێین کۆمەڵێکی زۆر بە پێنج پارچە نان تێرکراون، بە هەمان شێوەش

دەڵێین ژن لە پەراسووی پیاو خەڵقکراوە، پێدەچێت لە هەردوو حاڵەتەکەشدا، واتەی نان و پەراسوو، مادەی تر بۆ شتە بنەڕەتییەکە سەربار کرابێت.

**وەڵامی رەخنەی دووەم:**

پەراسوو پەیوەستە بە سەلامەتی و تەندروست یی جەستەی ئادەمەوە، وەك تاکێك نا، بەڵکو وەك سەرەتایەکی رەگەزی مرۆیی، وەك چۆن گیانلەبەری مەنەوی پەیوەستە بە سەلامەتیی بکەر و ئارەزووکردنییەوە لە چێژی سروشتی، بۆیە بە دروست ی دەزانم، ئەگەر بڵێین بە یارمەتیتی توانای خودایی جەستەی ژن لە پەراسووی پیاوەوە خەڵقکراوە. وەڵامم بۆ رەخنەی سێیەمیش هەمان شت دەبێت[٢٤٦].

## ٧- ژن و خەڵقکردنی راستەوخۆ:

ژن لە شوێنێکی دیاریکراویی پیاوەوە، کە پەراسوویەتی، خەڵقکراوە. جا ئایا ئەم خەڵقکردنە راستەوخۆ بووە؟!

لێرەشدا ئەکوینی سێ رەخنە دەورووژێنێت و وەڵامیشیان دەداتەوە:

**رەخنەی یەکەم:**

خودا ژنی راستەوخۆ خەڵقنەکردووە، چونکە خودا هیچ تاکێکی راستەوخۆ لە تاکێکی ترەوە خەڵقنەکردووە، کە لە جۆردا لەو بچێت. بۆیە خودا راستەوخۆ ژنی خەڵقنەکردووە.

**رەخنەی دووەم:**

لەلایەکی ترەوە ئۆگەستین دەڵێت، خودا لە رێگەی فریشتەوە کۆنترۆڵی شتە مادییەکان دەکات. لەبەر ئەوەشی جەستەی ژن مادەیە، بۆیە بە سەرپەرشتیی فریشتەکان خەڵقکراوە، بەڵام بە شێوەی راستەوخۆ خەڵقنەکراوە.

**رەخنەی سێیەم:**

مادام ئەو شتانەی لە پرۆسەی خەڵقکردندا هێنرانە بوون، پێش بنەما هۆکارییەکانیان کەوتوون، بۆیە دروست کردنیان لە رێگەی هەندێك لە مەخلوقاتەوە دەبێت، نەك راستەوخۆ لە رێگەی خوداوە. لەبەر ئەوەشی، کە جەستەی ژن ـــ وەك ئۆگەستین دەڵێت ـــ

لە بنەما هۆکارییەکانییەوە لەنێوان یەکەمین دروست کراواندا خەڵقکراوە، بۆیە خەڵقکردنێکی راستەوخۆ نەبووە.

ئەکوینی بە شێوەیەکی گشتی وەڵامی ئەو رەخنانە دەداتەوە و دەڵێت: زاوزێی سروشتیی هەر جۆرێك لە مادەیەکی دیاریکراوەوە دەبێت. ئەو مادەیەشی، کە مرۆڤ بەشێوەی سروشتی زاوزێی لێوە دەکات گیانلەبەری مەنەویی پیاوە لەگەڵ ژندا. بەو شێوەیە تاك لە رەگەزی مرۆڤدا، ناشێت بە شێوەی سروشتی لە هیچ مادەیەکی ترەوە بێتە بوون، بەڵام تەنیا خودا، کە هۆکاری هاتنە بوونی سروشتە، دەتوانێت راستەوخۆ لە پەراسووی پیاوەوە ژن خەڵقبکات، چونکە ئەو دەتوانێت لە رێڕەوی ئاسایی و باوی سروشت دەربچێت. بۆیە تەنیا هەر ئەوە، کە دەتوانێت راستەوخۆ پیاو لە قوڕێکی لینج و ژنیش لە پەراسووی پیاو خەڵقبکات.

**وەڵامی رەخنەی یەکەم:**

ئەو رەخنەیە لە جێی خۆیدا نابێت، تەنیا ئەگەر باسی وەچەخستنەوەی تاکێك بە شێوەی سروشتی لە کەسێکی ترەوە بکەین، کە لە جۆردا لە خۆی بچێت. بەڵام خەڵقکردنی حەوا ناوازەیە و پێوانەی لەسەر ناکرێت، بۆیە هیچ رێگرێك نییە بۆ ئەوەی هەردووکیان راستەوخۆ خەڵقبکرێن.

**وەڵامی رەخنەی دووەم:**

ئۆگەستین دەڵێت ئێمە نازانین خودا لە خەڵقکردنی ژندا فریشتەی بەکارهێناوە یان نا، بەڵام بەجۆرێك دڵنیاین لەوەی، کە وەك چۆن فریشتە لە خەڵقکردنی پیاودا لە قوڕێکی لینجەوە بەشداریی نەکردووە، بە هەمان شێوەش لە خەڵقکردنی ژندا لە پەراسووی پیاوەوە بەشدار نەبووە.

**وەڵامی رەخنەی سێیەم:**

ئۆگەستین دەڵێت خەڵقکردنی یەکەمی بوونەوەران، پێویستی نەکردبوو ژن بەو شێوەیە خەڵقبکرێت. بۆیە تەنیا مومکین بوو بۆی، کە بەو شێوەیە خەڵقبکرێت، کەواتە جەستەی ژن بەپێی ئەو بنەما هۆکارییانەی یەکەم کاری خەڵقکردن بوونێکی پێشینەی هەبووە،

بەگوێرەی ئیمکانی ئیجابی نا، بەڵکو بەگوێرەی ئیمکانی سەلبی، کە توانا ئیجابییەکانی خودا رێکیدەخات.

## ٨ ـ کۆمەڵگا و خێزان:

گەردون لای تۆمای ئەکوینی ـــ هەروەك لای ئەرەستۆش ـــ سیستەمێکی رێکخراوە، لە چەند پلەیەك پێکدێت. لە خوداوە، کە باڵاترین بوونە، دەستپێدەکات تا دەگاتە نزمترین مەخلوق. هەر بوونەوەرێك بە پاڵنەرێکی ناوەکی، کە لە سروشتیەوە وەریگرتووە کاردەکات، هەوڵی خێر یان کەماڵی گونجاو دەدات بۆ مەخلوقەکانی تری چینەکەی خۆی، بەردەوامیش دەبێت لە تێکۆشان، تا کاتێك جێگەی خۆی لەو سیستەمە هیرارکییەدا، بەپێی ئەو پلەی کەماڵەی پێی گەیشتووە، دەگرێت. لە هەموو حاڵەتێکدا باڵا کۆنترۆڵی نزم دەکات و سوودی لێ وەردەگرێت، هەموو بوونەوەرێکی زیندووش چەندە بچووك بێت، بەهای خۆی هەر دەبێت. لە وەها سیستەمێکدا سروشتی مرۆیی پێگەیەکی ناوازەی لەنێوان هەموو مەخلوقەکاندا دەبێت. نەك تەنیا لەبەر ئەوەی مرۆڤ جەستەی هەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەقڵ و رۆحیشی هەیە، کە بەهۆیانەوە نزیکترین مەخلوقە لە خوداوە. تاکە بوونەوەریشە، کە لە یەککاتدا لە جەستە و رۆحیش پێکدێت، هەموو سیستەم و یاسایەکیش، کە کۆنترۆڵ و ئاراستەی ژیانی دەکەن، پشت بەو راستییە بنەڕەتییە دەبەستن.

کۆمەڵگاش هاوشێوەی سروشت ئامانج و مەبەستگەلی خۆی هەیە، کە نزم ناچار دەکەن خزمەتی باڵا بکات و گوێڕایەڵی بێت، لەکاتێکدا پێویستە لەسەر باڵا، کە ئاغایەتیی نزم بکات. پێویستە ئاگامان لەوە بێت، کە ئەکوینی چەمکە سیاسییەکان لە ئەرەستۆوە دەخوازێت و بەسەر گەردوندا پراکتیکی دەکات، یان لە ریزبەندی پلەی هەبووەکان(واتە هیرارکییەتی گەردون)ەوە بنەمایەك وەردەگرێت و بەسەر دەوڵەتدا پراکتیکی دەکات، بەجۆرێك بە تەواوەتی نەزانین کامیان پێش ئەوی تریان کەوتوون، ئەوەش لەکاتێکدا بیرۆکەی ریزبەندیی هیرارکی، بیرۆکەیەکی میتافیزیکییە[٢٤٧].

ئەکوینی لەوەشدا شوێنی ئەرەستۆ کەوتووە، کاتێك کۆمەڵگا بەوە ناودەبات، کە بریتییە لە گۆڕینەوەی خزمەتگوزاری و سوود، بەمەبەستی گەیشتن بە ژیانێکی باش، کە چەندین کار و پیشەی جیاواز تیایدا بەشداربن. وەرزێر و پیشەساز پێویستییە مادییەکان بە کۆمەڵگا دەدەن، قەشەش بە نوێژ و بەڕێوەبردنی سروتەکان بەشداری دەکات، هەموو گروپێکی تریش بەو کارەی تێیدا شارەزا و دەستڕەنگینن بەشداری دەکەن. چاکەی گشتیش وا دەخوازێت، کە ئەو سیستەمە دەستەیەکی بەڕێوەبردنی هەبێت تا ئیدارەی کارەکانی بکات، وەك چۆن ڕۆح ئیدارەی جەستە دەکات[٢٤٨].

هەرچی خێزانیشە، ئەکوینی پێی وایە نموونەیەکی سروشتیی ماقوڵی کۆمەڵگایەکی بچووکە، کە ئامانجی وەچەخستنەوە و پەروەردەکردنی منداڵ و چاکەی دوو لایەنەی نێوان ژن و مێردە. تێڕوانینی ئەکوینی بۆ خێزان لە بنەڕەتدا کاریگەرە بە دوو وەزیفەی جەوهەری: وەچەخستنەوە و پەروەردەکردنی منداڵ. لەبەر ئەوە پێویستە هاوسەرگیریی تاکانە بێت، واتە تەنیا یەك ژن و یەك پیاو بن، بۆ ئەوەی هەردووکیان بۆیان بلوێت سەرپەرشتیاری گەشە و فێرکردن و پەروەردەکردنی منداڵەکان بکەن، دەبێت بنچینەی مامەڵەکردنیان لەگەڵ یەکدا ڕاستگۆیی و سۆزی هەردووکیان بێت بۆ یەکتری. لەو وتانەشیدا زۆر کاریگەرە بەو بەڵگانەی ئەرەستۆ، کە دەربارەی هاوسەرگیریی تاکانە لە فەلسەفە سیاسییەکەیدا دەیانهێنێتەوە[٢٤٩].

دەربارەی دۆخی ژنیش لە خێزاندا، ئەکوینی زۆر بە سانایی باوەڕی بە نزمیی ژن هەیە، ژن پلەی لە پیاو نزمترە، پێویستمان بە ژنە بۆ پارێزگاری کردن لە ڕەگەزی مرۆیی، ڕۆڵی ناوازەی ئەویش لە خێزاندا بریتییە لە وەچەخستنەوە، لەبەر ئەوە پێویستە ئێمەش ئەو بپارێزین، چونکە ئەرکی یەکەمی خێزان وەچەخستنەوەیە، تا ئەو کاتەشی پەیوەندیی سێکسیی ژن و پیاو بەمەبەستی وەچەخستنەوە نەبێت، هاوسەرگیریی تەندروست نابێت. لەبەر ئەوەشە، کە ڕێگرتن لە منداڵبوون حەرامە، تەنانەت قەشە تۆما پێی وایە تاوانی ڕێگرتن لە منداڵبوون زۆر گەورەیە، مەگەر کوشتنی بەئەنقەست هێندە گەورە بێت.

قەشە تۆما لەوەشدا شوێنپێی ئەرەستۆ هەڵدەگرێتەوە، کە دەڵێت بنەڕەتی پێکهاتنی کۆرپەلە گیانلەبەری مەنەویی پیاوە، هەر ئەوەش فاکتەری کارا و کاریگەرە لە منداڵبووندا، رۆڵی ژنیش تەنیا ئەوەیە، کە کۆرپەلەکە لە منالّدانی خۆیدا جێبکاتەوە و خواردن و مادە بەسوودەکانی تری پێبدات. مادام نێرینە هۆکاری دروست بوونی کۆرپەلەیە، کەواتە بنەڕەت وایە رەگەزی هەموو کۆرپەلەکان نێر بێت، بەڵام هەندێکیان دەبنە مێینە، کاتێك مادە نزمە مێینەییەکان سەردەکەون و بەسەر ئەو مادە باڵایانەی پیاو دەریاندەدات، زالّدەبن. ئەوەش مانای وایە، کە ژن نێرینەیەکی نوقسانە. ئەکوینی زۆر بە درێژی باسی ئەو بیرۆکەیەی کردووە، چەندین بەڵگەیشی بۆ سەلماندنی بۆچوونەکەی هێناوەتەوە، لەوانەش: دوای سێکس جەستەی ژن دەگۆڕێت و زیاتر بەلای نوقسانیدا دەڕوات، چونکە کچێنیی لەدەستدەدات، هاوکات مەبەستی سێکس سکپڕبوون و وەچەخستنەوەیە، لەگەڵ ئەو ئازار و ناڕەحەتییانەی هاوکاتی دەبن.

وەزیفەی بنەڕەتیی ژن منالّبوونە، هەر ئەوەش نهێنیی خەڵقکردنی بەجیای ژنە، کە رەمزە بۆ لێکەوتنەوە (التوالد)، رۆڵیشی لە پرۆسەی منالّبووندا وای لێدەکات ببێتە هاوەڵێکی یارمەتیدەری پیاو. کەچی لە بوارەکانی تری ژیاندا ــ جگە لە منالّبوون ــ پیاو دەتوانێت بە یارمەتیی پیاوێکی تر زۆر چالاك بێت.

هەر چەندە ئەکوینی سورە لەوەی ژن، وەك رێزگرتنێك بۆ بنەمای ئەقڵی لەسەر وێنەی خودا خەڵقکراوە، کەچی دەیخاتە دەرەوەی چالاکیی ئەقڵیی مرۆڤەوە[٢٥٠] هەروەها هەر چەندە سورە لەوەی خەڵقکردنی ژن دوای پیاو، بەو شێوەیەی لە سفری تەکویندا هاتووە، نابێت بە شێوەیەك لێکبدرێتەوە مانای کەمیی ئەقڵانییەتی ژن بدات، لە کتێبی کورتەی لاهوتیشدا زۆر ئاماژە هەن، بەوەی مەبەستی ئەکوینی لەو قسانەی پێشووی ئەوە نەبووە، کە ژن ــ لە رووی ئەقڵییەوە ــ یەکسان بێت بە پیاو. هەر چەندە پێی وایە خەڵقکردنی ژن دوای پیاو مانای ئەوە نییە ــ وەك یەکێك لە بەرهەڵستکارانی دەڵێت ــ کە بوونی ژن بەندە بە ئەنجامە خراپەکانی گوناهەوە، هێندەی ئەوەی پەیوەستە بە دۆخی بنەڕەتیی خەڵقکردنەوە، کەچی لەگەڵ ئۆگەستیندا لەسەر ئەوە هاوڕایە، ژن سروشتێکی نزم و

لاوەکیی هەیە، پێی وایە هۆکارەکەشی باڵادەستیی ئەقڵە لای پیاو، لێرەشەوە دەگەینە ئەوەی، سیستەمی باش و گونجاو لەناو خێزانی مرۆییدا کەموکورت دەبێت، ئەگەر کەسێك نەبێت، کە حوکمی تێدا بکات و لەوانی تریش داناتر بێت[٢٥١].

ئەو یاسا توندەی بەسەر سروشت و کۆمەڵگادا دەچەسپێت، بەسەر خێزانیشدا دەچەسپێت، ئەویش: بوونەوەری نزم لە خزمەتی بوونەوەری باڵادا دەبێت. جا ئەگەر ژنیش بە سروشتی خۆی لە پیاو نزمتر بێت، کەواتە سروشتییە ئەگەر پیاو حوکمی بکات، بەو شێوەیەش پیاو دەبێتە سەرەتا و ژنیش بە کۆتایی، وەك چۆن خودا سەرەتا و کۆتایی هەموو بوونەوەرانە، ئەوەش چونکە پیاو لەبەر ژن خەڵقنەکراوە، بەڵکو ژن لەبەر پیاو خەڵقکراوە[٢٥٢].

لە بەشی کۆتایی کورتەی لاهوتیدا، ئەکوینی ئەو جەختکردنەوەیەی ئەرەستۆ دەگوازێتەوە، کە دەڵێت ناتوانین ژنان بە داوێنپاك لەقەڵەمبدەین، چونکە بەهۆی ناجێگیریی ئەقڵ و ئاسانیی هەڵخەڵەتاندنیانەوە بەردەوام ئەگەری گوناهیان هەیە، چونکە ئەوان شوێنی سۆز و هەڵچوونە توندەکان دەکەون. هەروەها دێت و ژن دەخاتە ریزی منداڵ و نەخۆش و گەمژەکانەوە، تا بەڵگەیەکی دڵنیاکەرەوەمان لەسەر نوقسانیی ئەقڵی ژن بداتێ. جگە لەوەش ئەکوینی، هەمان تیۆری ئەرەستۆ دەربارەی مناڵبوون وەردەگرێت و پێی وایە، ژن جگە لەوەی ئەو مادەیەی منداڵی لێ پێکدێت، لەخۆیگرێت، هیچ رۆڵێکی تری نییە، لەکاتێکدا پیاو بەو تۆوانەی لە شێوەی گیانلەبەری مەنەویدا پێشکەشی دەکات، بە رۆڵی ئیجابی هەڵدەستێت. لەلایەکی تریشەوە مناڵبوون نێرینە دەخاتەوە، بەڵام ئەگەر مێینەی لێکەوتەوە، مانای وایە کەموکورتییەك هەیە. ئەکوینی تیۆرەکەی ئەرەستۆ دووبارە دەڵێتەوە:

پرۆسەی مناڵبوون دەیەوێت بەتەواوی لە نێرینە بچێت، بۆیە ئەگەر مێینە لەدایکبوو، مانای بوونی کەموکورتییەکە لە توانای ئیجابیدا یان لە مادەدا، یان رەنگە بەهۆی فاکتەری دەرەکییەوە بێت، وەك بای شێداری باشوور(وەك ئەوەی فەیلەسوفەکە تێبینیی کردووە)[٢٥٣]. نێرینەش، وەك ئەرەستۆ دەڵێت فۆرمە، مێینەش هیولییە، بۆیە چەسپینی فۆرم لەسەر مادە بەشێوەیەکی بەهێز، نێرینەمان بۆ بەرهەمدێنێت. ئەگەر

کەموکورتییەك لە مادەکەدا هەبێت، یان لاوازییەك لە فۆرمەکەدا بەدیبکرێت، ئەوکات مێینە دێتە بەرهەم. لە شوێنێکی تریشدا ئەکوینی پشتگیری لەو بیرۆکەیەی ئەرەستۆ دەربارەی نوقسانی و لاوازیی مێینە دەکات، بەوەی هەموو ژنێك بە سروشتی بایۆلۆژیی خۆی مەخلوقێکی شێواو و نوقسان و کەموکورتە. لەلایەکی تریشەوە ئەکوینی پێی وایە ژن، ناتوانێت زمان، کە ئامرازێکی گرنگە و مرۆڤ لە رێگەیەوە دەتوانێت وێنا و بیرکردنەوەکانی بۆ ئەوانی تر دەرببڕێت، بەکاربهێنێت. دۆخی کۆمەڵایەتیی ژنیش زیاد لە شێوەیەکی بێدەنگکردنی بەسەر ژناندا سەپاندبوو، لەلایەن هێزێکی باڵاشەوە بەسەریدا سەپێنرابوون، کە بە هیچ جۆرێك دانی بە بەشداریی کۆمەڵایەتیدا نەدەنا. لەبەر ئەوەش ژن نەیدەتوانی زمان بەکاربهێنێت و بیرکردنەوە و وێناکردنەکانی بۆ ئەوانی تر دەربڕێت، هەروەها بۆی نەبوو ئەو دەستەواژانەی زمان بەکاربهێنێت، کە لە رێگەیانەوە ئەزموونە کۆمەڵایەتییەکانی خۆی بە هەستەکانی و هەموو شتەکانی تریشەوە، بۆ ئەوانی تر بەیاندەکات، بۆیە دەبینین ژن لای ئەکوینی زۆر روون و راشکاو نییە، روونیش بە بۆچوونی ئەو بۆ سروشتی قسەکردن و دەمەتەقێ پێویستە، بۆیە ژن ناتوانێت لە ژیانی گشتیدا ئەسپی خۆی تاو بدات و باشتر وایە لە بواری تایبەتی، واتە لە خێزاندا بمێنێتەوە. ئەو بوارە تایبەتەش پیرۆزیی خۆی هەیە، چونکە پێویستە زۆرێك لە فەزیلەت و بەها مەسیحییەکان دوپاتبکاتەوە. لەم بوارە تایبەتەشدا (واتە خێزان) ژن شوێنکەوتەی پیاوە، لەگەڵ ئەوەشدا کەسێتییەکی تایبەتیی هەیە، ئەو تاکێکی سەربەخۆیە لە مێردەکەی، زیاتر لەوەی کۆیلە لە ئاغاکەی، یان کوڕ لە باوکی سەربەخۆ دەبێت، چونکە لە جۆرێك ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەشداری دەکات، ئەویش ژیانی هاوسەرییە، کە دادپەروەریی خێزانیی زیاتر لە دادپەروەریی مەدەنیی تێدایە. ئەکوینی لەوەدا راستی وتووە، کە: ژن و مێرد لە بواری تایبەتیدا پەیوەندییەکی راستەوخۆیان پێکەوە دەبێت، بەڵام جیاوازییەك هەیە: تەنیا دەرگای دۆخ یان ژیانێکی تایبەتی لە بەردەم ژندا کراوەیە، لەکاتێکدا پیاو لە خێزاندا بەشدارە و لە بواری گشتیشدا بە سیفەتی هاووڵاتی بەشداریی دەکات، لەو بوارەشدا دادپەروەریی مەدەنیی هەیە و لە رەهەندە گشتییەکانیدا بەشدارە[٢٥٤]

# کۆتایی

گەشتی دوور و درێژمان لەم کتێبەدا، جەخت لەوە دەکاتەوە، کە زۆر جاری تریش وتوومانە، بەوەی زۆربەی کات داب و نەریت بەسەر بیرە دینییە نوێیەکاندا زاڵ دەبێت و نقەی لێدەبڕێت، تەنانەت خۆی جێگەی دەگرێتەوە و سیفەتی پیرۆزیی دینی وەردەگرێت. ئەوەش زۆر بە روونی لەو بیرۆکە نوێیانەی مەسیحییەت هێناونی روویداوە، چونکە بێگومان ئینجیلەکان ــ وەك سیمۆن دی بۆڤار دەڵێت ــ نەفەسێکی خۆشەویستی و چاکەخوازی و برایەتی و یەکسانییان تێدابووە، کە پریشکی بەر ژن و نەخۆش و هەژار و کۆیلەکانیش کەوتووە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئیدۆلۆژیای مەسیحی نەیتوانیوە ژن ئازاد بکات و مافی تەواویشی نەداوەتێ، هەوڵی ئەوەشی نەداوە ژن لەو دۆخە نالەبارەی لە سایەیدا نالاندویەتی، یان لەو کۆتی کۆیلایەتییەی پێشتر پیاوانی بتپەرست و یەهودی لە ملیان کردووە، رزگار بکات، لە کاتێکدا هەر چەندە ژنان بە هۆی ئەو نەفەسەوە، دەستە دەستە هاتنە ناو دینە نوێیەکەوە. شان بە شانی پیاوانیش شەهید دەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا نەیانتوانی، تەنیا بە شێوەیەکی لاوەکی نەبێت، لە کاروباری خواپەرستیدا بەشداربن، چونکە کلێسا تەنیا رێگەی ئەوەی بە خومەتکارە ژنەکانی خۆی دەدا، کە بە کارە سادەکان هەستن، وەك چاودێری کردنی نەخۆش و یارمەتیدانی هەژار، لەبەر ئەوەشی هاوسەرگیریی پێویستی بە دڵسۆزیی هەردوولا بوو، بۆیە لەوەشدا هەر دەبوو ژن، وەك بینیمان، بە تەواوی ملکەچی پیاوەکەی بێت[٢٥٥].

قەشە پۆڵس زۆر جەختی لەو ملکەچییە دەکردەوە، بۆ خۆیشی زیاتر لە کەلەپووری یەهودی لە لایەك و کەلەپووری یۆنانی و رۆمانی لە لایەکی ترەوە وەریگرتبوو، وەك لەوەی لە وتە و هەڵوێست و بیرکردنەوەکانی حەزرەتی مەسیحەوە وەریگرتبێت. پاشان لاهوتی و باوکانی کلێسا هەمان رێچکەیان گرت، جارێك لە سەردەمی کەونارا و جارێکی تریش لە رێبازی فەیلەسوفانی یۆناندا بە دوای بەڵگەدا دەگەڕان، کە لەوانەدا سەرچاوەیەکی باشیان بۆ پشتگرتنی بۆچوونەکانیان دۆزییەوە، دواتر هەموو ئەوانەیان لە

تێکەڵەیەکدا کورتکردەوە، کە کۆمەڵی خەسڵەتە بنچینەییەکانی ژن یان نموونەی ژنی لە خۆ دەگرت، ئەو خەسڵەتانەش بریتی بوون لە: ((راگۆڕین و دەسەڵاتی میزاج بەسەریدا، ئارەزووپەرستی، رووکەشی، لاوازی و هەڵەشەیی، چەنەبازی، هەڵچوونی توند، درەنگ تێگەیشتن و ناجێگیریی زەین و نوقسانی لە توانای ئەقڵیدا[256].

بەو شێوەیەش، داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان بەسەر بیرە نوێیەکاندا زاڵبوون، ئەو داب و نەریتانەش ئەگەر بچیتە بنج و بناوانی، دەبینی پەیوەستن بە هەڵوێستی پیاوەوە لە موڵکداریی تایبەتی، جا ماددی بێت یان مەعنەوی[257]، کە باوك دەیەوێت ئەو موڵکدارییە بۆ کوڕانێك لە خوێنی خۆی بگوازێتەوە. پاشان فەیلەسوفی مەسیحی هات و ئەو دۆخە نالەبارەی ژنی کرد بە یاسایەك، یان مۆرکێکی دینیی پێبەخشی، تۆ بڵێی قەشە پۆڵس چی کردبێت کاتێك وتوویەتی: ((ئەی ژنان ملکەچی پیاوەکانتان بن، وەك چۆن ملکەچی خودا دەبن))[258] جگە لەوەی دۆخی خراپی ژنی لە کۆمەڵگاکەی خۆیدا وەرگرتبێت و کردبێتی بە فەرزێکی دینی[259]. هێندە بەسە مۆرکێکی دینی بە دۆخی باوی کۆمەڵگا ببەخشیت، کارێکی لەو شێوەیەش قورس نابێت، بە تایبەتی ئەگەر گوناهی یەکەم و هەڵخەڵەتاندن و جەستە و شەهوەت و ئەزموونی سێکسیی تاڵ لەگەڵ دۆست و سۆزانییەکاندا لە ئارادا بێت، یان ئەگەر ئەزموونی شکست خواردووی خۆشەویستی لێرە و لەوێ سەریهەڵدا بێت، ئەنجامەکەشی ئەوەیە، کە تەرتولیان دەڵێت: ((ئەی ژن تۆ دەروازەی هاتنە ناوەوەی شەیتانی)) وەك بڵێی ژن بە تەنیا سێکس یان گوناه بکات، چەندە ئاسانە بڵێین: هەر ژنە پیاو هەڵدەخەڵەتێنێت و لە لێواری خراپە نزیکی دەکاتەوە، ڕێك بەو شێوەیەی حەوا کردی و ئادەمی هەڵخەڵەتاند. ئەگەر حەوا ئادەمی هەڵخەڵەتاندبێت و گوناهی پێکردبێت، وەك چۆن تا ئێستا نەوەکانی لەسەر هەمان کار بەردەوامن، ئایا ئەوە مانای لاوازی و ساویلکەیی و زوو هەڵخەڵەتانی ئادەم نییە؟ ئەی کوا هێزی پیاو، کوا توانای ئەقڵی و هاوسەنگییەکەی، کوا توانای حوکمدان و جیاکردنەوەی چاکە و خراپە لە یەکتری، کە ئەو خەسڵەتانەش هەمیشە دەدرێنە پاڵی؟ ئایا لەو لێکدانەوەیەدا پاساوێك نادۆزینەوە بۆ ملکەچیی ژن بۆ شەهوەت و هەڵچوون، کە

ئەو پاساوەش لاوازیی پیاوە، لە کاتێکدا ئەو جۆرە پاساوە بۆ پیاو نابینین، گوایە دەسەڵاتی کۆنترۆڵکردنی شەهوەت و هەڵچوونەکانی هەیە؟ ئایا ملکەچیی ئاسانی پیاو و هەڵخەڵەتانی یەك لە دوای یەکی مانای وا نییە، کە ئەویش لای خۆیەوە هاوشێوەی ژن، دەسەڵاتی بەسەر شەهوەت و هەڵچوون و ئارەزووەکانی خۆیدا نییە؟ لە لایەکی ترەوە، ئەگەر بڵێین ئادەم ــ یان پیاوی یەکەم ــ پێش هەڵخەڵەتاندنی لە لایەن حەواوە مرۆڤێکی بێگوناه و چاك بووە، بەڵام دواتر حەوا، ئەو مەخلوقە خراپەکارە، کە پەیامبەری شەیتان و باڵیۆزی خراپەکانە، هات و گوناهی پێکرد، جا دەکرێت ئەوەمان لە بیر بچێت، کە ئەو مەخلوقە خراپەکارە لە پەراسوویەکی خۆی خەڵقکراوە؟ واتە بەشێکی دانەبڕاوە لێی، وەك ئادەم خۆی گوتی، کاتێك خودا پاش ئەوەی ژنی لە پەراسووەکەی خەڵقکرد و نیشانیدا: ئەو ئێسکێکە لە ئێسکەکانم، گۆشتێکە لە گۆشتەکانم، بەمە دەوترێت ژن، چونکە لە مرۆڤێکەوە خەڵقکراوە (تکوین ٣٢:٢). ئایا ناوی ژن (امرأة) لەو خەڵقکردنەوە وەرنەگیراوە، پاش ئەوەی خودا لە مرۆڤێك (امريء)ەوە خەڵقیکرد؟

ئەوەی سەیرە، زۆربەی جاران بە نائاگایی کەوتوونەتە پارادۆکسێکەوە، چونکە لە لایەك نزمێتیی و نوقسانیی ژن بە راستییەکی بەردەست دەزانن، کە ئەزموون پشتڕاستی دەکاتەوە و نموونەی ژنیش، بەو شێوەیەی لە کۆمەڵگای مرۆییدا دەیبینین، جەختی لێدەکاتەوە. ئەوەش مانای وایە ئەو نزمێتییە، سروشتی و غەریزییە و ناگۆڕێت، نە بەدەستهاتووە و نە دەستکردی مرۆڤیشە، بەو شێوەیەش ئەو چیرۆکەی سفری تەکوین دەیگێڕێتەوە، بە ڕاست دەزانن. خودی ئەو چیرۆکەش، لە لایەکی ترەوە، یارمەتی لێکدانەوەی ئەو راستییە باو و ئەزموونە ئاشکرایە دەدات، لەگەڵ ئەو بیرکردنەوەیەی دەربارەی ژن لە ئارادایە، بەوەی بوونەوەری مرۆیی نوقسانن و لە پیاو نزمترن، واتە ئەزموون جەخت لە چیرۆکەکە دەکاتەوە، چیرۆکەکەش ئەزموونەکە لێك دەداتەوە و پاڵپشتیی دەکات، ئەوەش پارادۆکسێکی زەقە[٢٦٠].

لەو داب و نەریتانەی، کە دواجار خەمیان تەنیا پاراستن و هێشتنەوەی سیستەمی موڵکداریی تایبەتییە، فەیلەسوف و بیرمەند و لاهوتییەکان شتێکیان بە ناوی مێینەی

نەمر، یان ئیدیالّی ئەزەلیی مێینە داهێناوە، کە لە یەککاتدا هەموو بیرە دوژمنکارییەکان دەربارەی ژن لە خۆیدا کۆ دەکاتەوە، ئەو بیرکردنەوانەی، کە ژن لە پلەیەکی زۆر نزمی ژیانی مرۆییدا دادەنێن. بە پێی ئەو نموونەیەش، ژن ناتوانێت شتێکی ئەوتۆ لە دەرەوەی چوارچێوەی خێزاندا بکات، پاشان ئەگەر بێت و هەولّبدات لە ڕێگەی داهێنانی هونەریی یان چالاکیی ئەقلّی، یان بەشداری کردن لە ژیانی گشتیدا، جا سیاسی بێت یان کۆمەلاّیەتی و ئابووری و..هتد خۆی بسەلمێنێت، ئەو کات زۆر بە سەختی دەکەوێت و شکست دەخوات، چونکە چارەنووسی ئەو، کە قەدەرییەتی و ناتوانێت خۆی لێ بدزێتەوە، پەیوەستکراوە بە زاوزێ و کاروباری ناومالّەوە!

ڕاستییەکەی شتێك نییە ناوی ئیدیالّی مێینە بێت، ئەگەر ڕاستیش بێت ئیدیالّێکی لەو شێوەیە هەبێت، دەبێت لە ئەنجامی کۆمەلّێك توێژینەوەی ئەنسرۆپۆلۆژییانە بێت، کە یەکێك لە ناودارترین زانایانی ئەو زانستە دان بەوەدا دەنێت زۆربەی ــ ئەگەر نەلّێین هەموو ــ ئەو خەسلّەتانەی دەدرێنە پالّ کەسێتیی مرۆیی و پێی دەلّێین خەسلّەتی نێرینە یان مێینە، دوور و نزیك پەیوەندیی بە ڕەگەزەوە نییە، هێندەی ئەوەی پەیوەندیی بە داب و نەریتە کۆمەلاّیەتییەکانەوە هەیە، وەکو سەر داپۆشین، کە کۆمەلّگا لە قۆناغێکی دیاریکراودا بەسەر ڕەگەزێکدا دەیسەپێنێت[٢٦١].

سەرەڕای ئەوەش، توێژینەوە نوێیەکانی زانستی دەروونناسی ئەزموونیی ئەو بیرۆکەیە هەلّدەوەشێنێتەوە، کە پێی وایە ئەو کۆمەلّە خەسلّەتەی دەدرێنە پالّ ئیدیالّی مێینەی نەمر، خەسلّەتی سروشتی و زگماکین و بەسەر هەموو ژناندا دەچەسپێن[٢٦٢]، تەنانەت خەسلّەتی مێینەی نەمر، خەسلّەتی کەسێتیی سەربەخۆن، کە پێویستە ناوازە بێت و کار بۆ پەرەپێدانی خۆی و تواناکانی بکات[٢٦٣]. ئەوەی سەیرە ئەرکی بایۆلۆژیی پەیوەست بە زاوزێ و دایکایەتی، پەروەردەکردنی مندالّ و ئەو کۆت و بەندانەی داب و نەریت و دۆخە کولتوورییە جیاوازەکان سەپاندویانە، بە تەواوی ژنیان پەکخستووە و گەیشتنیان بە دۆخی مرۆیی کاملّ دواخستووە، دواتر دەبینین ئەو پاداشتەی، کە کۆمەلّگای مرۆیی لەبریی ئەو

کۆت و بەندانەی لە بوارەکانی سیاسەت، کۆمەلآیەتی، ئابووری، پەروەردەیی و ئەخلاقی بەسەریدا سەپاندووە، دێت و ژن لە قەلآ سەختەکاندا زیندانی دەکات[٢٦٤].

ئەوەی لە کۆمەڵگای مەسیحیی سەدەکانی ناوەڕاستدا روویدا هەمان ئەوەیە، کە ئێستا لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا روودەدات. هەر چەندە ئیسلام باسی بەهێزیی ئەقڵی ژن و توانایی، بگرە لێهاتوویی لە حوکمکردن و بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتدا دەکات، دەبینین هەموو ئەو شتانە کەوتوونەتە ژێر تۆزی داب و نەریتە کۆن و بەسەرچووەکانەوە و ئیدیاڵی مێینەی نەمر سەرهەڵدەداتەوە. سەیری قورئانی پیرۆز بکە، کاتێك چیرۆکی بەلقیسی شاژنی (سەبا) دەگێڕێتەوە، دەبینیت وەك ژنێکی دانا وێنای دەکات، کە ئەقڵی بەهێزە، حوکمی هاوسەنگانەیە و لە بڕیاردا تاکڕەو نییە، وەك ئەوەی زۆربەی فەرمانڕەوا خۆرهەلآتییەکانی ئەمڕۆ وەهان. بەڵکو کاتێك نزیك دەبێتەوە لەوەی بڕیارێکی چارەنووسساز بدات، یان تاوتوێی کێشەیەکی گرنگ بکات، کە پەیوەست بێت بە کاروباری شانشین و چارەنوسی دەوڵەتەکەیەوە، گەورە و خانەدانانی کۆمەڵگاکەی بانگ دەکات، تا پێکەوە راوێژ بکەن و بابەتەکە تاوتوێ بکەن و بیرورا بگۆڕنەوە، بەوەش بنەمایەکی سیاسیی گرنگی دانا، کە فەرمانڕەوا نابێت خێرا بڕیاری گرنگ دەربکات، بەڵکو پێویستە لەسەرخۆ بێت و بیری لێبکاتەوە، تیایدا قاڵبێتەوە و لەگەڵ خەڵکی شارەزا و لێهاتوودا راوێژی چڕوپڕ بکات. کاتێکیش نووسراوەکەی سلێمانی پێگەیشت، راوێژکاران و گەورە پیاوانی دەوڵەتی کۆکردەوە، نووسراوەکەی نیشاندان و پێی گوتن: ﴿يا أيها الملأ أفتوني في أمري ما كنت قاطعة أمرا حتى تشهدون﴾(سورەتی نەمل: ٣٢). ئەی پیاوە ماقوڵەکانی دەوروبەری، کە گوایە ئەقڵیان لەو بەهێزترە هەڵوێستیان چی بوو؟ دەستبەجێ هەڵچوون، توڕەبوون و هەڕەشەی بەکارهێنانی هێزیان کرد: ﴿قالوا نحن أولوا قوة و أولوا بأس شديد و الأمر اليك فأنظري ماذا تأمرين﴾. کەچی بەلقیسی ژن، زۆر لەوان ئاقڵ و دووربین و چاوکراوە و جوامێرتر بوو، بۆیە پێی گوتن وا بە زوویی باسی بەکارهێنانی هێز مەکەن، خۆ هەروا بەو ئاسانییە نییە، چونکە: ﴿الملوك اذا دخلوا قرية أفسدوها، و جعلوا أعزة أهلها أذلة و كذلك يفعلون﴾(سورەتی نەمل:

٣٤). بەو شێوەیەش ئەو ژنەی بە ئەقڵ و دانایی کاروباری شانشینەکەی بەڕێوەدەبرد، بە دوای وەسیلەیەکی تردا دەگەڕا تا لە ڕێگەیەوە رووبەڕووی ئەو بارگرژییە ببێتەوە، کە بەرۆکی دەوڵەتەکەی گرتووە، ئەو وەسیلەیەش بەکارهێنانی دیاری بوو: ﴿اني مرسلة اليهم بهدية، ناظرة بما يرجع المرسلون﴾(سورەتی نەمل: ٣٥).

قورئانی پیرۆز لەو چەند ئایەتەدا، کە زۆر روونن و هیچ راڤەکردنێکیان ناوێت و هیچ تەئویلێکیش هەڵناگرن، ئاوا باسی ئەو ژنەمان بۆ دەکات. جا ئەگەر دوای ئەوە کەسێك بێت و بڵێت: رەگەزی مێینە ناسك و عاتیفین، زوو هەڵدەچن، زیاتر لە ژێر کاریگەریی هەستدان وەك لەوەی حوکم بە ئەقڵ بکەن، بۆیە رەگەزێکن کەمتر لە پیاو ئامادەیی سەرۆکایەتی کردنیان تێدایە، چونکە سەرۆکایەتی کردن بە ئەقڵ دەبێت نەك بە هەست[٢٦٥] ئەوە لە راستیدا هەمان بیرۆکەی ئیدیاڵی مێینەی نەمر دەڵێتەوە، کە بە درێژایی سەردەمەکان بەهۆی کۆمەڵێك داب و نەریتەوە، کە زۆربەیان نەزانی پەرستین هاتووەتە ئاراوە. یان رەنگە بێئەوەی بە خۆی بزانێت، بیرۆکەکانی فەیلەسوفە بتپەرستە یۆنانییەکان دەڵێتەوە، لە هەردوو حاڵەتەکەشدا هیچ پەیوەندیی بە ئیسلامەوە نییە، وەك چۆن لاهوتی مەسیحی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەمان کاری کرد، کاتێك رێبازی ئەرەستۆیی کردە سەرچاوەی خۆی و لە رێگەیەوە ئامرازگەلێکی نوێ و پاساوگەلێکی تیۆریی وەرگرت، تا لەوێوە پێگەی ژن لە گەردووندا دیاری بکات!

پاشان ئەو لایەنگرانەی ئیدیاڵی مێینە، کە دەیانەوێت مۆرکی پیرۆزیی دینی بەو ئیدیاڵە بدەن دەپرسن، ئەی دەربارەی ئەو ئایەتە پیرۆزە روون و راشکاوانە چی دەڵێیت، کە ژن وەك هەبوویەکی پلە نزم و شوێنکەوتەی پیاو وێنا دەکەن؟ چی دەربارەی ئەو ئایەتانە: ﴿للرجال عليهن درجة﴾(سورەتی بەقەرە: ٢٢٨) و ﴿الرجال قوامون على النساء﴾( سورەتی النساء: ٣٤) چی دەڵێیت؟

دەڵێین ئەو ئایەتانە باسی پەیوندیی ژن بە پیاو (یان باشتر بڵێین ژن بە مێرد)ەوە لەناو خێزاندا دەکەن، ئەوەش زۆر جیاوازە لەوەی باسی ژن و پیاو بە گشتی، یان پەیوەندییان لەناو کۆمەڵگا یان دەوڵەتدا بکات، چونکە ئایەتی یەکەم، بۆ نموونە، دوای چەندین ئایەت

هاتووه، که باسی ژنی تەڵاقدراو و ئەوەی چ کاتێك بۆیان هەیە شوبکەنەوە، دەکات (ئایەتی ٢٢٧). دوای ئەویش چەند ئایەتێکی تر هاتووە، کە بەهەمان شێوە باسی تەڵاق دەکەن (ئایەتی ٢٢٩). ئایەتی دووەمیش بەهەمان شێوە، باسی ژنی ناشز و سزاکانی سەری دەکات، لەگەڵ پێویستیی گرتنی کەسوکار بە ناوبژیوان، بۆ ئەوەی لە حاڵەتێکدا، کە ترسی جیابوونەوەیان لێدەکرێت ژن و پیاو پێکەوە ئاشتبکەنەوە.

بۆ روونکردنەوەی ئەو بیرۆکەیە دەڵێین: ژن یان پیاو دۆخێکی جێگیر و هەمیشەییان لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا نییە، چونکە ئەو دۆخە، بە گۆڕانی لایەنە جیاوازەکان دەگۆڕێت. پاشان پێویستە لە تێکەڵکردنی بواری ئەخلاق و بواری سیاسەت پێکەوە بەئاگابین، واتە لەنێوان ژن و پیاو وەك ئەندامی خێزان، کە لە بنەڕەتەوە چەمکێکی ئەخلاقییە، لەگەڵ ژن و پیاو وەك هاووڵاتی لە دەوڵەتدا، کە چەمکێکی سیاسییە. جا ئەگەر خێزان چەمکێکی ئەخلاقی بێت، ئەوا پێویستی بە تاکێکە لە رووی ئەخلاقییەوە لێی بەرپرس بێت، کە ئەویش زۆر جار باوکە، هەر ئەو بەرپرسە لە خێزان، وەك چۆن بەرپرسیشە لە منداڵەکانی. ئەوەش، وەك وتمان، بەرپرسیارێتییەکی بە پلەی یەکەم ئەخلاقییە، بە چاوپۆشین لەو بەرپسیارێتییە یاساییانەی، کە دەشێت بکەونە ئەستۆی. ئەوەیە مانای ئەو پلەبەرزییەی مێرد بەسەر ژنەکەیەوە هەیەتی، هەروەها باڵاییش، کە سەرکردایەتی کردنی خێزان پێویستی دەکات. ئەو جۆرە وێناکردنەش هیچ کەمکردنەوەیەکی لە رێزی ژنی تێدا نییە، بەڵکو دابەشکردنی بەرپرسیارێتییە، ئەگەر بشپرسین: ئەی بۆچی بەرپرسیارێتیی یەکەم بۆ پیاو بێت؟ ئەوکات دەڵێین: چونکە پیاو هاوسەرگیریی دەکات و ژن هەڵدەبژێرێت و خێزانێکی سەربەخۆ، بەجیا لە خێزانی ماڵە باوکی بۆ خۆی پێکەوە دەنێت، بۆیە راستتر وایە، کە لە رووی ئەخلاقییەوە ئەو بەرپرسی یەکەمی خێزانەکەی بێت.

هەرچی بواری دووەمیشە، تەواو جیاوازە، مەبەستمان لە بواری ژیانی گشتییە، ئەوەش بواری یەکسانیی تەواوە لەنێوان ژن و پیاودا: لە مافە سیاسییەکان، ئەرکە کۆمەڵایەتییەکان، هەلی فێربوون و کارکردن، بەشداری کردن لە ژیانی کۆمەڵگادا بە هەموو رێگەکان: نابێت ئەرك و مافی مامۆستا و ئەندازیار و پزیشك و پەرلەمانتاری

ژن، له ئەرك و مافی مامۆستا و ئەندازیار و پزیشك و پەرلەمانتاری پیاو کەمتر بێت، ئێمە لێرەدا مامەڵە لەگەڵ هاووڵاتییەکدا دەکەین، چ نێر بێت یان مێ، که هەمان ئەرك و مافی ئەوانی تری هەیە.

بەڵام ئێمە زۆر جار هەردوو بواری ئەخلاق و سیاسەت تێکەڵدەکەین، ئەوەش بەگشتی حاڵی کۆمەڵگا دواکەوتووەکانە، که زۆر جار هەڵەی کوشندەمان پێدەکات. ئێمە له پیاوی سەرجادە تێناگەین، که بۆچی دەبێت له دەوڵەتدا باڵادەست بێت. تەنیا لەبەر ئەوەی کابرا له ماڵەوە باڵادەستیی هەیە، ئیتر وا دەزانێت دەبێت له کۆمەڵگاشدا هەر ئاغا بێت، تا دەگاتە ئەو فەرمانڕەوایەی، که خۆی به باوکی هەموو هاووڵاتیان دەزانێت، بەوەش بیرۆکەی خێزان دەربارەی باوك، که دەبێت ڕێزی بگیرێت، دەهێنێتە مەیدانی سیاسەتەوە، لەکاتێکدا لەمیاندا هاووڵاتیان بۆیان هەیە ڕەخنەی لێبگرن و لەسەر حوکم لایبەن. ڕەنگە ژنیش بکەوێتە تێکەڵکردنی ئەو دوو بوارەوە، ئەویش کاتێك دەیەوێت له خێزاندا، به هەمان مانا سیاسییەکەی هاووڵاتی مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، ئیتر لەوێوە داوای یەکسانیی تەواو و دیموکراسی و...هتد له مێردەکەی دەکات[٢٦٦]. یان به مێردەکەی دەڵێت، کاکه من مامۆستا، ئەندازیار، پزیشك، یان تەنانەت وەزیرم و...هتد، چونکه ئەو له خێزندا ژنه و بەس[٢٦٧].

ئەمانە چەند نموونەیەکی کەمن، نموونەی تریش زۆرن بۆ ئەو حاڵەتەی، که تیایدا داب و نەریت به تێپەڕینی کات چەسپیون و حوکمدەکەن، له بیری خەڵکیشدا ئەوە دەچەسپێنن، که ژن نزم و کەموکورت و بێ توانایە و...هتد، پاشان لاهوتی و پیاوانی دینی و هاوشێوەکانی ئەوان، دێنو مۆرکێکی دینی بەو نەریتانە دەبەخشن و دەیکەنە بەشێکی دانەبڕاو له کەلەپووری دینی، تەنانەت ڕەنگە هێندە بەرزی بکەنەوە بگاتە ئاستی پیرۆزیی و بەو کەسەشی لێیان لابدات بوترێت بێباوەڕ و له دین دەرچوو، لەکاتێکدا دین لێی بێبەرییە!

# پەراوێزەکان

١- لە چوارچێوەی کتێبی (ئەفلاتون و ژن)دا باسی سوکراتمان کردووە، چونکە سوکرات لە ژیانیدا هیچی نە نووسیوە. کتێبی دووەمیشمان بە ناونیشانی (ئەرەستۆ و ژن)ەوە بوو، کە کتێبخانەی مەدبولی لە قاهیرە چاپیکردووە.

٢- بۆ کەنیزەکەکانیش هەر وا بوو، چونکە کوڕی کەنیزەك میراتیی بەرنەدەکەوت: هاوکات سەرپۆشین بۆ جیاکردنەوەی (ژنی ئازاد) بوو، کە منداڵەکانی میراتییان بەردەکەوت لە کەنیزەك، کە پێویست بوو سەرنەپۆشێت. لێرەوە دەبینین عومەری کوڕی خەتاب بە گۆپاڵەکەی لە کەنیزەکەکانی دەدا و پێی دەوتن ((خۆتان وەك ئازادەکان لێکردووە؟!)) بڕوانە العقد الفريد_ی ئیبن عەبد ڕەببە، هەروەها لسان العرب_ی ئیبن مەنزور و ئەحمەد حوفی لە ((المرأة في الشعر الجاهلي)) و عەبدولسەلام تەرمانینی لە ((الرق: ماضيه و حاضره)) ژمارە ٢٣ لە زنجیرەی عالم المعرفة، نۆڤەمبەری ١٩٧٩.

٣- واتە سەرۆکی خێڵ یان کاهین یان ساحیر لە شەوی یەکەمدا لەبریی زاوا لەگەڵ بوکەکەدا دەخەوێت، تا ماوەیەکی نزیك ئەو مافە لە ئاهەنگێکی گشتیدا پێڕەو دەکرا، وەك ئەوەی لە دورگەکانی ساموا ئەنجامدەدرا، بەو شێوەیەی مارگریت مید، زانای ئەنسرۆپۆلۆژی ئەمەریکی لە کتێبەکەی (باڵغبوون لە ساموا) لە ساڵی ١٩٢٨دا باسیکردووە.

٤- د. عەبدولسەلام تەرمانینی: ((الزواج عند العرب في الجاهلية و الاسلام)) زنجیرەی عالم المعرفة، ژمارە ٨٠، ئابی ١٩٨٤، ل ٢٢_٢٣.

5- Simeone De Beauvoir, The Second Sex. Trans. By M. Parshley. Penguin books 1987, p. 120-121

٦- تا ئێستاش گرێبەستی هاوسەرگیریی لە هەندێك لە كۆمەڵگا عەرەبییەكاندا پێی دەوترێت (عقد الملكە)!

٧- ئیدوارد گیبۆن دەڵێت: ئەو كارە سەیرەی ئۆرجین، زیاتر مایەی سەرسوڕمانە وەك لە سەرزەنشتكردن. ئۆرجین هەمیشە سفرەكانی كتێبی پیرۆزی تەئویل دەكرد، بەڵام وا دیارە، بۆ بەدبەختیی خۆی، تەنیا لەو حاڵەتەدا تەئویلی نەكردووە، بەڵكو بە مانای حەرفیی وەریگرتووە! سەیری ئەو كتێبە بكە: ((اضمحلال الامبراطورية الرومانية و سقوطها)) وەرگێڕانی محەمەد ئەبو دوررە و پێداچوونەوەی ئەحمەد نەجیب هاشم، دامەزراوەی گشتیی میسری بۆ نوسین و وەرگێڕان و بڵاوكردنەوە. ب١، ل ٣٦٥.

٨- ئەو بۆچوونەی پێیوایە، ئەو ژینگەیەی حەزرەتی مەسیحی تیایدا سەریهەڵدا، ژینگەیەكی بتپەستانە بوو: یەكەم هەوڵی مژدەبەخشینیشی لە ناوچە بتپەرستەكان بوو، نەك یەهودییەكان. هەروەها گرۆی وەرزێرە عەرەبەكانی باكوری فەلەستین و باشوری لوبنان بوون، لەكاتی مژدبەخشیندا لە دەوری كۆدەبوونەوە. فەكور سەحاب ((العرب و تأريخ المسألة المسيحية)) دار الوحدة، بەیروت ١٩٨٦ ل ٢٠. ئەوەش لە بەهای وتەكانی ئەو كەمناكاتەوە، چونكە ئاییینەكانیش لای خۆیانەوە بە هەمان رادە رقیان لە ژن بوو. ئەوەی دەمانەوێت زەقی بكەینەوە، ئەو بیرۆكە نوێیەی حەزرەتی مەسیحە لەبارەی ژنەوە، كە هەرچەندە جوان بوو، بەڵام نەیتوانی بەسەر نەریتی بۆماوەدا زاڵبێت.

٩- بگەڕێرەوە سەر کتێبی دووەمی زنجیرەی فەیلەسوف و ژن بە ناوی (ئەرەستۆ و ژن)، کتێبخانەی مەدبولی لە قاهیرە.

10- James Donaldson: Woman: Her position and influence in ancient Greece and Rome, and among the early Christians, Gorden press, New York 1973, p. 77.

١١- دوو کەسی سەر بە دادوەری بوون لە رۆمای کۆندا، ئەرکیان بریتی بوو لە ئامار و تۆمارکردنی دانیشتوان و چاودێری کردنی ئەخلاقی گشتی و رەفتاری تاکەکان.

12- J. Donaldson: Op. Cit. p. 78.

13- Ibid, p. 80.

١٤- یاسای جۆستنیان لە فیقهی رۆمانیدا، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی عەبدولعەزیز فەهمی، عالم الکتب، بیروت ل ٣٩٨.

١٥- ژمارەی بنەڕەتیی بڕگەکانمان وەکو خۆی و بەو شێوەیەی لە یاساکەدا هاتووە، داناوەتەوە.

١٦- رەنگە دیارنەمانی ژنان هەر لە دامەزراندنی رۆماوە دەستیپێکردبێت، بۆ نموونە بڕوانە تێبینیی مۆنییك پیتەر لەو بارەیەوە((هەردوو دامەزرێنەرانی رۆما: رۆمیولۆس و ریمۆسی برای _وەك لە ئەفسانەکەدا هاتووە_ گورگێك شیری پێداون. کەچی کەس زانیاریی دەربارەی دایکی راستەقینەیان نیە)). المرأة عبر التأریخ، وەرگێڕانی هینریت عەبود، ل ٧٧.

17- Sarah B. Pomperoy: Goddess, whores, wifes, and slaves: women in classical Antiquity. Shoken books, N.Y. PX.

18- James Donaldson: Woman: Her position and influence…. P. 85.

---

١٩- بۆ زانیاری دەربـارەی سـەردەمی کلاسـیکیی یۆنـان بگـەڕێرەوە سـەر کتێبـی یەکەمی ئەم زنجیرەیە بە ناوی (ئەفلاتون و ژن)، کتێبخانەی مەدبولی لە قاهیرە.

20 J. Donaldson: OP. Cit. P. 120.

٢١- زانیاریی دەربارەی هاوسەرگیریی رۆمانی: جۆرەکـانی و شـێوازەکانی و...هتـد زۆرە، بۆ نموونە بڕوانە ویل دیۆرانت لە کتێبی مێژووی شارسـتانێتی، بـەرگی نۆیـەم، وەرگێڕانی محەمەد بەدران، ل ١٤١ و دواتر. هـەروەها عەبـدولهادی عـەباس: المرأة و الأسرة في حضارات الشعوب و انظمتها، بەرگی دووەم، خانەی تـەلاس لـە دیمـەش، ل ٧٠٩ و دواتر. هەروەها بڕوانە مۆنییك پیتەر: المرأة عبر التأريخ، وەرگێڕانی هینریـت عەبود، دار الطلیعة، بیروت، ل ٧٩ و دواتر.

٢٢- کـاتۆی گـەورە (٢٣٤_١٤٩ پ.ز) یـان کـاتۆی سێنسـۆر، سیاسـەتمەدارێکی رۆمانییە، بە دەستپێوەگرتن و هێشتنەوەی نەریتە یۆنانییە کۆنەکان بەناوبانگە، دژی رابواردن و خەرجی زۆر و ئەو نەریتـە نوێیانـە دەوەسـتایەوە، کـە رۆمانییـەکان لـە یۆنانییەکانەوە وەریانگرتووە.

23- Quted by: James Donaldson: Woman: Her position…… p. 88.

24- Ibid, p. 89.

٢٥- ناودارترین مێژوونوسی رۆما، تیتـۆس لیڤۆسـی ناسـراو بـە لیڤـی(٥٩ پ.ز_١٧ز)، ئەو بەسەرهاتەی گێڕاوەتەوە. بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، ل ٩١.

26- J. Donaldson: Woman: Her position …… p. 90-91.

٢٧- وەك ئاماژەیەك بـۆ خواوەنـد بـاخۆس، خواوەنـدی شـەراب و سـەرگەرمی لای رۆمانییەکان (کە هەمان دیۆنیسیۆسی یۆنانییەکانە). ژنان زۆریان بـە ئاهەنگـەکانی

دەکـرد، ئـیش و کـاری خۆیـان جێدەهێشـت و بـەرەو کێـوان دوای دەکـەوتن، زۆر هیستیرییانە سەمایان دەکرد و بە دەوری خۆیاندا دەخولانەوە.

٢٨- پۆستی دادوەری لای رۆمانییەکان، هەموو ساڵێك هەڵدەبژێردرا، هەندێ جار بە ئەرکەکانی کونسوڵ هەڵدەستا.

٢٩- لە رۆمای کۆندا دوو کونسوڵ حوکمیان دەکرد، کە سـاڵانە هەڵدەبـژێردران، لـە سەروبەندی کۆماری رۆمانیشدا دەسەڵاتێکی باڵایان هەبوو.

30- James Donaldson: Woman: Her position…… p. 79.

31- Ibid. p. 80-81.

32- Sarah B. Pomperoy: Goddess, whores, wifes, and slaves) N.Y. P. 152.

٣٣- بە ئەندامانی ئەنجومـەنی پـیران دەوتـرا ((ئەنجومـەنی باوکـان)) و دەسـەڵاتی دەوڵەتیش لە رۆما لەسەر دەسەڵاتی ئەو باوکانە بەند بوو.

٣٤- مۆنییك پیتەر: المرأة عبر التأريخ، وەرگێڕانـی هینریـت عـەبود، دار الطلیعـة، بیروت، ل ٧٧.

35- Sarah B. Pomperoy, Goddess, Whores, Wifes… px.

٣٦- مۆنییك پیتەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٩.

٣٧- عەبدولهادی عەباس: المرأة و الاسرة في حضـارات الشـعوب و انظمتهـا، بـەرگی دووەم، تەلاس، دیمەشق ل ٧٠٧. هەروەها پیتەر مۆنییك، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٧ و دواتر.

38- Sarah B. Pomperoy: Op. Cit. p. 153.

39- Ibid.

40- Sarah B. Pomperoy: Ibid, p. 152-3.

41- Ibid, 153.

42- Ibid, 154.

٤٣- د. سەروەت ئەنیس ئەسیوتی ((نظام الأسرة بین الاقتصاد و الدین: الجماعات البدائیة - بنو اسرائیل)) دار الکتاب العربی لە قاهیرە، ل ١٥٣.

٤٤- یەکێکە لە خواوەندە سامییە کەنعانییەکان لە باکوری فەلەستین و لوبنان و دواتریش میسر. دواتر وشەکە لە زمانی عەرەبیدا مانای ((مێرد))ی دەبەخشی.

45- Dictionary of the History of Ideas, vol.4, p. 523.

٤٦- ئەو رستەیە لە کەلەپووری فەلسەفیی یۆنانیدا دەوترێتەوە، گوایە سوکرات وتوویەتی، کە زۆر سوپاسی خودای کردووە چونکە ((بە یۆنانی نەك بە بەربەری، بە ئازادی نەك بە کۆیلەیی، بە پیاو نەك بە ژن خەڵقیکردووە!)).

47- Simone de Beauvoir: The second sex, trans. By H.M.Parshley penguin books, p.22.

48- Dictionary of the History of Ideas, vol.4, p. 524.

49- Charles Seltmen: Woman In Antiquity, London, Thomas and Hudson, 1965, p. 184.

٥٠- ئینجیلی مەرقەس، ئیسحاحی پێنجەم: ٢٥. هەروەها بڕوانە ئینجیلی مەتی: ئیسحاحی نۆیەم ٢٠_٢٣.

٥١- ئینجیلی مەرقەس، ئیسحاحی دوانزەیەم: ٤٣_٤٤.

52- James Donaldson: Woman: Her Position…. P. 148.

٥٣- ئینجیلی یوحەننا، ئیسحاحی هەشتەم: ٣_١١.

٥٤- رەگەزی توتۆنی پێکدێت لە: ئەڵمانییەکان، دانمارکییەکان و دراوسێیەکانیان، هەروەها ئینگلیزەکان و...هتد.

55- James Donaldson: Woman: Her Position…. P.148

56- James Donaldson: Ibid. p. 149

57- Ibid, p. 150

٥٨- بگەڕێرەوە سەر ئەوەی لە باسی پاشخانی مەدەنیی رۆمانی، بەتایبەتی هاولاتی ئازادی رۆمانی باسمانکرد.

٥٩- عوقاد دەربارەی حەزرەتی مەسیح دەڵێت: زۆر کاری لە دەروونی ژنان دەکرد، بۆ هەرکوێ بڕۆیشتبا، دوای دەکەوتن و بە ویقار و خۆشەویستییەوە گوێیان لێدەگرت. ل ١٢٧.

٦٠- لە بنەڕەتدا ناوی شاوول بوو، کاتێك بووە مەسیحی گۆڕی بە پۆڵس. هەرچەندە لە ژیانیدا مەسیحی نەبینیوە، بەلام زۆر پێوەی پەیوەست بووە. زۆر رەگەز و بیرۆکە و تەئویلکردنی بۆ وتەکانی حەزرەتی مەسیح سەربارکردووە، بە رادەیەك هەندێك لە توێژەران جیاوازی دەکەن لەنێوان ((مەسیحییەتی مەسیح)) و ((مەسیحییەتی پۆڵس))دا. بۆ نموونە بڕوانە: James Donaldson: op. Cit.p. 153.

٦١- پاڵپشت بەو بنەما بەناوبانگەی دەرونناسی، کە دەڵێت: ((رقی زۆر، لە بنەڕەتدا لە خۆشەویستییەکی زۆر، کە تێرنەکرابێ، یان ئارەزوویەکی توند، کە بەدینەهاتبێ، دروستدەبێت)) لەم کتێبەدا نموونەگەلێکی زۆر بۆ ئەو بنەمایە دەبینین.

٦٢- نەریتی خەتەنەکردن، کە سروتێکی دینییە لای یەهودییەکان و تەوراتیش دەیداتە پاڵ ئیبراهیم (تکوین: ئیسحاحی حەڤدەیەم:١_١٣)) لە راستیدا نەریتێکی فیرعەونییە و سالانێکی زۆر لە میسری کۆندا پێڕەودەکرا، یەهودییەکانیش لە کاتی مانەوەیان لە میسر، لە میسرییە کۆنەکانیان وەرگرتووە، دواتریش لە هەندێك لە دینەکاندا بوو بە سروتێکی پیرۆز.

63- Qouted by J. Donaldson: Woman: Her position… p. 150

64- Ibid.

٦٥- نامەی یەکەمی پۆڵس بۆ خەڵکی کۆرینتیۆس: ئیسحاحی یانزەیەم ٧_١٠.

66- Dictionary of Ideas, vol 4, p. 524. Charles scribners sons, N,Y. 1944.

٦٧- نامەی یەکەم بۆ خەڵکی کۆرینتیۆس: ئیسحاحی چواردەیەم ٣٤_٣٦. بەراوردی بکە بەوەی دینی یەهودی دەیڵێت، کە ژن دەبێت فێربێت، نەك فێربکات، لەگەڵ ئەو دەروازە گشتییەی لە سەرەتای یەکەم کتێبی ئەم زنجیرەیە (ئەفلاتون و ژن)دا نوسیمان.

٦٨- نوسەری ساتیریی ناودار بێرنارد شۆ، گفتوگۆیەکی خۆشی لەنێوان ئادەم و حەوا دەربارەی ئەو ئیمتیازە نوسیوە، کە زۆر جار دووبارە دەبێتەوە، تیایدا هاتووە:

- ئادەم: من لە تۆ باشترم، چونکە خودا یەکەمجار منی خەڵقکرد!

- حەوا: نەخێر، من باشترم، چونکە خودا لە سەرەتادا تۆی خەڵقکردووە تا شەرەفی پێشوازی کردنی منت پێ بدرێت.

٦٩- گرنگە باسی ئەوە بکەین، کە ئیسلام ئۆبالّی ئەو گوناهە (خواردن لە دارە حەرامکراوەکە) بەتەنیا ناخاتە ئەستۆی ژن، بەڵکو خۆی و مێردەکەی پێکەوە بە هاوبەشی بەرپرس دەکات: ﴿و قلنا يا أدم اسكن أنت و زوجك الجنة و كلا منها رغدا حيث شئتما و لا تقربا هذه الشجرة فتكونا من الظالمين، فأزلهما الشيطان عنها فأخرجهما مما كانا فيه..﴾ (البقرة: ٣٥_٣٦).

٧٠- نامەی یەکەمی پۆڵس بۆ تیماتۆس: ئیسحاحی دووەم ١١_١٤.

٧١- نامەی یەکەم بۆ خەڵکی کۆرینتیۆس: ئیسحاحی یانزەیەم ٧_١٠.

٧٢- بەراوردی وتەیەکی تری قەشە پۆڵس بکە: ((ئایا خودی سروشت فێری ئەوەی نەکردوون، کە عەیبە بۆ پیاو پرچی دابهێنێت؟)) نامەی یەکەم بۆ خەڵکی کۆرینتیۆس: ئیسحاحی یانزەیەم ١١-١٤.

73- Quoted by. Andersofn in his ((Xenophon)) p. 17.

٧٤- نەریتی سەرپۆشین لە کۆمەڵگەی یۆنانیدا باو بــوو (ئــەفلاتون و ژن). هــەروەها لای عەرەبــەکانی ســەردەمی نــەزانینیش هــەبووە، هــەروەها بەشــێك لــە زانــا موسوڵمانەکان وتوویانە، کە پرچ و دەنگی ژن عەورەتە. پاش کەمێك دەبینین قەشە جیرۆم داوای لە ژن کردووە پرچی خۆی ببڕێــت، وەك جێبــەجێکردنی وتــەکانی قەشــە پۆڵس: ((ژن، ئەگەر پرچی داناپۆشێت، با بیبڕێت. مادام بۆ ژنیش ناشیرینە، کە پرچی خۆی ببڕێت، بۆیە باشتر وایە سەری داپۆشێت)). نامەیــەکی یەکــەمی کۆرینتیــۆس: ئیسحاحی یانزەیەم ٦.

75- Dictionary of the History of Ideas, vol 4, p. 523.

٧٦- نامەی پۆڵس بۆ خەڵکی کولوسی ٣:١٨.

٧٧- نامەی یەکەم بۆ خەڵکی ئوفسوس: ئیسحاحی پێنجەم ٢٢_٢٤.

٧٨- نامەی پۆڵس بۆ کۆرینتیۆس: ئیسحاحی یانزەیەم ١١_١٢.

٧٩- نامەی پۆڵس بۆ تیماتۆس: ئیسحاحی دووەم ٩_١٠.

٨٠- نامەی یەکەمی پۆڵس بۆ خەڵکی کۆرینتیۆس: ئیسحاحی یەکەم ٢٣_٢٤.

٨١- ڕۆژی سێیەمیش لە قانا جەلیل شاییەك هەبوو، دایکی یەسوعیش لەوێ بــوو. یەسوع و شاگردەکانیش بانگهێشتی ئەو شاییە کرابوون، کاتێــك شــەراب تــەواوبوو، دایکی یەسوع هــات و پێــی وت: شــەرابیان نــەماوە و...هتــد. ئینجیلــی یوحــەننا: ئیسحاحی دووەم ١-٤.

82- Charles Seltman: Woman In Antiquity, London and New York, Thomas and Hudson 1956, p. 184

٨٣- نامەی یەکەمی پۆڵس بۆ خەڵکی کۆرینتیۆس: ئیسحاحی یەکەم ٣٢-٤٢.

84- Fredrick Copelston: A History of Philosophy, vol 2, Search press, p. 13.

٨٥- له دابەشکردنی ئەو سەردەمە مێژووییانەدا بڕوانە: ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام ((دەروازەیەك بۆ فەلسەفە)) چاپی شەشەم، ل ١٧.

86- F. Copelston: OP. Cit. p. 14.

87- Encyclpedia Americana, vol 7, p. 49.

٨٨- ئێدوارد گیبۆن ((اضمحلال الامبراطورية الرومانية و سقوطها)) وەرگێڕانی لویس ئەسکەندەر، پێداچوونەوەی ئەحمەد نەجیب هاشم، الهيئة المصرية العامة للتأليف و الترجمة و النشر، قاهیرە ١٩٩٦، ل ١٧١ لە بەرگی یەکەم.

89- James Donaldson: Woman: Her position.. p. 15.

٩٠- بەراوردی بکە بە: د. ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام ((هایپیشیا...ژنە فەیلەسوفەکەی ئەسکەندەریە)) گۆڤاری عالم الفكر، ژمارەی بیست و دووەم، کانونی دووەمی ١٩٩٤ .

٩١- پێویستە هەمیشە ئەو بنەما سایکۆلۆجییەمان لەبیر بێت، کە پێشتریش باسمانکرد و دەڵێت: ((رقی زۆر لە خۆشەویستیی زۆرەوە دروستدەبێت))رەنگە شکستهێنان و چەپاندن، هەوڵی نائومێدانەی سەرکوتکردنی شەهوەتەکان و...هتد لە پێکهێنانی ئەو جۆرە بۆچوونانەدا رۆڵیان هەبێت.

92- Qouted by J. Donaldson: Woman: Her position.. p. 183

93- Ibid.

94- Ibid, p. 184.

95- Ibid.

96- Ibid, p. 188

97- Susan G. Bell: Woman from the Greeks to the French Revolution.

٩٨- یوسف کـەرەم لـە کتێبـی ((تـأریخ الفلسـفة الاوروبیـة في العصـر الوسـیط))دا هێناویەتی، کە لە دار القلم لە لوبنان ساڵی ١٩٧٩ چاپکراوە. هەروەها بڕوانە جۆرج تەرابیشی ((معجم الفلاسفة)) دار الطلیعة بیروت ١٩٧٨، ل ٢٠٨.

99- Simone de Beauvoir: The Second Sex p. 129 & 199.

100 J. Donaldson: Op. Cit.

١٠١- پاش کەمێك دەبینیت، کە چۆن قەشە جـیرۆم سەرزەنشـتی ژنێکـی رۆمـانی دەکات لەبەر سینگی رووتی.

102- Ibid.

١٠٣- کێشەی سەرپۆش و پەچە، هی ئەمڕۆ و دوێنێ نیە، بەڵکو مێژوویەکی دووری هەیە، هی سەردەمی مەسیحییەت و رۆمانیش نیە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ کەلەپووری یەهودی. لە (نشید الانشاد)ی سلێماندا هاتووە: ((تۆ زۆر جوانی ئازیزەکەم، چـاوانت لەو دیو پەچەکەتەوە زۆر جوانە، گۆناکانت لەو دیو پەچەکەتەوە وەك لـەتی هـەنارێك وایە)) ئیسحاحی چوارەم: ١_٤.

104- Quoted by: Katherine M. Rogers: Op. Cit. p. 17.

105- J. Donaldson: Woman: Her position, p. 183.

106- Quoted by: Katherine M. Rogers: The Troublesome Helpmate: A History of Misogyny In Literature Seattle, Wash. Universityof Washington press 1966, p. 16.

١٠٧- بڕوانە: بە کورتی هاوسەرگیریی جۆرێکە لە کۆیلایـەتی، ژن دەبێتـە کۆیلـەی پیاو، پێویستە بە رەهایی لە هەر شتێکدا، کە پیـاو داوای لێـدەکات، بـە مـەرجێك پێچەوانەی فەرمانی خودا نەبێت، گوێڕایەڵی بێت. ئیمـامی غـەزالی، احیـاء علـوم الدین، دار الریان للتراث، ١٩٨٧، ل ٦٤.

108- J. Donaldson: Woman: Her position, p. 175.

١٠٩- بڕوانە: مافی پیاوە، کە سەرکردە بێت، نەك شوێنکەوتە و دەبێت مێرد ئاغـا بێت و...هتد. هەروەها: سێ کەس هـەن، کـە ئەگـەر ڕێزیـان بگریـت سـوکایەتیت پێدەکەن، ئەگەر سوکایەتیشیان پێبکەیت، ڕێزت دەگرن، ئەوانیش: ژن، خزمـەتکار و نیبتی (واتە کەسێکی سەر بە گەلی نیبتی). ئیمامی غەزالی، احیـاء علـوم الـدین، دار الریان، بەرگی دووەم، ل ٥١.

١١٠- ئەگەر بە کورتی دەربارەی ئادابی ژن بـدوێین، دەڵـێین: پێویسـتە لـەماڵـەوە دابنیشێت و خەریکی رستنەکەی خۆی بێت، دەرچوون و هاتووچـۆی زۆر نـەبێت، زۆر لەگەڵ دراوسێکانیدا قسە نەکات، لە حاڵەتی پێویستدا نەبێت سەردانیان نەکات، کە پیاوەکەی لای نەبوو زەمی نەکات، لە هەموو کارێکیدا هیوای دڵخۆشیی بۆ بخوازێت، نە لە خۆی و لە ماڵەکەیدا خیانەتی لێنەکات، بـەبێ ئیزنـی مێردەکەشـی لـە مـاڵ نەچێتە دەرەوە و...هتد)). احیاء علوم الدین، بەرگی دووەم، ل ٦٦.

111- J. Donaldson: Woman: Op. Cit, p. 175.

112- Ibid, p. 179.

١١٣- یەکێکە لە باوکانی کڵێسای مەسـیحی لـە سـەدەی دووەم و یەکێکیشـە لـە بـەرگریکارانی دیـن. بەرگرینامـە بەناوبانگەکـەی بـە نـاوی ((بەرگرینامەیـەك بـۆ مەسیحییەکان))ەوە نوسـی و سـاڵی ١٧٧ دایـە مـارکۆس ئۆریلیۆسـی ئیمپراتـۆری رۆمانی.

114- J. Donaldson: Woman: Op. Cit, p. 179-180.

115- Ibid, p. 180.

116- Ibid, p. 181.

117- Ibid.

118- Ibid, p. 159.

١١٩- شەمماس وشەیەکی سریانییە، واتە ئەو کەسەی لە کڵێسادا خزمــەت دەکـات، کە پلەیەکی خوارترە لە قەشە، بۆیە زۆر جار دەوترێت شەمماس یاریدەدەری قەشەیە.

120- J. Donaldson: Woman: Op. Cit.

121- Tertullian: De Baptismo, C. XVIII

122- Twentieth Century Encyclopedia, vol. 2. Barkre Books House, 1955, p. 751.

123- Ibid.

124- F. Capelstone: A History of Philosophy, vol. 2, Search Press, p. 23.

125- Ibid.

١٢٦- ئەوانیش: ئامبرۆز، قەشە جیرۆم، قەشە ئۆگەستین و پاپا گریگۆری_ن.

١٢٧- بێرتراند رەسڵ ((تأریخ الفلسـفة الغربیـة)) بـەرگی دووەم، وەرگێڕانــی زەکـی نەجیب مەحمود، لجنه التألیف و الترجمه و النشر ١٩٦٨، ل ٦٣.

128- The Encyclopedia of religion and Ethics vol. 7, James Hastings 1967, p. 498.

١٢٩- مۆنیك پیتەر لە کتێبەکەی ((المرأة عبر التأریخ))دا هێناویەتی، لە وەرگێڕانی هینریت عەبود، دار الطلیعة للطباعة و النشر - بیروت، ل ٩٩.

130- Katherine M. Rogers: The Troublesome Helpmate: A History of Misogyny In Literature Seattle, Wash. Universityof Washington press 1966, p. 19.

١٣١- وەك دەزانین، حەزرەتی مەریــەم دەزگیرانــی یوسـفی دارتـاش بــوو، کڵێســای کاسۆلکی پێیوایە، کە بەبێ هیچ گوناهێك منداڵەکەی بووە، بە درێژایی ژیانیشی بە پاکیزەیی ماوەتەوە، ئەوەشی لە کتێبی پیرۆزدا باسی برایانی یەسوع کراوە، مەبەست لێی کوڕانی مام و خاڵە.

١٣٢- هەندێك لە سەرچاوە دینییەكان دەڵێن: یەسوع لە ناسـرە لەگـەڵ چـوار بـرادا گەورە بووە، ئەوانیش یەعقوب و یوسا و یەهوزا و سەمعان بوون، لەگـەڵ ژمارەیـەك خوشكدا. لەوەشدا ئاماژە بەو دەقەی ئینجیلی مەرقەس دەكەن: ((ئەوە دارتاشـەكەی كوڕی مەریەم، برای یەعقوب و یوسا و یەهوزا و سەمعان نیە؟ ئایا خوشكەكەی لێرە نیە لای ئێمە.)) مەرقەس: ٣:٦.

١٣٣- لە بنەڕەتدا ((خەسووی خواوەند))ە. بەڵام پێمان باش بوو ئەو دەسـتكارییەی بكەین. بڕوانە: بێرتراند رەسڵ ((تأريخ الفلسفة الغربيـة)) بـەرگی دووەم، وەرگێڕانـی زەكی نەجیب، ل ٦٣_٦٤.

١٣٤- ساڵی ٢١٢ كونسوڵی رۆما بوو، هاوكات فەرماندەیەكی بـەناوبانگیش بـوو، لەگـەڵ براكەیـدا هێرشـیانكردە سـەر ئیسـپانیا دژی قرتاجییـەكان، بـەڵام دۆڕان و هەردووكیشیان كوژران.

١٣٥- بێرتراند رەسڵ: هەمان سەرچاوە، ل ٦٥.

136- Katherine M. Rogers: Op. Cit. p. 20.

١٣٧- بە چەند دەستەواژەیەك سەرزەنشتی ژنێكی رۆمانی دەكات، كە وەك بڵێی بـە جوانیی ژناندا هەڵبدات، هاوكات پڕە لە ئاماژەی سێكسیی ئاشكراش: ((كراسەكەت بەئەنقەست درز تێخستووە، مەمكەكانت بـە سـوخمەیەكی ناسـك توندكردووەتـەوە، سنگت لە ناوچەیەكی بەرتەسكدا دیلكردووە، جاروبار پەچەكەت دەكەوێتە خوارەوە و هەردوو سەرشانی سپیت بە رووتی دەردەكـەون، پاشـان بەپەلـە ئـەوەی بەئەنقەسـت دەرتخست دادەپۆشیتەوە)). ویل دیۆرانت لە كتێبی ((قصة الحضـارة))دا هێناویـەتی، بەرگی دوانزەیەم، وەرگێڕانی محەمەد بەدران، ل ١٠٩.

١٣٨- ئەوەش نزیکە لەوەی خەڵکی عەوامی لای خۆمان دەیڵێن، گوایە ژن لە رووی سێکسییەوە تێر نابێت، ئەوەش هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە سەرەتا جیاوازییە تاکە کەسییەکان سڕدەکاتەوە، دووەمیش چاوپۆشی لە دیاردەی خەتەنەکردن دەکات، سێیەمیش خۆی لەو راستییە دەشارێتەوە، کە پیاوانیش هیی وایان تێدایە، کە لە رووی سێکسییەوە تێر نابێت.

١٣٩- یەکەم ژنی شیشیرۆنە، ساڵی ٤٦٠ پ.ز لێك جیابوونەوە. شیشیرۆن لەبارەیەوە دەیوت، کە ئەو هێندە لە کاروباری سیاسیدا شارەزایە، هێندە لە کاروباری ناوماڵ نازانێت. کاتێکیش بەهۆی زوو تورەبوونیەوە لەلایەك و حەزکردنی لە خانمێکی دەوڵەمەند لەلایەکی ترەوە، چیتر خۆشینەدەویست، تەڵاقیدا. ئەویش لەگەڵ پیاوێکدا، کە لە رووی سیاسییەوە دوژمنی شیشیرۆن بوو، هاوسەرگیریی کرد.

١٤٠- جیرۆم هیچ شتێکی دەربارەی مامەڵەی خراپی سوکرات لەگەڵ ژنەکەی و ژنەکەی ئەرەستۆش، کە پیایدا هەڵیداوە باسنەکردووە .

141- Katherine M. Rogers: Op. Cit and Susan Bell p. 87-88.

١٤٢- پینیلۆپی هەیە، کە هەمیشە رێسەکەی دەکردەوە بە خوری و زیاتر لە بیست ساڵ چاوەڕێی مێردەکەی کرد و لە کارەکەیدا خۆی دوادەخست. هەروەها ئەلیکستیل هەیە، کە خۆی کردە قوربانی مێردەکەی و...هتد. ئەرەستۆش وەك نموونەی ژنی چاك و خاوەن ئیمتیاز ناوی هێناون. بڕوانە کتێبی: ئەرەستۆ و ژن، چاپخانەی مەدبولی قاهیرە، ل ١٠٥-١٠٦.

143- Katherine M. Rogers: Op. Cit

١٤٤- مەبەستمان ساموێلی پەیامبەرە: ((ساموێل خزمەتی خواوەندی دەکرد، خاولییەکانی سەرشانی(خاولیی تایبەت بە دینی یەهودی) لە کەتان بوون، دایکیشی جبەیەکی بۆ دروستکردبوو...هتد)) ساموێلی یەکەم: ٢:١٨-١٩.

١٤٥- ((لەو رۆژانەدا یوحەننای مەعمەدان هات و لە بیابانەکانی یەهوددا وەعزی دەدا)) مەتی: ٣:١-٢.

146- Quoted by: Susan Bell: Wo,en from the Greeks to the french revolution, p. 90-92.

147- Ibid.

148- Ibid.

149- Ibid. p. 94.

١٥٠- وشەی Chrysostom یۆنانییە و مانای دەمی زێڕین دەدات، ئەو نازناوەشی بەهۆی زمانپاراوییەوە لێنراوە، یەکێکە لە باوکانی کلێسای یۆنانی، ساڵی ٣٤٥ لە ئەنتاکیە لەدایك بووە، لە ساڵی ٣٩٨ تا ساڵی ٤٠٤ بەتریرکی شاری قوستەنتینییە بووە، لە ساڵی ٣٦٨ شۆردراوەتەوە و کراوە بە خوێنەر لە کلێسادا، لە ساڵی ٣٧٥ تا ٣٨١ لە بیابانێکی نزیك لە ئەنتاکیە رەبەنیی کردووە، ساڵی ٣٨١ بووەتە خزمەتکار (شەمماس) و لە ٣٨٦یش بووە بە قەشە، دواتریش لە ٣٩٨ بووەتە ئوسقوف (بەتریرك)ی قوستەنتینیە.

151- Quoted by Susan Bell: Woman from the Greeks to the French revolution, p. 86.

152- Ibid.

153- Susan Bell: Ibid, p. 86-87.

154- Ibid.

155- Ibid, p. 86-87.

١٥٦- بڕوانە دانپیانانەکانی ئۆگەستین، وەرگێڕانی خوری یوحەننا حلو، دار الشرق بیروت، ل ١٦٥.

١٥٧- هەمان سەرچاوە، ل ١٦٥.

١٥٨- کوڕی خێزانێکی بەڕێز بوو لە تاجیست، لە ئۆگەستین گەنجتر بوو، لە زێدی خۆی و دواتریش لە قرتاجە لەسەر دەستی ئۆگەستین خوێندویەتی ((لەسەر فێرکردنییەوە خۆشیویستم و منیش ئەوم خۆشویست، چونکە کوڕێکی باش و زۆر مەیل بە چاکە بوو، هەرچەندە گەنجیش بوو)). دانپیانانەکان، ل١٠٧. بەڵام لەگەڵ ئۆگەستینی مامۆستایدا دەستیدایە کاری خراپ و زیناکردن.

159- Herbert A. Dfane: the politicall and sociall Ideas of st. Augustine, Columbia University press, 1963, p. 22

١٦٠- نامەی قەشە پۆڵس بۆ خەڵکی رۆمیە، ئیسحاحی سیانزەیەم ١٣_١٤.

١٦١- نامەی قەشە پۆڵس بۆ خەڵکی رۆمیە، ئیسحاحی سیانزەیەم ١٣_١٤.

١٦٢- دانپیانانەکانی ئۆگەستین، وەرگێڕانی خوری یوحەننا حلو، ل ١٦٦.

١٦٣- هەمان سەرچاوە، ل ١٦٧.

١٦٤- دانپیانانەکانی قەشە ئۆگەستین، ل ٢٩.

١٦٥- هەمان سەرچاوە.

١٦٦- هەمان سەرچاوە، ل ٣٠.

١٦٧- هەمان سەرچاوە.

١٦٨- هەمان سەرچاوە، ل ٥٧.

١٦٩- هەمان سەرچاوە، ل ٥٨.

١٧٠- بڕوانە بێرتراند رەسڵ ((تـأريخ الفلسفة الغربية)) بەرگی دووەم (الفلسفة الكاثوليكية)، وەرگێڕانی زەکی نەجیب مەحمود، ل ٧٣.

١٧١- د. عەبدولرەحمان بەدەوی، موسوعە الفلسفە، بـەرگی یەکـەم، ل ٢٤٨. المؤسسـە العربیە للدراسات و النشر، چ١ ١٩٨٤.

172- Philosophy of Woman: An Anthology of classic and current concepts, Mary Briody, p. 260.

١٧٣- قەشە ئۆگەستین: دەربارەی سێ ڕەنگیـی، کتێبـی دوانزەیـەم. مـاری بریـۆدی لـە کتێبی فەلسەفەی ژندا لە لاپەڕە ٢٥٦ و دواتریشدا، زۆر دەقی ئـەم کتێبـە و کتێبـەکانی تری ئۆگەستینی وەرگێڕاوە.

١٧٤- نامەی یەکەمی قەشە پۆڵس بۆ تیمۆساوس، ئیسحاحی پێنجەم ٦:٥.

١٧٥- نامەی یەکەمی قەشە پۆڵس بۆ تیمۆساوس، ئیسحاحی دووەم ١٥.

176- Mary Daly: Beyond God the father: towards a philosophy of womans liberation, the womans press, London, 1985, p. 3.

١٧٧- چونکە ئەوەی پەیوەندیی بە زیناکارەوە بکـات، لەگەڵیـدا دەبێتـە یـەك جەسـتە، دەڵێت: هەردووکیان پێکەوە دەبنە یەك جەستە، بەڵام ئەوەی پەیوەندیی بە خوداوە بکات، لەگەڵیدا دەبێتە یەك ڕۆح. نامەی قەشە پۆڵس بۆ خەڵکی کۆرینتیۆس ١٦:٦-١٧.

178- Mary Daly: Ibid, p. 60.

179- Qouted by: Mary Daly: Beyond God the father, p. 61.

180- Ibid.

١٨١- ماری بریۆدی چەند بەشێکی ئەو توێژینەوەیەی لە کتێبەکەی خۆی فەلسـەفەی ژن ل ٢٦٠ و دواتریشدا، وەرگێڕاوە.

١٨٢- هەمان سەرچاوە.

183- Augustine: Treaties on marriage and other subjects trans by Mary Daly in her philosophy of woman: an anthology of classical and current concepts, Hackett publishing copeny, p. 261.

١٨٤- قەشە ئۆگەستین، دەربارەی هاوسەرگیریی و شەهوەت، وەرگیراوە لە بیرە سیاسـی و کۆمەڵایەتییەکانی قەشە ئۆگەستین، نوسینی هێربێرت دیفەین، ل٥٥.

185- Augustine: the City of God, trans by Hennery Bettenson, penguin books, 1972, p. 586.
186- Ibid, p. 587.

١٨٧- قەشە ئۆگەستین: دانپیانانەکان، وەرگێڕانی خوری یوسف عەلەم، ل ١٧٠.

188- Genevieve Loyed: the man of reason: male and female in western philosophy , Methuen & Co. L.T.D 1984, p. 28
189- Ibid, p. 29.
190- Ibid.
191- Genevieve Loyed: the man of reason, p. 31.
192- Ibid.

١٩٣- ئەوە بەڵگەی لاوازیی پیاویشە، ئۆگەستین بۆ خۆی خاوەنی ئەو وتە بەناوبانگەیـە، کە: گوناه دەکەم، کەواتە هەم.Si Fallo, sum

١٩٤- قەشە ئۆگەستین: دانپیانانەکان، وەرگێڕانی خوری یوسف عەلەم، ل ١٩٠.

195- Ibid, p. 33.
196- Augustine: the City of God, trans by Hennery Bettenson, penguin books, 1972, p. 587.

١٩٧- نامەی پۆڵسی پەیامبەر بۆ خەڵکی رۆمیە، ئیسحاحی دووەم ٢٩.

198- Augustine: the City of God, p. 1057.
199- Ibid.

٢٠٠- سدوقییەکان، کۆمەڵەیەکی یەهودی بوون، لە ماوەی نێوان سەدەی دووەمی پـێش زایین و سەدەی یەکەمی زایینیدا چالاك بوون، نکوڵییان لە نەمریی رۆح و زیندووبوونەوە و قیامەت و بوونی فریشتە دەکرد.جگە لە پێنج سفری یەکەمی کتێبـی پـیرۆز، دانیـان بـە هیچ بەشێکی تریدا نەدەنا. گفتوگۆی زۆریان لەگەڵ حەزرەتی مەسیحدا کردووە.

201- Augustine: the City of God, p. 1058.

٢٠٢- د. زەکەریا ئیبراهیم ((المجموعة اللاهوتیة للقدیس توما الاکوینی)) تراث الانسانیة، بەرگی سێیەم، ژماە ١٠، الدار المصریة للتألیف و الترجمة و النشر، ل ٧٨٤.

203- Fredrick Copelstone: A History of philosophy, vol 2, search press, p. 302.

٢٠٤- ئەو زانکۆیە بەشێکی زۆری لە فیکری یۆنانی و عەرەبی و عیبریی تێدا دەبینرایەوە، کە پێچەوانەی فیکری مەسیحی بوون، جگە لەوەش مامۆستایەکی تۆما لە زانکۆی ناپۆلی وانەی دەوتەوە، کە زۆر سەرسامی ئەرەستۆ بوو، رەنگە هەر ئەویش بۆ یەکەمجار سەرنجی تۆمای بە لای ((مامۆستای یەکەم)) یان وەك تۆما خۆی دەیوت ((فەیلەسوفەکە))دا راکێشابێت.

٢٠٥- ئەو کۆمەڵەیە لە سەرەتادا لە شاری تۆلۆز لە فەرەنسا دەستیان بە کارەکانیان کرد، یەکەم کۆمەڵەی رەبەنیی کاسۆلیکی بوون، کە ئەرکی مژدەپێدان بە عەقیدەی مەسیحی بگرێتە ئەستۆی خۆی، کە ئەوەش لە پێشدا بە ئەرکی ئوسقوف و نوێنەرەکانیان دادەنرا، دۆمنیکییەکانی سەرەتا رۆشنبیرییەکی گشتی و فراوانیان هەبووە، کە لە لاهوت زیاتر بووە و هەوڵیانداوە لاهوت و فەلسەفە پێکەوە بگونجێنن.

٢٠٦ لەوانەش بۆ نموونە، کچێکی جوانیان کردە ژوورەوە بۆ لای، تا رازیی بکات بگەڕێتەوە بۆ ئەم دونیایە، بەڵام تۆما تەختەیەکی گڕگرتووی لە ئاگردانەکە دەرهێنا و کچەکەی پێ کردە دەرەوە و ئەو نیشانەی خاچەشی، کە بە دەرگاکەوە بوو سوتاند.

٢٠٧- هەندێك لە توێژەران دەڵێن، کە ماوەی دوو ساڵ لە کۆشکی ماڵی باوکیدا ماوەتەوە و خەریکی خوێندنەوەی کتێبی پیرۆز و کتێبی (الاقوال)ی بوتروس لومباردی و (لۆژیك)ی ئەرەستۆ بوو. د. عەبدولرەحمان بەدەوی، موسوعة الفلسفة، بەرگی یەکەم، ل ٤٢٧.

٢٠٨- میخائیل زەومەت: تۆمـای ئـەکوینی، المطبعـة الکاثولیکیـة، بـیروت ١٩٥٦، ل ١٠-١١.

٢٠٩- ئەلبێری مەزن، فەیلەسوف و لاهوتییەکی ئەڵمانییە، سـاڵی ١٢٢٣ چـووە ریـزی کۆمەڵەی دۆمنیکانەوە. هەوڵیدەدا لاهـوتی مەسـیحی و فەلسـەفەی ئەرەسـتۆ پێکـەوە بگونجێنێت، تۆمای ئەکوینی زۆر پێی کاریگەر بووە.

٢١٠- راستییەکەی ئەو نازناوە هاوڕێیانی لێیان نـابوو، ئـەوان پێیـان دەوت گـای لاڵـی مەزنی سیسیلی. بڕوانە ویلّ دیورانت ((قصـة الحضـارة)) بـەرگی حەڤدەیـەم، وەرگێڕانـی محەمەد بەدران، ل ١١٦.

٢١١- بڕوانە د. عەبدولرەحمان بەدەوی، موسوعة الفلسفة، ل ٤٢٧.

212- Susan Bell: Women from the greeks to the French revolution, p. 118.

٢١٣- دانییـەکان، یـان دانمارکییـەکان کـوڕانی دانیمـارکن، نـاوی دانییـەکان بـەو ئەسکەندەناڤییانە دەوترێت، کە بەریتانیا و فەرەنسا و هۆڵەندایان داگیرکردبوو.

٢١٤- لە تیۆری کۆیلایەتی لای ئەرەستۆ بەراوردی کتێبەکـەی ئێمـە بکـە: سـتەمکار، توێژینەوەیەکی فەلسەفی لە وێنەکانی زۆرداریی سیاسی، ل ١٣٠_١٣١. هەروەها کتێبی ئەرەستۆ و ژن.

٢١٥- سیمۆن دی بۆڤـوار پێیوایـە کاتێـك بەربەرییـەکان سـەرکەوتن و لـە سـەدەکانی دواتریشدا توانییان یاساکانی خۆیان بسەپێنن، دۆخـی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و ئـابوری سەرتاپا گۆڕا، کاریگەریی ئەوەش لەسـەر دۆخـی ژن زۆر بـە خراپـی شـکایەوە. بڕوانـە:
Simone de Beavoir: the second sex, p. 128

216- Susan Bell: Ibid.

217- Dictionary of the history of Ideas, vol 4, p. 593.

٢١٨- ویلّ دیورانت ((قصة الحضارة)) بەرگی شـانزەیەم، وەرگێڕانـی محەمـەد بـەدران، ل ١٨٧.

٢١٩- هەمان سەرچاوە، ل ١٨٨.

٢٢٠- هەمان سەرچاوە.

٢٢١- ((الموسوعة الفلسفية المختصـرة)) بـە سەرپەرشـتیی د. زەکـی نـەجیب مـەحمود، کتێبخانەی ئەنگلۆ میسری، ل ٧١-٧٢.

222- Quoted by: Susan Bell, op. cit. p. 119.
223- Ibid.
224- Gennevieve loyed: the man of reason: male and female in western philosophy, Methuen co. L.T.D. P. 33.

٢٢٥- لێرەشدا پشت بە دابەشـکارییەکەی ئەرەسـتۆ بـۆ هێزەکـانی نـەفس دەبەسـتێت، بڕوانە:

Henry Obsborn: the ediavel mind: A History of the development to thought and Emotion in the Middle Ages, Macmillanm 1911, vol 1, p. 464.
226- Thomas Aquinas: Summa Theologica, I, I, 28, 1-4.
227- Gennevieve loyed: the man of reason: P. 33.

٢٢٨- ئەکوینی لێرەدا رەخنەیەکی گرنگ باسدەکات و وەڵامیشـی دەداتـەوە. رەخنەکـە ئەوەیە، جیاکردنەوەی نێر و مێ لە یەکتری، جیاکردنـەوەی جەسـتەییە، ئەگـەر راسـتیش بێت، کە وێنەی خودا لە هەردوو رەگەزەکەدا هەیە، مانای وایە لە ئەقڵیشدا هەیـە، نـەك تەنیا لە جەستەدا. بۆیە مەبەستی سەرەکی تەنیا سروشتی ئەقڵی نیـە، بـەڵکو سروشـتی جەستەییش دەگرێتەوە. لە وەڵامی ئەو رەخنەیەشـدا دەڵێـت: ئاشـکرایە ئـەوە مەحاڵـە، چونکە ئەگەر ئەوە راست بێت، پێویستی نەدەکرد، کە کتێبی پیرۆز باسـی وێنـەی خـودا

بكات، تەنیا پاش دروستبوونی وەچە نەبێت، بەڵام كتێبی پیرۆز دەڵێت ((لەسەر وێنەی خودا خەڵقیكرد)) و دەشڵێت ((لە نێر و مێ خەڵقیكردن)) بەو مانایە نیە، كە وێنەی خودا لە ڕێگەی جیاكردنەوەی هەردوو ڕەگەزەكەوە لە یەكتری دروست بێت، بەڵكو سەر بە هەردوو ڕەگەزەكەیە، تا ئەوكاتەی لە باری ئەقڵدا هەردوو ڕەگەز هیچ جیاوازییەكیان نیە، بۆیە پەیامبەر وتوویەتی: ((لەسەر وێنەی خالیقی خۆی، كە نێر و مێی تێدا نیە)) (نامەكەی بۆ خەڵكی كۆلوسی ٣:١٠). بەراوردی بكە بە ماری بریۆدی: فەلسەفەی ژن، هەڵبژاردەیەك لە فیكرە باو و كلاسیكییەكان، ل **٢٨٣**.

229- Quoted by: Mary Briody: philosophy of woman: An Anthology of classical and current concepts, Hackett publishing company, 1983. P. 282.

**٢٣٠**- نامەی قەشە پۆلس بۆ خەڵكی كۆرینتیۆس ١١:٧.

231- Quoted by: Mary Briody: philosophy of woman, Hackett publishing company, 1983. P. 282.

232- Mary Briody: philosophy of woman: An Anthology of classical and current concepts, Hackett publishing company, 1983. P. 276.

**٢٣٣**- مەبەست لەو فەیلەسوفە لێرەدا ئەرەستۆیە، ئەكوینی لە زۆرێك لە نوسینەكانیدا مامۆستای یەكەم بەو شێوە ناودەبات، وەك بڵێی كەس فەیلەسوف نیە ئەرەستۆ نەبێت.

**٢٣٤**- سەیری كتێبی ((ئەرەستۆ و ژن)) بكە، كە كتێبی دووەمی زنجیرەی فەلسەفە و ژنە، كتێبخانەی مەدبولی لە قاهیرە چاپیكردووە، ل **٥٧** و دواتر.

235- Mary Briody: op. cit. p. 277.

٢٣٦- لێرەدا ئـەكوینی هـەمان وتـەكانی ئەرەسـتۆ لـە كتێبـی (زاوزێـی گیانلەبـەران) دەربارەی جۆرە جیاوازەكانی زاوزێ لای رووەك و گیانلەر و مرۆڤ دووبارە دەكاتەوە. بڕوانـە كتێبی ئەرەستۆ و ژن، كتێبخانەی مەدبولی قاهیرە، ل ٥٠ و دواتر.

237- Mary Briody: op. cit. p. 277.

٢٣٨- لێرەشدا فەیلەسوفەكە هەر ئەرەسـتۆیە، بڕوانـە Aristotle: De generation : Animalium, IV, 2(766 B-33)

239- Mary Briody: Philosophy of woman, p. 278.

240- Mary Briody: Ibid, p. 278.

241- Aristotle: Ethics VIII, 17 (1162 A-19).

242- Briody: Ibid, p. 279.

٢٤٣- Rarefaction واتە هەواتێكردن، بە مانای ئەوەی لـەنێوان بەشـەكانی شـتێكدا ماوەیەك هەبێت، بەوەش قەبارەكەی زیاد دەكات.

244- Mary Briody: philosophy of woman, p. 280-281.

٢٤٥- هەنـدێك لـە ئینجیلـەكان دەڵـێن، كـە پێـنج پارچـە نـان بـووە، مەرقـەس لـە ئینجیلەكەیدا دەڵێت حەوت دانە بووە: ((لێی پرسین چەندە نانتان لایە؟ وتیان حەوت دانە. فەرمانی بە هەموویان دا خۆیان بدەن بە زەویدا، حەوت نانەكـەی بـرد و سوپاسـی كـرد و نانەكانی لەتكرد، دای بە شاگردەكانی تا بیدەنە هەمووان، ئەوانیش خواردیان و تێربـوون، پاشان پاشماوەی نانەكەیان كۆكردەوە و زۆریش بوو. ئەوانەشی لێیان خوارد نزیكـەی چـوار هەزار دەبوون)). ئینجیلی مەرقەس، ٨:٥_٩.

246- M. Briody: Ibid.

٢٤٧- بڕوانە كتێبەكەمان: ستەمكار، توێژینەوەیەكی فەلسەفی لە وێنـەكانی زۆرداریـی سیاسی، عالم المعرفة، ل ١٣١.

٢٤٨- جۆرج سەباین ((تطور الفكر السياسي)) وەرگێڕانی حەسەن جەلال عەروسی، پیاچوونەوەی فەتحولا خەتیب، دار المعارف لە میسر، چ ٢ ١٩٦٩، کتێبی دووەم، ل ٣٥١-٣٥٢.

249- Encyclopedia of philosophy. Vol 8, p. 113 ED by Edwards, Macmillan 1967.

٢٥٠- لەبەر ئەوەش زۆرێك لە توێژەران پێیانوایە لەو رووەوە دژیەکییەکی گەورە لە فەلسەفەکەیدا هەیە، چونکە بە ئاشکرا لەو خاڵەدا نەنگی بیرکردنەوەیدا دەبینرێت. بۆ نموونە بڕوانە: Dictionary of the History of Ideas, p. 525.

251- Quoted by Genevieve Loyed: the man of reason: Male and Female in western philosophy, p. 34.

252- Ibid, p. 35.

253- G. Loyed: Ibid, p. 36_37.

254- J. B: Public Man, Private woman, Martin Robertson, Oxford, p. 78.

255- Simone de Beavoir: The Second Sex, p. 129

256- Dictionary of the History of Ideas, vol 4, p. 525.

٢٥٧- موڵکداریی مادی وەکو پارە و زەوی و...هتد، موڵکداریی مەعنەویش بریتییە لە ئیمتیازەکانی چین یان کۆمەڵەیەك و...هتد، بەو شێوەیەی لە کۆندا لای یۆنانی و رۆمانییەکان هەبوو، هەروەها چینی بەرهەمییەکان لە هندستان و لۆردەکان لە ئینگلتەرا، ئەو مافەش لە باوکەوە بە میراتی بۆ کوڕ دەمێنێتەوە، کە باوکیش هەوڵدەدات خوێنی ((بێگانە)) دەستی بەسەردا نەگرێت.

٢٥٨- نامەی قەشە پۆڵس بۆ خەڵکی ئوفسوس ٥:٢٢.

٢٥٩- ئەوەی زۆر سەیرە، ئیمام خومەینی، کە سەرکردایەتیی شۆڕشێکی رۆحی دەکرد و موسوڵمانانیش پاش ئەوەی بەسەر سەری خۆیانەوە هەڵیانگرت و لە پاریسەوە گەیاندییانە

تاران، چاوەڕوانی ئەوەیان لێدەکرد وێنەیەکی ئەوتۆی ئیسلام نیشانبدات، کە وێنەی ئیسلام بێت لە سەدەی بیست و یەکەمدا، کەچی دەبیینین بۆچوون و بیری پیاوانی سەرجادە لەگەڵ خۆیدا دەگەیەنێتە لوتکە و لە وتارەکانیدا هەر باسی سەرپۆش و پەچە پۆشین دەکات. لەگەڵ چەندین شتی تردا، کە داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان سەپاندویانن و هیچ پەیوەندییان بە ئیسلامەوە نیە، چونکە ژن پەچە بکات یان سفور بێت، هەر بە موسوڵمانی دەمێنێتەوە.

260- Dictionary of the History of Ideas, vol 4, p. 523.
261- M. Mead: Sex and temperament in the primitive society, penguin books, p. 279.
262- Dictionary of the History of Ideas, vol 4, p. 573.
263- Simone de Beavoir: The Second Sex, p. 49.
264- Dictionary of the History of Ideas, vol 4, p. 573.

٢٦٥- بڕوانە: د. محەمەد یوسف موسا ((نظام الحکم في الاسلام)) دار الکتاب العربی، ل ٥٤. ئەو بیرۆکەیەش، بەداخەوە زۆربەی ئەو کتێبانەی باسی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامی دەکەن، دووبارەی دەکەنەوە.

٢٦٦- زۆر ساویلکانەیە، کە باس لە دیموکراسیەتی خێزان دەکرێت، چونکە تێکەڵکردنێکی ئاشکرای نێوان ئەخلاق و سیاسەتە.

٢٦٧- ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام ((مسیرة الدیمقراطیة، رؤیة فلسفیة)) توێژینەوەیەك لە گۆڤاری عالم الفکر، بەرگی بیست و دووەم، ژمارەی دوو ساڵی ١٩٩٣ (وەزارەتی راگەیاندن - دەوڵەتی کوەیتی).